کانوونی یەکەم
2004
ســـــــالی شەشەم

# سەردەم

36

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی

- سەردەم گۆڤارێکە بە دوو مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.
- تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مافی بڵاونەکردنەوەی هەیە و پێشەکی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.
- بەرهەمەکان بڵاوبکرێنەوە یان نەکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.
- هەموو پەیوەندییەك لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.

خاوەنی ئیمتیاز: شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر: ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

دەستەی نووسین

ڕێبین هەردی

شوان ئەحمەد

شاهۆ سەعید

دەرهێنانی هونەری: قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەری: تاڤگە فائق

ناونیشان

سلێمانی – فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 3130347

دەزگای سەردەم 3129609

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

Tel - Fax: 0044 7543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی ژمارە ( 14665/615و 14665/616) تاران

لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:

www.sardam.info

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە

# ناوەرۆك

## فیکر و فەلسەفە



## ڕەخنە و لێكۆڵینەوە



## گفتوگۆ



## لە ئەدەبی گەلانەوە



## فایلی ژمارە (مۆدێرنە)

## □ وێستگەکانی سەردەم



**نرخی ( 1200 ) دینارە**

# فیکر و فەلسەفە

- جۆن لۆك

د. موسا ئیبراهیم

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

- جاك دێریدا..

ئەستێرەیەكی گەورە لە ئاسمانی پاریسدا كوژایەوە

هاشم سالْح

لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

- بەشداریكردن لە هەڵبژاردندا

ریچەد تۆپف

لە ئینگلیزییەوە: سەدرەدین عارف

# جۆن لۆك

## (1704-1632)

د.موسا ئیبراهیم

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

**بەرایی:**

فیکری سیاسی لە سەرەتادا داوای یەکیەتی نیشتمانی دەکرد لە سنورێکی جوگرافی دیاریکراودا, ئەمەش بەمەبەستی دروستکردنو دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوە بوو. بۆ ئەم مەبەستەش فیکری سیاسی ڕازی بوو بەوەی تەنها کەسێك حوکمڕانی بکات, بەو مەرجەی بتوانێت تەواوی نەتەوەکەی خۆی لە قەوارەیەکی یەکگرتودا کۆبکاتەوە. کاتێك ئەم مەرامە هاتەدیو یەکیەتی نەتەوە بوو بە واقیع, ئیتر ستەمکاریو حوکمی تاکە کەسی وەکو سەرەتا بایەخو گرنگیان نەماو بونە شتێکی بەسەرچوو, هەر بۆیە فیکری سیاسی دەستی کرد بەوەی هاولاتیان لەژێر باری زوڵمو زۆری دەسەلاتداران دەربهێنێت.

ئەم تەوژمەی فیکری سیاسی کە خواستی ئازادیو سەربەخۆبونە, لە کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەهەمەوە دەست پێدەکاتو بەردەوام دەبێت.

بێگومان ئەم تەوژمە, گۆڕانکارییە سیاسیو فیکرییەکانی خۆرئاوا زەمینەیان بۆخۆشکرد. گرنگترین ڕوداوێکیش ئەوەبوو کە ساڵی *1685* "لویسی چوارده" بڕیار نامەی نانت- *Edit de Nantes* ی هەڵوەشاندەوەو, ئەمەش بووە مایەی ترسو نیگەرانی پرۆتستانتەکانو زۆربەیان بەناچاری ڕویانکردە چەند وڵاتێکی وەك (سویسراو ئەڵمانیاو هۆڵەنداو بەتایبەتیش بەریتانیا). بڕیارنامەی نانت ساڵی *1598* لەلایەن "هنری چوارەم"ەوە دەرچوو, کە چەندین مافی دابوو بە پرۆتستانتەکانی ناو فەرەنسا.

دووەمین ڕووداو, سەرکەوتنی شۆڕشی ساڵی 1688 و ڕاگەیاندنی مافەکان بوو لەبەریتانیادا. شۆڕشی *1688* بووە مایەی ئەوەی یەکەمین کەسی پرۆتستانتی لە ئەوروپادا کە "گیوم دۆرانگ" بوو, لە هۆڵەنداوە بهێنێتو بەناوی "جاکی دووەم"ەوە بکرێتە پادشای بەریتانیا, بەلام "جاك" بەچەند

مەرجێك كە لە پەیمانامەیەكدا هاتبوو كرایە پادشاو بەمەش پادشایەتیەكی مەرجدار شوێنی ئەو سستمی پاشایەتیەی گرتەوە كە بنەماڵەی "ستیوارت" دەیانویست لەسەر مافی یەزدانی دروستی بكەن. لێرەوە فیكرێكی ڕادیكاڵی ئازادو ڕەخنەگر كە لەسەر بنەمای پەیمانێكی كۆمەڵایەتی دامەزرابوو، هاتە ئاراو جێگای ئەو سستمی پاشایەتییە ڕەهاو دێرینەی گرتەوە كە ڕەگو ڕیشەیەكی قوڵی لەخۆرئاوادا هەبوو. هەروەها لەو پەیماننامەیەدا، مافی ڕەتكردنەوەی دەسەڵاتو مافی شۆڕش كردنیش هاتبوو. ئەمانە مەسەلە گەلێك بوون كەخەڵكی لەساڵی 1680 بەئاشكرا باسیان دەكردو بووە مایەی ئەوەی زەمینە لەبەردەم ئەو بیروبۆچوونانەدا خۆش بكات، كە لە كۆتایی سەدەی حەڤدەهەمو بەدرێژای سەدەی هەژدەهەم لە ئارەدابوون. یەكەمین فەیلەسوفی ئەم قۆناغە نوێیەش، بیریاری سیاسی بلیمەت "جۆن لۆك"ە.

## بەگشتی:

بەریتانیا ئەو وڵاتە بوو كە لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەمدا، فیكری سیاسی بەكتێبی (*leviathan*) دەوڵەمەند كردو "هۆبس" وەكو لایەنگری سستمی تۆتالیتاریو دیكتاتۆری ناسرا، بەڵام هەر لە كۆتایی ئەو سەدەیەدا كتێبی (دەربارەی حكومەتی مەدەنی) پێشكەشی جیهانكرد، لەو كتێبەشدا "جۆن لۆك" وەك كەسێكی لیبراڵو لایەنگری تاكەكەس بەدەركەوت. فیكری سیاسی لەسەردەمی ڕێنیسانسەوە، ئامرازێك بووە لەخزمەتی سستمی حوكمڕانی ڕەهادا بۆبەرگرتن لەپشێویو نائارامی، بەڵام "جۆن لۆك" شاڵاوێكی توندی بۆ سەر حوكمڕانی ڕەها دەست پێكردو گورزێكی گرانی وەهای ئاراستە كرد كە بووە مایەی لەقكردنی بنەماكانی.

"لۆك" ساڵی *1632* هاتۆتە دنیاوە، سەردەمی گەنجێتی ئەو وڵات نوقمی دووبەرەكیو جەنگێكی بێئامان بوو، ئەم ڕەوشەش تا ساڵی *1660* بەردەوام بوو. لەو ساڵەدا بنەماڵەی "ستیوارت" گەڕانەوە سەر كورسی حوكمڕانی، بەڵام گەڕانەوەی ئەوان نەبوە مایەی كۆتایهێنان بەو دووبەرەكییە، ئەمەش وایكرد زۆر لە دەسەڵاتدا نەمێننەوەو حوكمڕانیان زۆر نەخایەنێت.

باوكی "لۆك" لەو پاكژویستانە بوو كە لە جەنگی ناوخۆدا لایەنگری پەرلەمان بوو. باوكی سەردەستەی سوارەكان بوو، لەژێر كاریگەری ئەویشدا "لۆك" بوو بەلایەنگری "كرۆمێل"و پاكژویستەكان.

"لۆك" سەروەختێك قوتابی بوو لە كۆلێژی ویستەمنیستەرو زانكۆی ئۆكسفۆرد، لەناو ئەو پشێویە فیكرییەدا گەورەبوو كە سەبارەت بە ئایینو فەلسەفەو سیاسەت لەزانكۆكانی بەریتانیادا لەئارەدا بوو، ئەم دۆخە نالەبارە ئەویان توشی نائومێدی كردبوو.

كاتێك لە ساڵی *1660* پادشایەتی گەڕایەوە بۆ بەریتانیا، پێی وابوو ئەو گەردەلولە كۆتایی دێت كە وڵاتی گرتبوەوە، بەڵام وادەر نەچوو.

"لۆك" حەزی فەلسەفەی لەلا پەیدابوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی "دیكارت"ی خوێندەوەو بەڕونیو ڕەوانی نوسینەكانی سەرسام بوو، بەڵام دواجار پزیشكی كردە پیشەو پێیوابوو ئامرازێكە بۆ خزمەتكردنی مرۆڤایەتیو هەروەها بۆ تەواوكردنی توێژینەوە زانستیو فیكرییەكانی. پزیشكی ڕێگای لەبەردەمدا كردەوە، بۆ ئەوەی بەناوبانگ بێتو پلەوپایەی لە نێوان كەڵە بیریاراندا

هەبێت. ئەو وەکو پزیشکێك ئاشنایەتی لەگەڵ "لۆرد ئاشلی" و"کۆنت شافێتسبری" پەیداکرد. "شافێتسبری" "جۆن لۆك"ی لەخۆی نزیك کردەوەو کردیە جێگە متمانەی خۆی، ئەمە وایکرد لێیەوە فێری نهێنیو وردەکارییەکانی سیاسەت بێت، لەو سەردەمدا کەپڕی بوو لە فرتو فێڵو پلانگێڕی.

"شارلی دووەم" کە ساڵی *1660* هاتە سەر حوکم کەوتە کێشەو ململانێ لەگەڵ پەرلەماندا، ئەگەرچی سەرەتا لەگەڵیاندا پێکهات. ئەمە وایکرد شەڕی نێوان هەردوو پارتی پارێزگارانو ئازادیخوازان گەرمتربێت.. پارتی پارێزگاران داکۆکی لەپادشادەکردو پارتی ئازادیخوازانیش دژبە فراوانبونی دەسەڵاتی پادشا بوون.

"کۆنت شافێتسبری" ڕاوێژکاری پادشا بوو، بەڵام زۆری نەبرد نێوانیان تێکچوو. ئەمە وایکرد "شافێتسبری" ببێتە یەکێك لەسەرکردەکانی پارتی ئازادیخوازانو "جۆن لۆك"یش هەمان هەڵوێستی وەرگرت.

لە ساڵی *1672-1680* پلانگێڕی بەریتانیای گرتەوەو هەندێکی بەفیتی شوێن کەوتوانی پاپا بوو، هەندێکیشی درایە پاڵ پاپاو پادشای فەرەنسا. یاخی بونی "کۆنت شافێتسبری" لە پادشا، سەرەنجام بەشکست کۆتایی هاتو پاشان درایە دادگاو لەوێدا بەبێ تاوان درایە قەڵەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناچار بوو وڵات جێبهێڵێتو ڕووبکاتە هۆڵەندا، تا لە ساڵی *1683* لەوێ کۆچی دوایکرد. لە هەمان ساڵداو بەمەبەستی خۆپارێزی، "جۆن لۆك" بەرەو هۆڵەندا بەڕێکەوتو پێنج ساڵ لەو وڵاتەدا مایەوە. ئەو ماوەیە کاریگەری گەورەی لەسەر فەلسەفەی سیاسی ئەو بەجێهێشت. لەم قۆناغەدا کاڵفینیزم لە ئەوروپا لەسەرەمەرگدا بوو، هاوکات زۆرێك لە پرۆتستانت مەزهەبەکان پاش هەڵوەشاندنەوەی بڕیارنامەی نانت لە ساڵی *1685*، ڕویانکردە وڵاتی هۆڵەندا.. لەبەریتانیا "شارلی دووەم" کۆچی دوایی کردو "جاکی دووەم" کە کەسێکی کاتۆلیك مەزهەب بوو جێگای گرتەوە، "جاك" بەم کارەی کەوتە دژایەتیکردنی هەستوسۆزی ڕێژەیەکی زۆری هاوڵاتیانی بەریتانیا. "جۆن لۆك" زۆر لەو پادشا ستەمکارانە داخ لە دڵ بوو کە بە بیانوی مافی یەزدانیەوە دەست بەرداری کورسی حوکمڕانی نەدەبوون، نمونەکانی وەك "لویسی چواردە". "لۆك" لەناخەوە ڕقی لەبنەماڵەی "ستیوارت" بوو، لەبەرئەوەی ئەوان لەگەڵ پادشای فەرەنسا سەرگەرمی پلانگێڕان بوون بەمەبەستی گێڕانەوەی ئایینی ڕۆما بۆ بەریتانیا. لەو ماوەیەدا "لۆك" ئاشنایەتی لەگەڵ "گیوم دۆرانگ" دا پەیداکرد. "دۆرانگ" زاوای "جاکی دووەم" بوو، هەروەها هۆڵندییەکی پرۆتستانت مەزهەب بوو کە ئومێدی کاڵڤینزمی ئەوروپی تێدا کۆبووبووەوە دژ بە "لویسی چواردە"و کاتۆلیکیەت.

ساڵی *1688*"دۆرانگ" لەلایەن زۆرینەی زۆری گەلی بەریتانیو کلێسای ڕەسمیەوە بانگهێشت کرا، ئەویش بەدەنگی داواکاریەکەوە چوو. "دۆرانگ" بەرەو بەریتانیا کەوتە ڕێو ڕووبەڕووی هیچ بەرەنگارییەك نەبوەوە، بەم جۆرە بنەماڵەی "ستیوارت" بۆ هەتاهەتایە لە دەسەڵات دوورخرانەوە.

ساڵی 1689 "جۆن لۆك" گەڕایەوە بۆ بەریتانیاو لەگەڵ خۆشیدا سامانە فیکرییەکەی هێنایەوە، کە بریتی بوو لە دوو کتێبی گرنگ بەناوی: (هەوڵێك دەربارەی تێگەیشتنی مرۆیی) و (دەربارەی حکومەتی مەدەنی)و هەردووکیان لە

ســاڵی *1690* بڵاوکرانــەوە. بەرهەمــەکانی دیکــەش دوابەدوای یەك تا ساڵی *1695* بڵاوکردەوە. وەختێك لە ساڵی *1704* کۆچی دوایکرد, زۆربەی کتێبەکانی لەلایــەن دوو کەســی پرۆتســتانت مەزهەبــەوە وەرگێڕدرابونە سەر زمانی فەرەنسی.

## فەلسەفەی سیاسی "جۆن لۆك":

"لۆك" فۆرمێکی نوێ بە تیۆریای پەیمان بەندی لەدەوڵەتدا دەبەخشێت, فۆرمێك کە لەگەڵ پێداویستیە سیاسیەکانی بەریتانیای دوای ساڵی *1688* بگونجێت. ئازادیخوازەکان کە لە ململانێیاندا لەگــەڵ پادشــادا ســەرکەوتوبوون, پێویســتیان بــە یەکێك هەبوو خەسڵەتەکانی ئەو سەرکەوتنەیان بۆ دەستنیشان بکاتو ئەو ڕێبازەشیان پێنیشان بدات کە پێویستە لەسەری بڕۆن.

"لــۆك" بۆچــونو بنــەما تیۆریــەکانی لــە "هــۆبس"ەوە وەرگــرت, بــەڵام جیــاوازی نێــوان هــەردووکیان زۆر گەورەیــە.. بــۆ نمونــە, "هــۆبس" پشــتی بــەدۆخی سروشــتی *(Ietat de nature)* و چــەمکی پــەیمان *(Contract)* بەســتبوو بــۆ هەڵسەنگاندنی حوکمڕانی تاکە کەسی ستەمکار. لە بەرامبــەردا "لــۆك" بــۆ ئــەوە پشــتی بــە دۆخــی سروشتیو پەیمان بەست, تا تاکگەراییەکی ئازادو سەربەخۆ بێنێتە ئارا.

"هۆبس" هەوڵی بۆ هێنانە ئارای سستمێکی حــوکمڕانی ڕەهــاو بــەهێز ئــەوە بــوو, پشــێویو نائــارامی نــەهێڵێت, تەنانــەت گــەر ئەمــەش ببێتــە مایــەی ئــەوەی قوربــانی بــەئازادیش بــدات. بــەڵام "لـۆك" لـە دژی سـتەمکاری وەسـتایەوە, هـەر بۆیـە خواستی ئەو دەسەڵاتێك بوو سنوردارو ڕەزامەندی گــەلی لەســەربێت. ئەمــەش بــۆ ئــەوە بــوو ڕێگربێــت لەبــەردەم هاتنــەئارای هــەر جــۆرە ســتەمکارییەك, تەنانــەت گــەر ئــەو ســتەمکاریەش لەپشــێویو نائارامی قوتارمان بکات. ئەمە وایکرد "لۆك" ئەو تیوریــای مــافی یەزدانیــە تێکوپێــك بــدات, کــە بنەماڵــەی "ستیوارت"و شوێن کەوتوانیان دەست بەرداری نەدەبوون. ئەم تێوریا ئایینیە کاتۆلیکیو ئینگلیکانییــەی لــەژێر پــەردەی مــافی یەزدانیــدا, دزێوترین تاوانی حەشاردابوو.

لێــرەوە گــەڕان لــە سەرچــاوەیەکی نــوێ بــۆ دەســەڵات کــە جێگــای سەرچاوەی دەســەڵاتی پێشــو بگرێتــەوە, بــوو بــە کــارێکی پێویســت. هــەروەها داڕشتنی فۆرمێکی سیاسی دیکە بۆ ئەو سستمە نوێیــەی ئــازادیخوازە ســەرکەوتوەکان دایــان مەزراندبوو, پێویستیەکی دیکەی ئەو قۆناغە بوو.. فەلسەفەی سیاسی "جۆن لۆك" کە لە ساڵی *1690*و پاش سەرکەوتنی شۆڕش تەواو کامڵ بوو, بۆ ئەوە هــات تــا ڕووبــەڕووی ئــەو کێشــانە بێتــەوەو ئــەم فەلسەفەیەشی خستە خزمەت ئازادیخوازەکانەوە.

"لۆك" لە پێشەکی کتێبەکەیدا (دەربارەی حوکمی مــەدەنی) دەڵێــت: (ئــەوەی لــەم کتێبــەی دەخــوازم ئەوەیە بتوانێت پایەکانی دەسەڵاتی بەناوبانگترین فریادڕەسی ئێمە, پادشای ئێستامان شا–گیوم– پتەوتر بکات. هەروەها ئاشکرای بکات پادشایەتی ئـەو لەسـەر ڕەزامەنـدی گـەل دامـەزراوە, کـە تاکـە سەرچــاوەی هــەموو سســتمێکی حــوکمڕانی مەشروعەو, هاوکات ئەوەش نیشانی جیهان بدات کــە گــەلی ئێمــە لەبــەر خۆشەویســتی بــۆ مافــە سروشـتیەکانی خـۆییو خواسـتو ویستیشـی بـۆ پارێزگــاری کــردن لــەو مافانــە, کەوتــە پاراســتنی نەتەوەی ئینگلیز لەو ساتەی ئەو نەتەوەیە لەسەر لێــواری کۆیلایــەتیو تیاچــوندا بــوو)[1]. "لــۆك" دەیویست تێوریای حوکمڕانی ڕەها لای "فیلمەر" تێکوپێك بدات, بەڵام بەهیچ شێوەیەك خۆی لە

قەرەی تیۆریاکەی "هۆبس" نەدا. "فیلمەر" یەکێك بوو لەوانەی سەرسەختانە داکۆکی لە پاشایەتی دەکردو پێی وابوو دەسەلاتی پادشا، هاوشێوەی دەسەلاتی باوکە بەسەر منداڵەکانیداو ڕاستەوخۆش لەو دەسەلاتەوە سەرچاوە دەگرێت کە یەزدان بەئادەمی بەخشی، بەلام "لۆك" بەمجۆرە وەلامی ئەم بۆچونانەی دایەوە:

**یەکەم**/ دەسەلاتی باوك بەسەر منداڵەکانیدا ڕەها نییە، بەتایبەتی کاتێك ئەو منداڵانە گەورە دەبن‌و وایان لێدێت بەهۆی هوشیاری خۆیانەوە دەتوانن بەرپرسیارێتی لەئەستۆ بگرن.

**دووەم**/ پەیوەندی پادشا بەهاولاتیانەوە، دروست هاوشێوەی ئەو پەیوەندییە نییە کە لە نێوان باوك‌و فرزەندەکانیدا هەیە.

**سێیەم**/ ئەستەمە پێکۆڵی ئەو گواستنەوە ڕاستەوخۆیەی دەسەلاتی باوکسالاری بکەین، لە "ئادەم"ەوە بۆ "شارلی دووەم"[2].

"لۆك" بەو پێیەی لەئامێزی پاکژ ویستەکاندا گەورە بوو بوو، زۆری لەو شتانە وەرگرتبوو کەپەیوەندیان بەیاسای سروشتی‌و مافی تاکە کەس‌و دەوڵەت‌و تۆلێرانسەوە هەبوو.

دەسەلاتی فەرمانڕەوا پەیوەستە بەو متمانەیەوە کە هاولاتیان پێی دەبەخشن، تاخێرو چاکەیان بۆ دابین بکات. حکومەت بەپادشاو پەرلەمانەوە، لەبەردەم میللەتدا بەرپرسیارن. دەبێت دەسەلاتی حوکم، پابەندبێت بەڕێسا ئەخلاقی‌و بنەما دەستوری‌و بەلێنە مێژووییەکانەوە. "لۆك" چەند باوەڕی بەپێویستی بوونی حکومەت هەیە لەپێناو بەرژەوەندی گشتیدا، هێندەش باوەڕی بەوەیە کەحکومەت مادامەکی مافەکانی لەگەلەوە وەردەگرێت، ناشێت ئەو مافانەی لێبسەندرێتەوە، چونکە متمانەی گەلی بەدەست هێناوە.

### دۆخی سروشتی:

"لۆك" دۆخی سروشتی بەدۆخی ئاشتی‌و دڵنیایی‌و ئارامی وێنادەکات، کەتیایدا نیەت پاکی‌و یارمەتیدانی یەکتری‌و هاوسۆزی بەرقەرارە. ئەو پێی وایە لەو دۆخەدا، خەلك بەئازادی‌و وەك یەك ژیاون‌و ئەوەشی حوکمی کردون تەنها یاسای سروشتی خۆرسك بووە. بەم پێیە دۆخی سروشتی دەکەوێتە پێش پەیمانی کۆمەلایەتی. دۆخی سروشتی لای "لۆك" جیاوازە لە دۆخی سروشتی لای "هۆبس"، چونکە ئەو دۆخی سروشتی بەشەڕی هەموان لەدژی ئەوانیتر نەدەبینی، بەلکو بەپێچەوانەوە پێی وابوو ئەو دۆخەیە کە ئازادی تەواوی تێدابووەو، ئەمەش وایکردووە ئەقلی مرۆڤ بەشێوەیەك ئاڕاستە بکات کە یارمەتیدەری بێت بۆ ئەوەی ژیان‌و کەلوپەلەکانی بپارێزێت. هەروەها خەسلەتێکی دیکەی دۆخی سروشتی ئەوەیە کە یەکسانی تێدا بەرقەرار بووە، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە تەواوی خەلکی لەمافە سرووشتیەکاندا وەکو یەك وان، بۆ هیچ کەسێکیش نییە زیاد لەوانیتر لەو مافانە بەهرەمەندبێت.

دۆخی سروشتی دۆخێکی ناکۆمەلایەتی نەبوو، بەلکو تەنها ئەوە بوو کە دۆخێکی ناسیاسی بوو. ئەوەشی وامان لێدەکات بلێین دۆخێکی کۆمەلایەتی لە ئارەدا بووە، ئەوەیە مرۆڤ لەو قۆناغەدا لەسەر بنەمای یاسایەکی سروشتی خۆرسك مامەلەیان دەکردو یارمەتی یەکتریان دەدا، ئەم یاسایەش فەزایەکی ئازادی‌و یەکسانی‌و ڕێزگرتنی ماف‌و ئازادی‌و موڵك‌و مالی کەسانی تری بۆ هەموان ڕەخساندبوو. "لۆك" پێی وایە مادامەکی ئینسانەکان لە کاتی لە دایکبونیانەوە

یەكسـان و چـونیەكن, ئـەوا دەبێـت لـە مافـە سروشتیەكانیشدا وەكیەك و یەكسانبن.

دەشـێت مافـە سروشـتیەكان لـەم سـێ شـتەدا كۆبكەینەوە: (ژیان و ئازادی و موڵكداری)[3].

"لۆك" جیاوازی لـە نێوان دۆخـی سروشـتی و دۆخـی كۆمـەڵگای سسـتماتیكیدا دەكـات, ئەمـەش بەنیشـاندانی ئـەو كەموكورییانـەی لـە دۆخـی سروشـتیدا هەیـە. بـۆ نمونـە, كاتێـك خـەڵك خـۆی دادوەری كێشـەكانی خـۆی بێـت, وەك ئـەوەی لـە دۆخی سروشتیدا هەیە, كەم و كوڕی لە سێ ڕووەوە بەدەردەكەوێت[4]:

1-ئـەو بڕیارانـەی دەدرێـت, لایـەنگری پێـوە دیـار دەبێت.

2-هێزی جێبەجێكردنی بڕیارەكـان وەك پێویست نابێت.

3-ئـەو بڕیارانـەی لەسـەر كێشـە چـون یەكـەكان دەردەچـێت, بـەپێی جیـاوازی كەسـەكان بڕیارەكانیش جیاواز دەبن.

كەواتـە گـەر وابێـت, ئـەوا بـۆ چارەسـەر كردنی ئەم كەم و كوڕیانە پێویستمان بە سێ شت دەبێت:

1-دادوەرێـك كـە یاسـا بـێ هـیچ لایەنگیرییـەك جێبەجێ بكات.

2-بـونی هێزێكـی جێبـەجێكردنی وا كـە فەرمانەكانی دادوەر بسەپێنێ.

3-بونی دەزگایـەكی یاسادانانی وا كـە یاسایەكی یەكگرتوو دابڕێژێت, تـا بـەپێی ئـەوە حوكم و بڕیـار بدرێت.

بـۆ ئـەوەی ئـەم پرۆسـەیەش بەئـەنجام بگـات, ئـەوا دەبێت هـەر كەسێك دەستبەرداری بەشێك لـە دەسـەڵاتی خـۆی بێت, (نـەك دەستبەرداری تـەواوی دەسـەڵاتی بێـت, وەكـو هـۆبس باسـی دەكـرد). ئـەو كـات بـەكاربردنی ئـەو دەسـەڵاتە دەكەوێتـە دەست (دەزگای جێبەجێكردن), ئەمەش لەسەر بنەمای ئەو ڕێسـایانەی ئەنـدامانی كۆمـەڵگا لەسـەری ڕێـك دەكـەون, یـاخود ئـەو كەسـانە دایدەڕێـژن كـە لـەم مەسەلەیەدا نوێنەرایەتی خەڵك دەكەن (واتە دەزگای یاسـادانان). ئـەو كەسـانەی لـە دۆخـی سروشـتیدا بەهرەمەنـدن لـەئارامی و ئـازادی و بەختـەوەری, بـەو مەبەسـتە پـەنا بـۆ ژیـانی كۆمەڵایـەتی سسـتماتیك دەبەن تابەرژەوەندی و سودو بەختـەوەری و لەسـەرو هـەموو ئەمانەشـەوە, تـا موڵـك و ماڵاتـەكانیان بپـارێزن و لـەڕێگای دانـانی یاسـا گـەلێك و دەسـەڵاتێكی جێبەجێكردنـەوە ڕێكیـان بخـەن. سەبارەت بەپەیوەندی ئاكاربە یاساوە, "لۆك" پێـی وابـوو مـاف و ئەركـە ئەخلاقیـەكان لـە خۆیانـدا حەقیقـەتێكن و بەر لەیاسا لـەئارادا بوون. جیاوازی گەورەی نێوان"لۆك" و"هۆبس" لێرەدایە. لەكاتێكدا "هـۆبس" پێـی وابـوو ئـەوە دەسـەڵاتە یاسـا ئەخلاقیـەكان دێنێتـە بـون, "لـۆك" دەیـوت یاسا ئەخلاقیەكان بەر لە دەوڵـەت هـەبون و یاساش چـییە, جگـە لـە ئیعترافكـردن بـەبونی ئـەو یاسـا ئەخلاقیانـەو ئامرازێـك بـۆ مسـۆگەركردنی جێبەجێكردنیان.

## موڵكایەتی تایبەت:

"لـۆك" پێـی وابـوو موڵكایـەتی لـە دۆخـی سروشـتیدا موڵكایەتیـەكی هاوبـەش و هەمەكییـە, واتـە هـەموو كەسـێك مـافی ئـەوەی هـەبووە سەرچاوەی بـژێوی خـۆی لـە تـەواوی ئەو شتانەی سروشـت پێشكەشـی دەكـات, بەدەسـت بێنێـت. هەرچـی مـافی موڵكایـەتی تایبەتیشـە ئـەوا لـەڕێی كاركردنەوە دروست دەبێت, واتـە مرۆڤ هـەر شتێك بەرەنجی شانی خۆی بەرهـەم بێنێت دەبێتـە موڵكی

خـۆی. ئـەو ڕای وابـوو (مـرۆڤ مـافی سروشـتی خۆیـەتی هـەر شـتێك ڕەنجـی لەگـەڵ كێشـابێت و پێیەوە ماندوو بوبێت بەموڵكی خۆیی بزانێت, بۆ نمونـە وەك ئـەوەی پارچـە زەوییـەك بكێڵێـت و چـواردەوری بگرێـت)[5]. لـەم حاڵەتـەدا ئـەو زەوییـە تەوقـدراو و كێڵـدراوە, دەبێتـە مـوڵكێكی سروشـتی ئەو مرۆڤەی ڕەنجی بۆ كێشاوە.

ئـەم تیۆریایـەی "جـۆن لـۆك" دەربـارەی موڵكایـەتی تایبـەت, پێمـان دەڵێـت: (موڵكایـەتی تایبەت مافێكە, تەنانەت بەر لەكۆمەڵگەی سەرەتایی سروشـتیش هـەبووە و مافێكـە فـەرد لەگـەڵ خۆیـدا دەیهێنێتە ناو كۆمەڵگاوە. كەواتە كۆمەڵگا ئەم مافە دروست ناكات و لە سنورێكی دیاریكراویشدا نەبێت ناتوانێت ڕێكی بخات, چونكە سستمی حوكمڕانی و كۆمـەڵگا بـۆ ئـەوە هـەن تـا ئـەو مـافی موڵكایەتییـە بپارێزن كە لە پێش ئەواندا هەبووە).

ئەمـە ئـەوە ناگەیـەنێت كـە "جۆن لۆك" تـەنها موڵكایـەتی تایبـەتی بـە بـەمافی سروشـتی زانیـوە, چونكە ئەو لەدیاریكردنی مافە سروشتیەكاندا زیاد لـەجارێك باسـی لـەزارەوە گـەلێكی وەك (ژیـان و ئـازادی و پلەوپایـە) كـردووە, بـەڵام زۆریـش (موڵكایەتی تایبەتی) بەكارهێناوە.

بـەم جـۆرە "لـۆك" لـەڕووی گرنگیـەوە, بەیـەك چـاو سـەیری موڵكایـەتی تایبـەت و كـۆی مافـەكانی دیكـەی كردووە, واتـە ئـەو مافانـەی واداوەتـە قەڵـەم كە خەسڵەتی تاكە كەسن و لەگەڵیدا لـەدایك دەبن. كۆمەڵگـەو حكومـەتیش ئـەو مافانـەیان چەسـپاندووە و نەڕەتدەكرێنـەوە و نـەوەلاوەش دەنـرێن, لەبەرئـەوەی كۆمەڵگـەو حكومـەت بـۆ ئـەوە دروسـت بـوون تـا پارێزگـاری لـەو مافانـە بكـەن. تـەنها كـاری ئـەوان, ڕێكخستن و پاراستنی تـەواوی ئەو مافانەیە.

لێـرەوە تیۆریاكـەی "لـۆك" وەك تیۆریاكـەی "تۆمـاس هـۆبس" بەتیۆریایـەكی تاكـە كەسـی و پراگمـاتی درایـە قەڵـەم, بـەڵام لەتێڕوانینیـدا بـۆ كۆمەڵگـە "لـۆك" لـە "هـۆبس" جیادەبێتـەوە. بـۆ نمونـە, "هـۆبس" كۆمەڵگـەی بەشـتێكی مـەجازی دەبینی و پێی وابوو بەرژەوەندی گشتی بونی نییە, بـەڵام "لـۆك" پێـی وابـوو كۆمەڵگـە حەقیقـەتێكی واقعیـە و بەرژەوەنـدی گشـتیش هەیـە و شـتێكی بەرچاوە.

## پەیمانی كۆمەڵایەتی:

لای "لۆك" پەیمانی كۆمەڵایەتی بریتییە لە پێكهاتنی نێوان گەل لەگەڵ حكومەت یان پادشادا, ئەمـەش بەپێچـەوانەی بۆچـونی "تۆمـاس هۆبس"ەوەیە كەپێیوابوو حكومـەت یاخود پادشا لایەنێك نین لـەو ڕێكەوتنـەدا, لەبەرئـەوەی لایـەن نین ئـەوا بۆمـان نییـە بڵـێن ئـەوان پێشـێلی یاسـایان كردووە یاخود پەیماننامەكەیان شكاندووە. لێرەدا پـەیمان لای "لۆك" ڕێكەوتنـە لـەنێوان دوو لایەنـدا, هەر لایەنێك ئەركەكانی خۆی جێبەجێ نەكرد, ئەوا ڕێكەوتنەكە بەتاڵ دەبێتـەوە. ئەمـە مانـای وایـە گـەر پادشـا بەئـەركی خـۆی هەڵنەسـتا یـاخود ئـەو بەرپرسـیارێتیەی بەرامبـەر بەمیللـەت لەسـەر شـانیەتی جێبـەجێ نـەكرد, یـان كەوتـە خـراپ بەكارهێنانی ئەو دەسەڵاتەی خەڵك پێیان داوە, ئەوا دەبێـت لەسـەر كـار لابرێـت و دەسـەڵاتی لێبسەندرێتەوە.

لەپـەیمانی كۆمەڵایەتیـدا كەسـەكان دەسـتبەرداری تـەواوی مافە سروشـتیەكانی خۆیـان نابن, بـەڵكو تـەنها دەستبەرداری بەشێكی دەبن بـۆ بەرژەوەنـدی گشـتی و بەشـەكەی دیكـەی ئـەو مافـە سروشـتیانە لـە سـەردەمی كۆمەڵگـەی سیاسـیدا

دەمێننــەوە، وەكــو بەربەســتێك بــەڕووی كەســی فــەرمانڕەوادا. كەســەكان تــەنها دەســتبەرداری دووشت دەبن بۆ كۆمەڵگە[6]:

ا–مافی جێبەجێكردنی یاسای سروشت.

ب–مافی سزادانی ئەوەی سەرپێچی ئەو یاسایە بكات.

واتە دەستبەرداری ئەوە دەبن، كە لە یەك كاتدا ببنە دادوەرو جێبەجێكاری یاسای سروشتیو ئەم ئەركە جێدێڵن بۆ كۆمەڵگە بەگشتی.

پێویستە لەپـەیمانی كۆمەڵایەتیـدا كەسـەكان ڕەزامەندی نیشان بدەن، بۆ دەستبەرداربونی بەشێك لەمافە سروشـتیەكانی خۆیـان، وەك: (بـەرگریكردن لـەخۆیانو سـزادانی ئەوانــەی سەرپێچـی یاسـا سروشـتیەكان دەكـەن)و ئـەركی ڕاپەڕانـدنی ئـەو ئەركانە بە كۆمەڵگە بسپێرن.

ئامـــانج لـــەم پەیمانـــە كۆمەڵایەتیـــەش، دەســـــتەبەركردنی چـــــاودێریو پاراســـــتنی تــەواوی مافــە سروشــتیەكانی تاكــە كەســە كــە پەیوەنـدیان بـەژیانو ئـازادیو موڵـكو ماڵاتیـەوە هەیـــە، لـــە هەڕەشـــەو مەترســـیە دەرەكـــیو ناوخۆییەكان.

كەواتــە دەســتبەردار بــوون لێــرەدا، مانــای دەسـتبەرداری هـەموو ئـەو شـتانە نییـە كـە مـرۆڤ هەیەتی، وەكو "تۆماس هۆبس" پێی وابوو.

كەســەكان ســازش لــە بەشــێك لــە مافــە سروشـتیەكانی خۆیـان ناكـەن بـۆ پادشـا یـان بـۆ حكومــەت، بــەڵكو بــۆ تــەواوی كۆمەڵگــە دەكــەن، بەمجۆرەش بڕیارەكانی كۆمەڵگە دەبێتە یاسا.

"لــۆك" خواســتی ئــەوە بــوو ئاســتێك بــۆ دەسـەڵاتی سیاسـی دابنێت، نـەك ستایشـی بكـات. چونكە بەبڕوای ئەو سەروەری لـەڕێی هیچ كەسێك یـان هـیچ فـەرمانڕەواو پادشـایەكەوە بەرجەسـتە نابێــت، بـــەم جـــۆرە ئـــەو لێـــرەدا ســـەروەری دەگەڕێنێتەوە بۆ گەل، تەنها بۆ گەلو بۆ كەسێكی ترنا.

ئـــەو مافـــە سروشـــتیانەی لـــە كۆمەڵگـــە سەرەتاییەكاندا ئاستێكیان بۆ دەسەڵاتی تاكەكەس دانا، تا ئێستاش ڕێگرە لە پاوانخوازی دەسەڵات لە كۆمەڵگە شارستانیەكاندا. ئەم پرۆسەیەش بەردەوام دەبێــت، مادامــەكی خــەڵك دەســتبەرداری مافــە سروشـتیەكانی خۆیـان نـەبن، لـەژیانو ئـازادیو موڵكداری[7].

ئـەم بۆچـونانەی لای سـەرەوە، دەمانگەیەننـە ئەوەی بڵێین:

1–مـــافی زۆرینـــە، بنـــەمای ســـەرەكی كۆمەڵگـە پێكـدێنێت و سەرچـاوەی دەسـەڵاتەكانی یاسادانانو جێبەجێ كردنیشە. پێویستە ئیرادەی كەمینـە مـل بـۆ ئیرادەی گشـتی بـدات كـە ئیرادەی زۆرینەی خەڵكە.

2–كەسـی فـەرمانڕەوا ئەركـەكانی بـەپێی یاسـا ڕادەپـەڕێنێت، بە لەبەرچاوگرتنی ئـەو مافانـەی لـە یاسـای سروشـتیدا هـاتون، هـەروەها بەپابـەندبوون بەدەقی ئەو پەیمانی كۆمەڵایەتیەی، خۆی لایـەنێكی بەشداربوو بووە تێیداو ئیمزای لەسەركردووە.

3–ئەگەر فەرمانڕەوا ئەركەكانی جێبـەجێ نـەكردو لەبـەدیهێنانی ئـەو ئامانجـە لایـدا كـە لـە پێناویـدا هـاتووە، ئـەوا گـەل مـافی ئـەوەی هەیـە ئـەو كەسـە لابداو یەكێكی تر لەجێگای دابنێت.

بەپێچـەوانەی "هـۆبس"ەوە، "لـۆك" بـڕوای وابـــوو ســـەروەریو دەســـەڵات مـــوڵكی تـــەواوی ئەندامانی كۆمەڵگەیە. هەروەها پێی وابوو ئیرادەی هەق ئیرادەی كەسی فەرمانڕەوا یاخود پادشا نییە، بەڵكو لای ئەو ئیرادەی گشتی تەعبیر بوو لە ئیرادەی هـەق، كـە دەبێـت هـەموان بـە (گـەلو حكومەتـەوە)

گوێڕایەڵی بن، لەبەرئەوەی جەوهەرو یەکیەتی کۆمەڵگە پێکدێنێت. دواتر دەبینین ئەم بۆچونانە چ کاریگەریەك لەسەر "جان جاك ڕۆسۆ" جێدێڵن، بەتایبەتی بۆچوونی سەبارەت بەئیرادەی گشتی.

## کۆمەڵگەو حکومەت و لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان:

"لۆك" پێی وابوو دروستکردنی حکومەت لەڕووی گرنگیەوە، زۆر لەو پەیمانە سەرەکیە کەمترە کەکۆمەڵگەیەکی مەدەنی لەسەر دروست دەبێت. ڕازی بونی زۆرینە بەسە بۆ دروستکردنی حکومەت، شتێکی ئاسایشە کەکۆی دەسەڵاتی کۆمەڵگە لەو زۆرینەیەدا کۆبێتەوە. ئەو پێی وایە (وەختێك مرۆڤەکان لە دۆخی سروشتیەوە دەچنە دۆخی کۆمەڵایەتی، بەپێی ڕێکەوتنێك ئەو کارە دەکەن کە لەناو خۆیانداو بەویست و ڕەزامەندی خۆیان لەسەری پێکهاتوون. ئەم ڕێکەوتنە پێکهێنانی دەستەیەکی سیاسی لێدەکەوێتەوە. بۆ ئەوەی ئەم دەستەیەش دەست بەکارەکانی خۆی بکات، دەبوو بڕیارەکانی بەڕەزامەندی زۆرینەی ئەندامەکانی دەربکات. لێرەوە زۆرینە بوو بەو بنەمایەی کە نابێت دەستبەرداری ببین، چونکە دەست بەرداربونی ئەوە، مانای گەڕانەوەیە بۆ ژیانی سروشتی سەرەتایی)[8].

"لۆك" دەسەڵاتی یاسادانان بە گرنگترین دەسەڵاتەکانی کۆمەڵگا ئەژمار دەکات و بۆ دەستنیشانکردنی فۆرمی حکومەتەکانیش پشت بەم دەسەڵاتە دەبەستێت. کاتێك تەواوی کۆمەڵگا وەزیفەی داڕشتنی یاسا لەدەست خۆیدا دەبێت و خۆشی کەسی حوکمڕان یاخود دەستەی حوکمڕانی بۆ جێبەجێکردنی یاسا دەست نیشان دەکات، ئەوا ئەو حکومەتە دیموکراسی دەبێت. بەڵام ئەگەر زۆرینەی کۆمەڵگا لەڕێی هەڵبژاردنەوە ڕەزامەندیان لەسەر دەستنیشانکردنی دەستەی حوکمڕانی نیشاندا، ئەوا شێوەی ئەو حکومەتە ئۆلیگارشی دەبێت. لەکاتێکدا ئەگەر زۆرینە ڕازی بوون بە دانانی یەك فەرمانڕەوا یاخود پادشایەك، ئەوا فۆرمی ئەو حکومەتە مۆنارکی دەبێت[9].

هاوشان لەگەڵ ئەزمونی شۆڕشی ئینگلیزیدا، "لۆك" پێی وابوو دەسەڵاتی یاسادانان لە کۆمەڵگەدا بەرزو باڵاترین دەسەڵاتەو (دروستکردنی دەسەڵاتی یاسادانانیش سەرەکیترین یاسای وەزعیە لە هەموو وڵاتاندا، دەسەڵاتی یاسادانان دەسەڵاتی باڵاو ڕۆحی جەستەی سیاسیشە، لەبەرئەوەی ڕەزامەندی گشتی لەسەرە)[10]. لەهەمان کاتدا "لۆك" دان بە دەسەڵاتی جێبەجێکردندا دەنێت لەداڕشتنی یاساکاندا، بەڵام هەمیشە ئەم دوو دەسەڵاتە بەکۆمەڵێك کۆت و بەند تەوق دراون.

کۆت و بەندەکانی بەردەم دەسەڵاتی یاسادانان ئەمانەن[11]:

ا–ناکرێت دەسەڵاتی یاسادانان دەسەڵاتێکی قەرەقۆشیانە بێت، لەبەرئەوەی سەرچاوەکەی خودی میللەت خۆیەتی.

ب– ناتوانێت بەپێی چەند ڕێوشوێنێکی تایبەت حوکم بکات، مادامەکی خەڵك بەیاساو دادگا ئاشنا بوون.

ج– نابێت بەبێ ڕەزامەندی، موڵك و ماڵاتی ئەوانی دی بەرێت، "لۆك" ئەم مەسەلەیە وا لێك دەداتەوە کە ناکرێت لەڕێی زۆرینەوە موڵکایەتی زەوت بکرێت.

د-نابێت دەسەڵاتی یاسادانانی خۆی بەدەستەیەكی تر بسپێرێت، لەبەرئەوەی كۆمەڵگە ئەو مافەی هەیە.

هـ-ئەگەر متمانەی گەل لە دەستدا، كۆمەڵگا مافی گۆڕینی دەسەڵاتی یاسادانانی هەیە.

لەم بارەیەوە "*Maxey*" دەڵێت: (لۆك دەسەڵاتی یاسا دانان لەسەرو هەموو دەسەڵاتەكانی ترەوە دادەنێت، لەگەڵ ئەوەشدا هێزێكی رەهای تەواوی نییە، لەبەرئەوەی پابەندەبە رێزگرتن لەمافە سروشتیەكانی تاكە كەس و هەروەها بە بنەماكانی پەیمانی كۆمەڵایەتیەوە. سەرەڕای ئەو كۆت و بەندانەی لەسەر دەسەڵاتی یاسادانان هەیە، لۆك رێگری تر لەبەردەم دەسەڵاتی جێبەجێكردندا دادەنێت، ئەویش لەرێگای جیاكردنەوەی نێوان دەسەڵاتەكان و بەو پێیەی دەسەڵاتی جێبەجێكردن بەشێوەیەكی گشتی پشت بە دەسەڵاتی یاسادانان دەبەستێت و بەرپرسیارە لەبەرامبەریدا).

بۆیە لەپێناو پاراستنی ئازادیدا، چاكتر وایە دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێكردن پێكەوە لە دەستی یەك كەسدا نەبن. بەپشت بەستن بەو سێ كەموكوڕیەی لە دۆخی سروشتیدا هەیە، "لۆك" دەسەڵات دەكات بەسێ بەشەوە، ئەگەرچی لەدوایدا پشتی بەهەمان دابەشكاری نەبەست، بەڵكو بونی دەسەڵاتی بەم شێوەیە دەست نیشانكرد: (یاسادانان، جێبەجێكردن، هاوپەیمانێتی بەستن)، ئەركی ئەمەی دوایشیان، بایەخدانە بەپەیوەندیەكانی دەرەوە (رێكەوتن و پەیمان بەستن، جەنگ و ئاشتی)، بەڵام ئەم دەسەڵاتە تایبەتە بەردەوام و بەشێوەیەكی عەمەلی تێكەڵ بەدەسەڵاتی جێبەجێكردن دەبێت، هەرچی دەسەڵاتی دادوەریشە (كە بەبڕوای ئەو لەبنەڕەتدا گرنگی بەكێشە ناوخۆییەكان دەدات، بەتایبەت ئەو مەسەلانەی پەیوەندیان بە چەسپاندنی دادپەروەریەوە هەیە لەسایەی ئەو یاسایانەی كەیاسادانەر دایدەڕێژێت)، ئەوا بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆو شاراوە بەدەسەڵاتی جێبەجێكردنیەوەی گرێ دابوو.

رەنگە گرنگترین ئایدیایەكی سیاسی "جۆن لۆك" هێنابێتە بواری سیاسیەوە، جیاكردنەوەی دەسەڵاتەكان بێت لەیەكتری. ئەوانەی یاسا دادەنێن وەزیفەیان لەوانە جیاوازترە كە جێبەجێی دەكەن. هاوكات ئەركی دەسەڵاتی یاسادانان هەمیشەیی و بەردەوام نییە وەكی دەسەڵاتی جێبەجێكردن، لەبەرئەوەی یاسادانەران تەنها ئەركیان دانانی یاسایەو هەر كاتێكیش لە دانانی بونەوە ئەركی ئەوان كۆتایی دێت، بەڵام ئەركی دەسەڵاتی جێبەجێكردن ئەركێكی هەمیشەییە[12]، چونكە دەبێت بەشێوەیەكی بەردەوام چاودێری جێبەجێكردنی یاساكان بكات.

لەلایەكی ترەوە، "لۆك" پێی وایە (نابێت مافی جێبەجێكردنی یاسا بەوانە بدەین كە خۆیان یاساكەیان داڕشتووە، لەبەرئەوەی رەنگە خۆیان لەجێبەجێكردنی ئەو یاسایانە هەڵبوێرن كەدایان ناوە، یان رەنگە یاسایەك ئامادە بكەن كە لەڕووی داڕشتن و جێبەجێكردنەوە لەگەڵ خواست و ئارەزووەكانیاندا بگونجێت، بەمە ئەگەری دروست بونی كۆمەڵگایەكی مەدەنی لەباردەچێت و لەپای ئەمەشدا ئازادیەكان و موڵك و ماڵات و ژیانی ئینسانەكان دەكەوێتە مەترسیەوە[13]).

"لۆك" ئەگەرچی پێ لەسەر ئەولەویەتی دەسەڵاتی یاسادانان دادەگرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتی جێبەجێكردن بەپاشكۆی دەسەڵاتی یاسادانان ناداتە قەڵەم، بەڵكو تەنها

دەســـەڵاتێكە فـــەرمانو نـــەرێكانی یاســـادانەر جێبەجێــدەكات. "لــۆك" لــە پێنــاو بەرژەوەنــدی گروپدا, بڕیار دەدات بەپێ دانی بڕێك دەسەڵاتی وا بـە دەسـەڵاتی جێبـەجێكردن كـەبتوانێت لـە هەنـدێ حاڵەتــدا (بەتایبــەت لــەو حاڵەتانــەی دەســەڵاتی یاسادانان یاسای كۆنكرێتی بۆ دیاری نەكردووە, یاخود لەحاڵەتی تایبەتی وادا كەسەپاندنی كتومتی یاسای لەگەڵدا ناگونجێتو پێویست بە چارەسـەری شـیاوتر دەكـات), بـەكاری بهێنێـتو مومارەسـەی بكات.

"لۆك" ئـەم بۆچونەی زیـاتر پەرەپێدەدات, تا ئــەو ڕادەیــەی مــافی ئــەوە دەداتــە دەســەڵاتی جێبەجێكردن كە لە هەندێ حاڵەتی تایبەتیدا یاسا جێبـەجێ نـەكات, ئەگـەر ئـەوە بەرژەوەنـدی گشـتی تێدابێت. ئەم مافەش كە بەدەسەڵاتی جێبـەجێكردن دەدرێت, مافێكی رەها نییە بۆ كەسی فەرمانڕەوا تا بەخواسـتی خـۆی بـەكاری بهێنێـت, بـەڵكو مـافێكی ســـنوردارەو مەبەســـت لێـــی دەســـتەبەركردنی بەرژەوەنـدی گشـتییە. (دەسـەڵاتی جێبـەجێكردن یاسا بچەسپێنێ یاخود بەپێی ئەو دەسەڵاتەی پێی دراوە كار بۆ بەرژەوەندی گشتی بكات, ئـەو پـەیامی متمانەیـــە دەگەیـــەنێت كەیاســـاو بـــۆ بـــونی دێنێتەوە)[14].

لێــرەدا دەبیــنین خیانــەتكردنی دەســەڵاتی یاســادانان لــە پەیامەكــەی خــۆی, تــەواو وەكــو خیانـــەتی دەســـەڵاتی جێبـــەجێكردن وایـــە. بۆیــە پێویســتە لەســەر تــەواوی دەســەڵاتەكان بــەپێی یاســا هەڵســوكەوت بكــەنو ئامانجیــان دادپــەروەریو چــاكەی كۆمــەڵگا بێــت بەگشــتی, هەروەها كار بۆ ئەوە بكەن تا مافە سروشتیەكانی تاكەكـەس كـە بریتییـە لـە: (مـافی ژیـانو ئـازادیو موڵكایەتی) بپارێزن.

## مافی بەرگریكردن:

"لــۆك" لەبەشــی نۆزدەهــەم لــەدووەم وتــاری كتێبــی (هــەوڵێك دەربــارەی تێگەیشــتنی مرۆیــی) بڕیــاری لەســەر مــافی بەرگریكردنــدا, ئەگەرچــی بەڕونیش باسی لێنەكردبوو, بەڵام گرنگیـەكی زۆری پێدرا. لـەم بارەیـەوە دەڵێت: (ئامـانجی حوكمكردن خێروچاكەی مرۆڤایەتییە, ئەی كامـەیان چاكترە بۆ مرۆڤایــەتی: ئــەوەی بــەردەوام میللــەت لەبــەردەم ئیرادەیـەكی سـتەمكاری بـێ سـنور دابێـت, یـاخود هەنــدێك جــار فــەرمانڕەوایان دوچــاری بــەرخورد ببنـەوە, بەتایبـەت كاتێك دەسـەڵاتیان بەشێوەیەكی نـاڕەوا بـەكاردێننو لـەبری پاراسـتنی میللـەت بـۆ وێرانكردنی بەكاری دەهێنن)[15].

"لـۆك" پێـی وایـە بنـەمای كۆمـەڵگای سیاسـی رێكخــراو, بریتییـــە لـــە پاراســـتنی ســـەروماڵی هاوڵاتیانو ئەم كۆمەڵگایەش ئەو كاتە دروست بوو كـە هاوڵاتیـان دەسـتبەرداری هەنـدێك مـافی خۆیـان بوون, بۆ ئـەو حكومەتـەی بەڕێوەیان دەباتو پێـی وابوو ئەم حكومەتەش جگە لە بریكاری كۆمەڵگەو بەرپرســیارێك لــە دەســتەبەركردنی بەرژەوەنــدی گشتیو خۆشگوزەرانەی كۆمەڵگە بەولاوە, شتێكی تــر نییــە. هاوكــات "لــۆك" بنــەمای حــوكمی بــەو متمانەیــە دەزانــی, كەمیللــەت بــە حوكمڕانــەكانی دەبەخشێت.

دەســـــەڵات ئەمانەتێكـــــەو بەفــــەرمانڕەوا ســــپێردراوە تــــا لــــە بەرژەوەنــــدی میللــــەت بــەكاریبهێنێت, خیانــەتكردن لــەو ئەمانەتــەش وا دەخوازێــت میللــەت وەریبگرێتــەوەو ســەرلەنوێ بیداتەوە دەست یەكێكی دیكە. "لۆك" بڕوای وابوو كۆمەڵگەی بەریتانیو حكومەتەكەی, دوو شتی لێك جیــاوازنو حكومــەت لــە پێنــاو خێــرو چــاكەی

کۆمەڵگەدا هەیەو هەر کاتێك بەرژەوەندی کۆمەڵگەی خستە مەترسیەوە پێویستە بگۆڕدرێت,حکومەت بەوە هەڵدەوەشێتەوە کە دەسکاری پێگەی دەسەڵاتی یاسادانان بکات, یاخود خیانەت لەو ئەمانەتە بکات کەمیللەت پێی سپاردوە.

لێرەدا "لۆك" دەیەوێت ئەوە ئاشکرا بکات کە دروستکەری راستەقینەی شۆڕش لە بەریتانیا پادشا بوو, کاتێك هەوڵیدا سنوری دەسەڵاتەکانی فراوانتر بکاتو بەبێ پەرلەمان حوکم بکات, ئەمەش دەسکاریکردنی پێگەی دەسەڵاتی بالآی یاسادانان بوو, ئەو دەسەڵاتەی نوێنەرەکانی لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردرابوون. ئەم کارە بووە مایەی ئەوەی شۆڕش بەسەر پادشادا بکرێتو حکومەتیش هەڵبوەشێنرێتەوە, لەبەرئەوەی گۆڕانکاری لەدەسەڵاتی یاساداناندا رویدابوو.

کاتێك پەرلەمان (دەستەی یاسادانانی بەریتانیا), دەیویست دەستدرێژی بکاتە سەر ژیانی ئازادیو موڵكو ماڵی خەڵك, دەسەڵاتی لە دەستداو لەلایەن پادشاوە هەڵوەشێنرایەوە, تا سەرلەنوێ دەسەڵات بدرێتەوە بەگەل بۆ ئەوەی دەستەیەکی یاسا دانانی نوێ دیاری بکەن, لەبەرئەوەی گەل ئەو ناوبژیوانەیە کەشتەکان لێك جیادەکاتەوەو کێشەکان چارەسەر دەکات. میللەت لەو کاتەی دەبینێت فەرمانڕەوایانی (جا یاسادانەرانبن یان جێبەجێکاران) خیانەت لەو ئامانەتە دەکەن کەپێی سپاردوون, ئەگەر ئامرازی دەستوری لەبەردەمدا نەبوو, ئەوا مافی شۆڕش کردنی هەیەو "لۆك" ئەمە ناو دەنێت مافی (داد بۆ خوا بردن).

ئەم مافەی "هۆبس" لێی دەترسا, "لۆك" پەنای بۆ دەبات, تا پاساوی بەکارهێنانی هێزی لەلایەن میللەتەوە پێبداتەوە, کاتێك لەدژی دەسەڵاتی یاسادانانو جێبەجێکردن بەکاریان دەهێنێت. بەمجۆرە دەگەینە دوایین ئامانجی تیۆریاکەی "لۆك" کەئەویش پاساوی مافی شۆڕشکردنو بەرخودانی پێدەداتەوە. ئەگەر چی "لۆك" هاندەری میللەتان بوو لەوەی بەرپەرچی ستەمکاری بدەنەوەو مافی شۆڕش کردنی بەڕەوا دەزانی, بەلأم بۆچونەکانی نەگەشتە ئەوەی دەسەڵاتی تەواو ببەخشێتە گەل لەحکومکردنی خۆیدا, وەکو ئەوەی "رۆسۆ"و لایەنگرانی تیۆریای دیموکراسی راستەوخۆ تەئکیدیان لێدەکردەوە. "لۆك" ئەو مافەی بەکۆمەڵگە نەدا تا دەسەڵاتی هەبێت, بەڵکو پێی وابوو ئەوە ئەرکی حکومەتە مادامەکی بەئەمانەتەوە ئەرکەکانی جێبەجێدەکاتو تەنها شتێك کە بەکۆمەڵگەی بەخشی مافی گۆڕینی دەسەڵات بوو, ئەویش لەو کاتەی خیانەت لەو ئەمانەتە دەکات کەپێی سپێردراوە. (مافی شۆڕش بەلای جۆن لۆك-ەوە, هەوڵێکە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان بەشێوەیەکی ئەقلانیو یەکلایکردنەوەی مەسەلەکان)[16].

## سەرەنجام:

فیکری سیاسی لای "جۆن لۆك", سەر لەبەر عەلمانییەو بەشێوەیەکی ورد جیاوازی دەکات لەنێوان دەسەڵاتی دنیایو دەسەڵاتی رۆحیداو رایدەگەیەنێت کە (تەواوی دەسەڵاتەکانی حکومەتی مەدەنی, تەنها پەیوەندیان بە بەرژەوەندییە مەدەنییەکانەوە هەیە)[17].

هەروەها داوای لێکبوردنی ئاینی دەکردو دوپاتی دەکاتەوە کە ئەو لەلایەنگرانی مەسیحیەکی ئەقلانییە کە دەکرێت بیروباوەڕە سەرەکیەکانی لەڕێگای ئەقڵەوە بسەلمێنرێت, بەشێکی لە وتاری

یەکـەمی کتێبـی (هـەوڵێك دەربـارەی تێگەیشـتنی مرۆیـی) تـەرخانکرد بـۆ سـەرکۆنەکردنی دەمارگیری ئـاینی. ئەمـە لەدوایـدا بـووە مایـەی زەمینـە خۆشـکردن بـۆ هاتنـە ئـارای ئاقـارێکی ئـەقڵانی ئیمانـدار لـە بـەریتانیادا, کەتەئکیـدی لەسـەر پێدەشتی ئەخلاق بەسەر ئایندا دەکردەوە.

"لۆك" ئەگەرچی تیۆرسینی شۆڕش بوو, بەڵام بۆ خۆی کەسێکی شۆڕشگێڕ نەبوو. ئەو لایـەنگری دەسـەڵاتی میللـی راسـتەوخۆ نـەبوو, وەك چـۆن داکۆکی لـە سسـتمی پاشـایەتی رەهـاش نـەدەکرد, بـەڵکو خولیـای سـەرەکی ئـەو بـەدیهێنانی هێمنـیو ئاسایشو ئارامی بوو.

کاریگـەری گـەورەی "لـۆك", دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی سسـتمی سیاسـی ئـەو لەگـەڵ خواسـتو ویستی ئەو چینە ناوەندەدا دەگونجا کە لەبرەو دابوو. ئەو سستمە سیاسیەش کە ئەو داپڕشتبوو, پایـەکانی بریتـی بـوو لـە داکـۆکی کـردن لـە موڵکایـەتیو بانگەشە کردن بۆ ئەخلاقو خواستی هێنانـە ئـارای حـوکمێکی کـارای پشـت ئەسـتور بـە رەزامەنـدی گـەل, هـەروەها بەرژەوەنـدی زۆرینـە دەخاتـە پـێش بەرژەوەنـدی تاکەکـەسو جـەخت لەسەر لێکبوردنی ئایینی دەکاتەوە.

"تۆمـاس هـۆبس"و "جـۆن لـۆك" لـەوێوە دەسـتیان پێکـرد کـە تاکـە کـەس بنـەمای پـەیمانی کۆمەڵایەتییە, بەڵام هەردووکیان بە دوو دەرەنجامی جیـاواز گەیشـتن. یەکـەمیان بەدەسـەڵاتی رەهـا گەیشتو ئەویکـەیان بەدەسـەڵاتی پەرلـەمانی. ئـەم جیاوەزیەشیان تـەنها بـەجیاوازی بیروبـاوەڕ تەفسیر ناکرێت, بـەڵکو لـەرێی ئـەو ژینگـە کۆمەڵایەتییـەوە لێکدەدرێتـەوە کـە هـەردووکیانی تێـدا ژیـاون. لەسـەردەمی "هـۆبس"دا چـینی ناوەنـد پێویسـتی بـەوەبوو بچـێتە ژێـر رکێفـی دەسـەڵات, بـەڵام لەسـەردەمی "لـۆك"داو بەتایبـەتی پـاش شۆڕشـی *1688*, ئەم چینە پێی وابوو بەڕادەیەك بەهێز بووە دەتوانێـت داوای دەسـەڵات بکـات. "جـۆن لـۆك" کاریگـەری گـەورەی لەمێـژووی فیکـری سیاسـیدا هـەبوو بەتایبـەت لـە سـەدەی هەژدەهەمـدا, بەیـەکێك لەوانـە دادەنـرا کـە بنـەمای دیموکراسـی لیبرالیزمـی تاکـە کەسـیان داڕشـتووەو ئەمـەش بـووە بناغـەی جاڕنامـەی مافـەکانی مـرۆڤ, لـە هـەردوو شۆڕشـی ئەمریکیو فەرەنسی لەسەدەی هەژدەدا.

مـەزنی "لـۆك" بەپلـەی یەکـەم دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی فەلسـەفەیەکی عـەقڵانی قـوڵو سـەراپاگیری پێشکەشـکرد, کەتیایـدا بـڕوای خـۆی بـە مـەزنی مـرۆڤو بـەهاکانی نیشـانداو تەئکیـدی لـەگرنگیو ئەولەویـەتی دەسـەڵاتی میللـی کـردەوە, هـەر لەفەلسـەفەکەیدا دژایەتیـەکی تونـدی سـتەمکاریو مـافی پیرۆزیـی پادشـاکانو ملکەچـکردنی هێـزی کردو حـوکمڕانی کـردە سسـتمێك کەپشـت بـە دامو دەزگاکان ببەستێت.

هەروەها "لۆك" بەشداری لە دەوڵەمەندکردنی فیکـری سیاسـیدا کـرد, ئـەویش بـە ڕێبازەکـەی دەربـارەی مافـە سروشتیەکان کەبریتیییە لە (مـافی ژیـانو ئـازادیو موڵکایـەتی)و پابەنـدبوون بـەم مافانەوە نەك لـە دۆخـی سروشـتیدا, بـەڵکو هاوکات لە دۆخی کۆمەڵایەتیشدا. ئەو یـەکێك بوو لەوانـەی بانگەشـەی بـۆ پێویسـتی لێـك جیاکردنـەوەی دەسـەڵاتەکان دەکـرد, پـاش خۆشـی "مۆنتسـکیۆ" هـاتو لـە کتێبـی (رۆحـی یاسـاکان)دا کـاری لەسـەر ئەم بۆچونە کردو دەوڵەمەندتری کرد.

هەروەها کاریگەری گەورەو گرانی لەسەر ئەو بیریـارو سیاسـیانەش هـەبوو کەبەشـداربوون لـە هەڵایسانی هەردوو شۆڕشی ئەمریکیو فەرەنسیدا, بەتایبەت ئەو بیروبۆچونانەی تەئکیدیان لە ئازادی

تاكەكەس و سەروەری میللەت و مافی ڕاپەڕین لەدژی هەر ستەمكارییەك دەكردەوە، كە ڕێگربێت لەبەردەم مافی ژیان و ئازادی و موڵكایەتی مرۆڤەكاندا.

كاریگەری ئەو تا ئەمڕۆش بەردەوامەو لە نوسینەكانیدا ئەو شتانە دەدۆزینەوە كە ئەگەری جێبەجێ بوون و پراكتیزە كردنیان لەكۆمەڵگا نوێ و هاوچەرخەكانماندا هەیە، ئەوەش دەبینین كە "لۆك" عەودالی بینینەوەی ئازادی بەهێزترین كەس یان ئازادی دەسەلات نەبووە، بەڵكو لەسۆراخی ئازادی هەموو مرۆڤێكدا بووە بەچاوپۆشی لە پلەوپایەو هەلومەرجی ژیانی. هەروەها لە حكومەتێك دەگەڕا، بەڕاستگۆیی نوێنەرایەتی زۆرینەی گەل بكات و بەردەوام لە ئامرازەكانی پاراستنی موڵك و ماڵات و ئازادی و ژیانی هاوڵاتیانی بگەڕێن. ئەمەش وای لە بیریارێكی وەك "*Maxey*" كرد تابڵێت: (ڕەنگە ئێمە لەدنیایەكدا بژین هیچ لەو میسالیەتانەی تێدا جێبەجێ نەبێت كە لۆك داوای دەكرد، بەلام پێویستە لەسەرمان لەپێناو بەدیهێنانیاندا بژین، ئەگەرنا ئەوا مەزنترین بەروبومی شارستانیەت دەدۆڕێنین[18].

## پەراوێزەكان

1– جان جاك شوفالییة: تاریخ الفكر السیاسي من المدینة الدولة الى الدولة القومیة- ص 379.

2- الموسوعة الفلسفیة المختضرة, ترجمة: فؤاد كامل وجلال العشري و عبد الرشید الصادق- من سلسلة الف كتاب 481, مكتبة الانجلو المصریة- القاهرة, 1963- ص 274.

3-جان لوك: فی الحكم المدني- ترجمة: ماجد فخري, بیروت, 1959.

4-د. على عبد المعطي محمد: الفكر السیاسی الغربی- ص 258.

5- عمر عبد الحي: محاضرات فی تاریخ الفكر السیاسی فی العصور الحدیثة- ص 66.

6- جورج سباین: تطور الفكر السیاسي, الكتاب الثالث- ص 707.

7-د. على عبدالمعطي محمد: المرجع السابق, ص 261.

*8- Maxey: political philosphies, p. 266.*

9- د. ابراهیم اباضة وعبد العزیز غنام: تاریخ الفكر السیاسي- دار النجاح, بیروت- 1973, ص 218.

-انظر ایضا: لوك: (المقال الثاني), الفصل الثامن, ص 96.

10- د. على عبد المعطي محمد: المرجع السابق- ص 265-266.

11- جان جاك شوفالیية: تاریخ الفكر السیاسي من المدینة الدولة الى الدولة القومیة, ص 384.

12-جورج سباین: تطور الفكر السیاسي, الكتاب الثالث- ص 715.

*13- Dunning: political theories, Book II, P. 355.*

14-د. علي عبد المعطي محمد: المرجع السابق, ص 267.

15- جان جاك شوفالیية: المرجع السابق, ص 385.

16- المرجع السابق, ص 386.

17- جان توشار: تاریخ الفكر السیاسي- ترجمة: د. علي مقلد- الدار العالمیة للطباعة والنشر, الطبعة الثانیة- بیروت, 1983, ص 297.

18- نفس المرجع, ص 297.

*18-Maxey: political philosophies, p. 200.*

-انظر ایضا: د.علي عبد المعطي محمد: المرجع السابق، ص 272.

## سەرچاوە

# جاك دێریدا..
# ئەستێرەیەكی گەورە لە ئاسمانی پاریسدا كوژایەوە

هاشم سالح
لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

مەرگی جاك دێریدا بەقەدەر ئەو چاوپێكەوتنە دوورودرێـژە دوچـاری سەرسـوڕمانی نـەكردم كـە ڕۆژنامەی لۆمۆند لە 19ی ئابی ئەمساڵدا لەگەڵیدا سـازی كردبـوو، وابـزانم ئەمـە دواچـاوپێكەوتنی دێریدا بوو. من ئەو كاتە سەرسوڕمانەكەم زیادی كرد كە زانیم دوچاری نەخۆشییەكی كوشندە بووە و چووەتە ژێر چارەسەركردنێكی پڕ لە ماندوویێتی و ترسـناكەوە. ئەگەرچـی دێریـدا نـاوی "شێرپەنجە"ی نەهێناوە، بەڵام خوێنەر لە تێكستی چاوپێكەوتنەكەدا تێدەگات كە دێریدا دوچاری ئەو نەخۆشـییە بـووە. مـن لـەو بـاوەڕەدا نـەبووم بـەو خێراییە بمرێت، چونكە چەندین كەس تووشی ئەو نەخۆشییە بوون و بۆ ماوەی چەند مانگێك و بگرە چەند ساڵێكیش ژیاون. هەرچۆنێك بێت، كاتێك بیریارێك یان شاعیرێكی گەورە دەمرێت، مرۆڤ وا هەست دەكات گەردوونیش خەم دایدەگرێت، مرۆ وا هەستدەكات ئەستێرەیەك كوژایەوە. بەڵام ناشێت بڵێین دێریدا بەر لەوادەی خۆی كۆچی دوایی كرد وەك چۆن میشێل فۆكۆ زووتر لە وادەی خۆی مرد، فۆكـۆ هێشـتا تەمـەنی 57 سـاڵی تێنەپەڕانـدبوو كۆچی دوایـی كـرد، كەچـی دێریـدا تەمـەنی 74 ساڵی تێپەڕانـدبوو و كاتێكی گونجاوی هەبوو كە شـتەكانی خـۆی ببەخشـێت و بیانخاتـە ڕوو. ئـەو لـەم سـاڵانەی دواییـدا بەرهـەمی زۆر بـوو، هـیچ سـاڵێ نـەبوو دوو یـان سـێ كتێـب چـاپ نەكات.

من چەند جارێك بەخێرایی دێریدام بینیوە، بەڵام تەنها جارێك بۆم ڕەخسا ماوەیەكی درێـژتر لەگەڵیدا قسە بكەم، ئەو كاتەی چاوپێكەوتنم لەگەڵ بیریـارە فەرەنسـییەكاندا ئـەنجام دەدا پەیوەنـدیم پێـوە كـرد، وا بـزانم ئەمـە بـەر لـە بیسـت سـاڵ لەمەوپێش بوو.

كاتێ داوای گفتوگۆ و چاوپێكەوتنم لێكرد، بە خۆشـحاڵییەكی زۆرەوە ڕازی بـوو بـەوەی لـە

کتێبخانەی زانکۆدا پێشوازیم بکات، ئەگەر چی من ئەو کاتە بە تەواوی ساز و ئامادە نەبووم تا پرسیاری لێبکەم و گفتوگۆی لەگەڵدا بکەم، چونکە ئەو کاتە – و ئێستاش– بە زەحمەت لە نووسینەکانی تێدەگەیشتم. گفتوگۆکە بەشێوەیەکی باش دەستی پێکرد و دێریدا بە گیانێکی کراوەو ئیجابی قسەی دەکرد و تیۆرە فیکرییەکانی خۆی و زاراوەکانی بۆ باس دەکردم بە تایبەتی زاراوەی "هەڵوەشاندنەوە" کە ناوبانگی پێدەرکرد. بەلاّم کاتێ بۆی دەرکەوت من سەرسامم بە میشێل فۆکۆ و بگرە لە چاوپێکەوتنەکەدا پرسیارم لە بارەی بیری فۆکۆ لێدەکرد نەك لە بارەی خۆی، ئیدی زۆر بێزار بوو و چاوپێکەوتنەکەی کورت کردەوەو دواجار بەشێوەیەکی سەلبی کۆتایی پێهات.

چەند هەفتەیەك لەمەوپێش لە ئینتەرنێتدا بە دوای سایتەکاندا دەگەڕام و لە دڵی خۆمدا وتم بۆچی سایتی جاك دێریدا نەکەمەوە؟ ئیدی چوومە ناو سایتەکەیەوەو لەپڕ لە نێو ژمارەیەك چاوپێکەوتن لەگەڵ دێریدا ئەو چاوپێکەوتنەی خۆمم بینی و پێم سەیر بوو. بە ڕاشکاوی دان بەوەدا دەنێم کە لەو باوەڕەدا نەبووم چاوپێکەوتنەکەی من شایانی بلاّوکردنەوە بێت چونکە ئەو کاتە لەسەرەتادا بووم بۆ ناسینی تەوژمەکانی بیری هاوچەرخی فەرەنسی. هەروەها دواتر بۆم دەرکەوت بۆچی دێریدا پێی ناخۆش بوو کە پرسیارم لە بارەی بیری فۆکۆ لێدەکرد.

لە راستیدا دێریدا و فۆکۆ بە درێژایی ماوەی کۆتایی ژیانیان ناکۆك بوون، ئەمەش بەهۆی ئەو وتارە ناودارەی دێریدا کە لە بارەی کتێبی "مێژووی شێتی لە چەرخی کلاسیکیدا"ی فۆکۆی نووسیبوو. لە ڕاستیدا ئەم کتێبە سەرباری هەموو ئەو رەخنانەی دەشێت لێی بگیرێت، کتێبێکی ئێجگار گرنگە، فۆکۆش لە وتارێکی جواندا بە توندی وەلاّمی دێریدای دایەوە و سەرەنجام پەیوەندیی نێوانیان پچڕا. زۆرجار ئەم شتانە لە نێوان ڕۆشنبیراندا روودەدات سا هەرچەند گەورە و گرنگیش بن. گۆڕەپانی ڕۆشنبیریی فەرەنسیش هەروەکو گۆڕەپانی ڕۆشنبیریی عەرەبی پڕیەتی لە ناکۆکی و رژدی و زیزبوون و...هتد.

بەلاّم دەبێ لە خاڵێکی ئیجابیدا دان بە دێریدا بنێین، ئەویش: رقی دێریدا لە فۆکۆ زۆر درێژەی نەکێشا، لە پاش مەرگی فۆکۆ چەندین جار بە باشی باسی کردووە و بگرە تێکستێکی گرنگ و درێژی لە بارەوە نووسیوە و جارێکی تر گەڕاوەتەوە بۆ گفتوگۆکانی نێوانیان لە بارەی بیرۆکەی شێتی و عەقڵ، ئەو گفتوگۆیەی وەك وتمان بووە مایەی لێك زیزبوونی هەردووکیان.

بەلاّم ئەمڕۆ ناکۆکیی نێوان دێریدا – فۆکۆ بووە بەشتێکی لاوەکی پاش ئەوەی نەوەیەکی نوێ لە فەیلەسوفان سەریهەڵداوە، نەوەی قوتابیانی هەردووکیان، ئەم نەوەیە دێریدا و فۆکۆی لەیەك خانەدا داناوەو رەخنەی توندیان لە هەردووکیان گرتووە بە سیفەتی ئەوەی ئەمانە دوژمنی شارستانیەتی خۆرئاوا و مەیلی هیومانیستی ئەورووپی و رۆشنگەرین. من ئەمە دەڵێم و بیر لە کتێبەکەی لۆك فیری و ئالان رینۆ دەکەمەوە کە لە بارەی بیرۆکەی شۆڕشی 1968 نووسیویانە. ئەم دوو نووسەرە فۆکۆیان بەوە تاوانبار کردووە کە لە گۆڕەپانی فەرەنسیدا نوێنەری نیچەیە لە تەك هەندێك لە پەرەپێدان و داهێنان. بەلاّم دێریدا جگە لە لاساییکەرەوەیەکی هایدگەر بێئەوەی شتێکی تازەی بۆ زیاد بکات شتێکی تر نییە. ئەم پەلامار و رەخنەیە لە هەموو کەس زیاتر دێریدای برینداركرد، باوەڕم وایە دێریدا تا مرد کاریگەریی ئەو

رەخنە بریندارکەرەی لەسەربوو، بە بەڵگەی ئەوەی لە دوا چاوپێکەوتنی خۆیدا لە 19ی مانگی ئابدا ئاماژەی پێدەکات.

ئایا جەوهەری ئەو ئەرگۆمێنت و گفتوگۆیە چی بوو کە لە نێوان نەوەی فۆکۆ و دێریدا و دۆلۆز و لیوتار لە سەرێك و نەوەی لۆك فیری و تۆدۆرۆڤ و ئالان رینۆ و گروپەکەیان لەسەرێکی تر روویدا؟ دەبێ ئەوە بزانین کە نەوەی یەکەم راستەوخۆ لە پاش قۆناغی داگیرکاری (ئیستعماری) سەریهەڵدا، ئەمە دوای ئەوەی تاوانەکانی داگیرکاری لە جەزائیر و ڤێتنام و ئەفریقیای رەش و ..هتد ئاشکرا بوو.

بۆیە نەوەی یەکەم هەڵوێستێکی نێگەتیڤانەی دەرهەق بە ژیاری خۆرئاوایی هەبوو و رەخنەی توندی ئاراستە دەکرد، دەبینین فۆکۆ دەستی کرد بە رووتکردنەوەی دامەزراوەکانی ئەو ژیارە و بەشێوەیەکی ئارکیۆلۆجیی قووڵ رەخنەی لێگرت، بۆ نموونە دامەزراوی وەکو نەخۆشخانەی شێتی و بەندیخانەو تەنانەت قوتابخانە و زانکۆ و سەرانسەری ئەو دامەزراوە بورژوازییانەی بە مەبەستی کۆنترۆڵکردن و لە قاڵبدانی خەڵك کار دەکەن و دەیانەوێ لە ڕووی فیکری و جەستەییەوە بیانهێننە ژێر بار. ئەوسا فۆکۆ زاراوەی ئارکیۆلۆجیای خستەڕوو و بەسەر زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکاندا پراکتیزەی کرد تا ڕیشەی قووڵ و درێژی ستەمکاریی ئەورووپی ئاشکرا بکات. لە راستیدا زانستە مرۆڤایەتییەکان رەواییان بە سیستمی نوێ بەخشی وەك چۆن بیری ئاینیی مەسیحی رەوایی بە سیستمی کۆن بەخشیبوو.

هەر لەو سەروەختەشدا جاك دێریدا زاراوەی هەڵوەشاندنەوەی خستەڕوو وبەسەر فەلسەفەی خۆرئاواییدا پراکتیزەی کرد هەر لە ئەفلاتونەوە تا هیگڵ، دیسان بۆ ئەوەی مۆرکی داخراو و زۆرەملێ و ستەمکاریی ئەقلانییەتی خۆرئاوایی ئاشکرا بکات. هەر لەو سەروبەندەدا – واتە لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا – کاتێك میللەتان راپەڕین و لە ژێر چنگی داگیرکار رزگاریان بوو و ناتەواوییەکانی ژیاری خۆرئاوایی زەقتر دەرکەوت، لەوکاتەدا تەوژمی گشتیی بیری فەلسەفی لەبەرژەوەندیی ئەو توێژینەوە رەخنەگرە رادیکاڵییانە بوو. خۆرئاوا لە بەرامبەر ئەو کار و کردەوانەی لە جیهانی سێدا ئەنجامی دابوون هەستی بە تاوان و بێ ویژدانی دەکرد. لەبەرئەوە تیۆریاکانی فۆکۆ و دێریدا و دۆلۆز رەواجیان پەیدا کرد و لە نێوەندی رۆشنبیریی فەرەنسی و ئەورووپی و بگرە تەنانەت ئەمریکیشدا پێشوازیی لێکرا.

دێریدا بە هەندێ لە بیروڕاکانی خۆیدا چۆوەو خۆی ئامادە کرد بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی ئەو پەلامارە کتوپڕ و توندەی نەوەی دووەم ببێتەوە. دواتر دێریدا ئەوەی درکاند کە بە هیچ جۆرێك پەلاماری "ئەقڵ"ی نەداوە وەك نەیارەکانی وا دەڵێن، هەروەها سوکایەتیی بە مافەکانی مرۆڤ و دەستکەوتەکانی تری ژیاری خۆرئاوایی نەکردووە وەکو حوکمی دیموکراتی و فرەیی، دەوڵەتی ماف و یاسا، فرەیی بیروڕاو سیاسەت، ئازادیی ڕۆژنامەگەری و ..هتد. بە بەڵگەی ئەوەی دێریدا داکۆکیی لەو رۆشنبیرانە کردووە کە لە وڵاتە کۆمۆنیستەکاندا دەچەوسێنرانەوە و دوور دەخرانەوە، بە هۆی ئەم هەڵوێستەیشییەوە لە ساڵی 1982دا بۆ ماوەی چەند رۆژێك لە پراگ خرایە زیندانەوە چونکە داکۆکیی لە ئازادیی بیروڕا و مافی مرۆڤ دەکرد لە دەوڵەتە توتالیتارییەکاندا، ئیدی چۆن دەشێت دژی مافەکانی مرۆڤ و دەستکەوتەکانی تری ژیاری خۆرئاوایی بوەستێت؟

چۆن دەشێت سیستمی دیموکراتی و سیستمی کۆمۆنیستی کە ئازادییەکان دەخنکێنێت لە یەك ئاستی یەکساندا دابنێت؟ لەو ساتەوەختەدا پێشبینی سەرهەڵدانی ئەو بزاوتانەی دەکرد کە لە دژی گلوبالیزم دەجولێنەوە، ئەوەی کە لە کاتی چاپکردنی کتێبەکەیدا لە ساڵی 1993 هیچ کەسێك لە بارەیەوە نەدەدوا. ئەو بەر لە ڕوودانی شتەکە هەستی پێکردووە، ئەمەش تایبەتمەندیی بیرمەندە گەورەکانە، واتە ئەوانەی دوورتر دەڕوانن.

دێریدا لە دوا قسەکانیدا کە لە وەسیەت دەچێ، دەڵێ: ئەوەی کە بە مەیلی کۆسمۆپۆلیتیزم یان بە ئینتەرناسیونالیزمی نوێ ناوم دەبرد، ئەوەمان بەسەردا دەسەپێنێت کە پەرە بە یاسای نێودەوڵەتی و ئەو دامەزراوانە بدەین کە تەحەکوم بە سیستمی جیهانەوە دەکەن، واتە سندوقی دراوی نێودەوڵەتی و بانکی نێودەوڵەتی و ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانی و کۆمەڵەی هەشت دەوڵەتە پیشەسازییە گەورەکە و بە تایبەتیش نەتەوە یەکگرتووەکان.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە پەیماننامەی ئەم ڕێکخراوە نێو دەوڵەتییە دێرینە و پێکهاتەکەی بگۆردرێت و بە تایبەتی شوێنەکەی بگۆڕدرێ! دەبێ لە ئەمریکا دەربهێنرێ و خێرا لە نیویۆرك دوور بخرێتەوە.

ئەگەر چی دێریدا دانی بە بایەخی ڕۆشنگەریی لیبرالیدا ناوە بەڵام هەرگیز پاشەکشەی لە ئیدانەکردنی سیستمی سەرمایەداریی جیهانی نەکردووە کە لانیکەم نیوەی بەشەرییەتی لە بەروبومی شارستانیەت و مافە مرۆییەکان بێبەش کردووە و بگرە تەنانەت لەلانیکەمی کەرامەتی بەشەریش بێبەشی کردوون. ئیتر لە کوێیە ئەو مەیلە هیومانیستییەی بۆی دەگرین و فرمێسکی بۆ دەڕێژن ئەی لۆك فێری و ئەی حاکمانی خۆرئاوا، لە کاتێکدا برسێتی ساڵانە سەدان ملیۆن خەڵك دەکوژێت و ئەوانیشی کە ماون لە ڕۆژێکدا لەسەر یەك دۆلار دەژین؟ سوودی ڕۆشنگەری چییە ئەگەر لە خەڵکی ئەوروپی و ئەمریکای باکوردا قەتیس بووبێت؟ کەڵکی شارستانیەت چییە ئەگەر سێ بەشی بەشەرییەت لە بەروبومەکانی بێبەش بن؟ بەم مانایە فەیلەسوفی کۆچکردوو -دێریدا- وازی لە ڕەخنەگرتن لە سێنتڕالیزمی ئیتنیکی ئەوروپی و بە گشتی خۆرئاوایی نەهێنا، بەڵام ئەو شتێکی تازەی بۆ شتەکانی پێشوو زیادکرد، ئەویش: دان نان بوو نەك تەنها بە سەلبیات و بە تاوانەکانی ئەوروپا بەڵکو بەلایەنە پۆزەتیڤ و بە شارستانیەتی ئەوروپاش کە بە هیچ نرخ و بەهایەك ناپێورێن. بگرە ئەو لە دوا قسەکانی و لە دوا وەسیەتەکانیدا ئەوروپای بەتاکە ئەلتەرناتیڤێك دانا کە بەشەرییەت لە دوو مەترسی ڕزگار دەکات: مەترسیی هەژموونی ڕەهای ئەمریکا بەسەر جیهاندا و، مەترسیی تاریکبینی فیکری ئایینی کە سەرانسەری جیهانی عەرەبی – ئیسلامیی گرتۆتەوە و هیچ ڕووناکییەکی تیادا نابینرێ.

بێگومان ئەم پیاوە دان بە بوونی چەندین ڕەوتی دیکەدا دەنێت کە لەناو ئەمریکادا هەن، جگە لە ڕەوتی کۆنزەرڤاتیستە نوێیەکان. پاشان ئەمریکا لەم لایەنەوە شوێنی مەترسی نییە، چونکە ڕەوتی لیبرالیستی پێشکەوتنخواز کە مەیلێکی ئازادیخواز و هیومانیستانەی هەیە، پاش ئەوەی لە شۆکی 11ی سێپتیمبەر تێدەگات، زوو بێت یان درەنگ بە ئاگادێت و دان بە بوونی ڕەوتێکی ئازادیخواز و هیومانیستیدا دەنێت لە جیهانی عەرەبیدا. بەڵام لێرە لەلای ئێمە مەترسییەکە زۆر گەورەترە بەهۆی

هەژموونی سۆسیۆلۆجی واتە ژمارەی زۆری فەندەمینتالیستەکان لە شەقامی عەرەبی و لە شەقامی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی. دنیای ئیسلامی هێشتا قۆناغی رۆشنگەریی فیکریی بەخۆوە نەبینیوە بە پێچەوانەی ئەوروپاو ئەمریکای باکوورەوە کە چەند سەدەیەکە ئەو قۆناغەیان بڕیوە. بۆیە گرفتی دنیای ئیسلامی بەراستی گرفتێکی سەخت و قووڵە و بە ئاسانی چارەسەر ناکرێت. بەڵام هێزی پێشکەوتنخوازیش بوونی هەیە و نابێت بەکەمی سەیر بکرێت.

پاشان ئەم فەیلەسوفە کۆچکردووەمان دەگاتە باسکردنی مەسەلەی ئیسرائیل و دەڵێت: سەرباری هەموو ئەو گرفتانەی لەم چرکەساتەدا ماندووم دەکەن، بە تایبەتی سیاسەتی کارەساتباری ئیسرائیل، سەرباری ئەو گرفتانەی پەیوەندییان بە یەهودییەتی منەوە هەیە، ئەوا من هەرگیز نکوڵی لە یەهودیبوونی خۆم ناکەم، من لە جەزائیر لە خێزانێکی یەهودیدا لەدایکبووم، ئەمە رەگ و ریشەی منە. بەڵام ئیسرائیل لە دیدی مندا نە نوێنەرایەتی یوهودی دەکا نە دیاسبورا و نە زایۆنیزمی جیهانی.

دواتر دێریدا داوا لە نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات خێرا بێتە نێو کێشەی فەلەستینەوەو ئەمان لەگەڵ ئیسرائیل لێکدی جودا بکاتەوە و رێگە لە شارون بگرێت پلانە خۆکوژییەکانی جێبەجێ بکات، هەروەها دەڵێ ئەگەر لێرەدا حکومەتێکی جیهانیی دادپەروەر هەبوایە، واتە (یو–ئێن)ێکی راستەقینە، ئەوا نەیدەهێشت ئەو هەموو کارەساتانە لە فەلەستیندا روویدات.

لەبەرئەم هۆیە بانگەشە بۆ پێکهێنانی یەکێتی ئەوروپی دەکات کە هەموو هێزی خۆی بخاتە کار، داوا دەکات سوپایەکی بەهێز پێکبهێنرێ سەربەخۆ بێت لە پەیمانی ئەتڵەسی و ئەمریکا، بۆ ئەوەی بچێتە ناو ناوچە گەرمەکانی جیهانەوە لە پێناوی ماف و دادپەروەریدا نەك لە پێناوی هەژموون و دەسەڵات و زوڵم و پشتگیریکردنی ناهەق.

لە هەمان کاتدا داوای پێکهێنانی یو–ئێنێکی تر دەکات تا ببێت بە بەدیلی حکومەتێکی جیهانی و تا ئەوروپاش بڕیارەکانی خۆی جێبەجێ بکات. لەم بۆچوونەدا فەیلەسوفی ئەڵمانی یۆرگن هابرمازیش لایەنگریی دێریدا دەکات. لە واقیعدا ئەم دوانە شوێنهەڵگری هەمان پرۆژەی فەیلەسوفی گەورەی رۆشنگەرین لە خۆرئاوادا، واتە (ئیمانۆئیل کانت). لە راستیدا کانت یەکەم کەس بوو بیری لە ئاشتییەکی هەتا هەتایی کردەوە لە نێوان نەتەوەکاندا بێگومان لە رێگەی پێکهێنانی حکومەتێکی کۆسمۆپۆلیتی بۆ جیهان. بەمجۆرە کانت لانیکەم بە دوو سەد ساڵ پێش نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەنجوومەنی ئاسایش کەوتووە! سەرۆك ویلسۆن کە لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی بانگەشەی بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان (یان: عصبة الامم) کردووە، یەکێ بووە لە قوتابیانی کانت و سەرسام بووە پێی.

لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی هەر لە – عصبة الامم–ەوە نەتەوە یەکگرتووەکان (*UN*) دروست بوو و بارەگای خۆی لە نیویۆرکدا کردەوە. بەمجۆرە دەبینین ئەم پرۆژەیە لە سەرەتادا پتر پرۆژەیەکی یۆتۆپی بووە و بگرە لەسەردەمی کانتدا شتێکی شێتانە بوو، بەڵام لە دوای دوو سەدە لە مەرگی کانت بوو بە راستییەکی بەرچاو. باشە چ شتێك رێگرە لەبەردەم بەدیهێنانی خەونەکانی دێریدا و هابرماز و سەرجەمی ئەو بزاوتانەی لە دژی گلوبالیزمی لیبرالیی نوێن؟ چ شتێك رێگرە

لـــەوەی رۆژێـــك بێـــت بگەینـــە جیهـــانێكی دادپەروەرانەتر، جیهانێك یەك یاسای نێو دەوڵەتی حوكمی بكات و بەسەر هەمووان‌دا پراكتیك بكرێت؟ دەبیٚ كـەمێك ئـەقڵمان فـراوانتر بكـەین چـونكە لـە چـەرخی ئینتـەرنێت و رێگـەكانی تـری نیتـۆرك و تۆڕی زانیارییەكان و پەیوەندییە نوێیەكاندا جیهان بـووە بـە تاكـە گونـدێك. ئەگـەر كەسـێك لـە هـەر ناوچەیەكی جیهاندا دووچاری ئازار و ئیهانە بێت وەك ئـەوە وایـە لـە میـانی ئـەو كەسـەدا سـەرجەمی بەشەرییەت ئیهانە كرابێت.

### سەرچاوە

رۆژنامەی (الشرق الاوسط) 2004/10/15.

# به‌شداریكردن له‌ هه‌ڵبژاردندا

ریچه‌د تۆپف
له‌ ئینگلیزییه‌وه‌: سه‌درالدین عارف

له‌م به‌شه‌دا له‌ ئاراسته‌ی ئه‌نجامه‌كانی هه‌ڵبژاردن له‌ سه‌رانسه‌ری ئه‌وروپای رۆژئاوا له‌ سه‌رده‌می پاش جه‌نگ ده‌كۆڵینه‌وه‌. گریمانه‌ی یه‌كه‌ممان كه‌ له‌ به‌شی یه‌كه‌مدا هاتبوو (بروانه‌ نه‌خشه‌ی ژماره‌ 1.2) پێشبینی ئه‌وه‌ی ده‌كرد كه‌ ئه‌نجامه‌كانی هه‌ڵبژاردن به‌ گشتی به‌ره‌و ئاستێكی نزم ده‌ڕوات. ئێمه‌ به‌ وردی له‌م گریمانه‌یه‌مان كۆڵییه‌وه‌ و باسه‌كه‌مان به‌ گرنگیی هه‌ڵبژاردن له‌و سیسته‌مه‌ دیموكراتییه‌ هه‌ڵبژێردراوانه‌ ده‌ستپێكرد، پاشان چووینه‌ سه‌ر باسی ئه‌و گۆڕانه‌ دیموگرافییانه‌مان كرد كه‌ له‌ چل ساڵی رابوردوودا له‌ وڵاته‌ ئه‌وروپییه‌كاندا هاتوونه‌ته‌ كایه‌وه‌. پاشان چووینه‌ سه‌ر لێكۆڵینه‌وه‌ی ئه‌و په‌یوه‌ندییه‌ی كه‌ له‌ نێوان گۆڕانی دیمۆگرافی ئاسته‌كانی ئه‌نجامی هه‌ڵبژاردنه‌كاندا هه‌یه‌. ئه‌نجامه‌كانی لێكۆڵینه‌وه‌كه‌مان گومانێكی زۆر ده‌خاته‌ سه‌ر ئه‌و گریمانانه‌ی كه‌ هه‌مانبوو له‌ باره‌ی دابه‌زینی ئه‌نجامه‌كانی هه‌ڵبژاردن كه‌ ئه‌و ئاراسته‌ گشتییانه‌ی كه‌ بۆمان ده‌ركه‌وت به‌ هیچ جۆرێك پاڵپشتیی ناكه‌ن. به‌ پێچه‌وانه‌وه‌، ده‌گه‌ینه‌ ئه‌و ئه‌نجامه‌ی كه‌ گۆڕان له‌ ئه‌نجامه‌كانی هه‌ڵبژاردندا، له‌ سه‌رووی هه‌موو شتێكه‌وه‌، به‌ هۆی گۆڕانی دیموگرافیی به‌شدارانی هه‌ڵبژاردنه‌كانه‌وه‌یه‌ له‌ ئه‌وروپای رۆژئاوادا.

## به‌شداریكردنی دیموكراتییانه‌

هه‌ڵبژاردنه‌ نیشتمانییه‌كان هێمایه‌كی به‌هێزی ره‌وایی ده‌وڵه‌ته‌ نه‌ته‌وه‌ییه‌كانه‌، ناردنی چاودێر له‌ لایه‌ن رێكخراوه‌ نێو ده‌وڵه‌تییه‌كانه‌وه‌ بۆ نووسینی راپۆرت له‌ باره‌ی شێوازی هه‌ڵسووڕاندنی ئه‌م جۆره‌ هه‌ڵبژاردنانه‌وه‌ كارێكی ئاساییه‌، به‌ تایبه‌تی بۆ ئه‌و ده‌وڵه‌تانه‌ی كه‌ وا خۆیان پیشانده‌ده‌ن كه‌ رێبازی دیموكراتییان هه‌ڵبژاردووه‌، چونكه‌ ئه‌م جۆره‌ راپۆرتانه‌ بنه‌ما بۆ دانپێدانانی كۆمه‌ڵگای نێو ده‌وڵه‌تی به‌و رژێمانه‌، یان به‌ پێچه‌وانه‌وه‌. هه‌روه‌ها ئاساییه‌ كه‌ ئه‌م جۆره‌ راپۆرتانه‌ ئه‌وه‌ ده‌ربخه‌ن كه‌ پرۆسه‌ی ئه‌م هه‌ڵبژاردنه‌ نیشتمانییه‌

گریمانکراوانە گرتن و کوشتن و جۆرەکانی دیکەی خراپەکارییان تووشبووە یان نا.

ئەم جۆرە ناکۆکییە لە روانگەی دەوڵەتانی ئەورووپای ڕۆژئاواوە، کە ئەم بەشە بایەخی پێدەدات، ئەوەندە بە دوور دادەنرێت کە دەرکی پێناکرێت. ئێمە لە دەریایەکی هێمنی ئارامی سیاسی ئەوتۆدا دەژین کە مەگەر کەمایەتییەك باسی رەوایی ئەندامانی ئەو کۆمەڵگا نێو دەوڵەتییە بکەن، یان باسی ئەوە بکەن کە ئایا هەموو ئەم هەژدە دەوڵەتە ڕژێمی سەقامگیرن یان نا، ئەگەر بەو پێوەرەی کە ئەم چاودێرانە بۆ دنیای فراوانتر[1] بەکاری دەهێنن بڕیار بدەن. بێگومان، ئەمە بەو واتایە نییە کە رەفتاری خراپەکاری هەرگیز لە هەڵبژاردنەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوادا روو نادات، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە خراپەکاری ئەگەر رووشبدات، جۆرەکانیان جیاوازە لەو رووداوانەی کە لە ڕاپۆرتی هەڵبژاردنی ئەو وڵاتانەی جیهاندا بەرچاو دەکەون کە گەشەکردنیان کەمترە. نابێت ئەوەشمان لە بیر بچێت کە گەردوونییەتی ڕژێمە دیموکراتییەکانی ئەورووپا گەشەکردنێکی تازەیە. هەر سی ساڵ لەمەوپێش، کاتێك کە لیپسێت *Lipset* تێزەکەی دانا لە بارەی ئەگەر پەیوەندیی نێوان پرۆسەی مۆدێرنەکردنی کۆمەڵگا و مەرجەکانی سیستەمی دیموکراتی. تەنها نیوەی دەوڵەتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا مەرجەکانی دەوڵەتی دیموکراتیی سەقامگیریان تێدابوو، بە پێی پێناسەکەی ئەو. لیپسێت (1959) دەوڵەتی دیموکراتیی سەقامگیری بەوە پێناسەکرد کە ئەو دەوڵەتانە دەگرێتەوە کە لە شەڕی جیهانیی یەکەمەوە سیستەمێکی سیاسیی دیموکراتییان هەیە و تیایاندا هیچ بزوتنەوەیەکی بەهێزی سیاسی لە بیست و پێنج ساڵی رابوردوودا نەبووە بەربەرەکانی شێوازی بەڕێوەبردنی دیموکراتییانە بکات. بە پێی ئەم پێوەرە، نەمسا و فینلەند و فەرەنسا و یۆنان و ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و ئایسلەند و ئیتالیا و پورتگال و ئیسپانیا هەموویان بە ڕژێمی دیکتاتۆری یان بە دیموکراتییەتی نا سەقامگیر پۆلێنکران.

بێگومان، ئەم شیکردنە ئەزموونگەرییەی لیپسێت لەسەر بناغەی بیرۆکەی باستانیی لیبرالی دیموکراتی ئەو سەردەمە دانرا بوو. لە دیدگای ئەم بیردۆزەیەوە، گرنگترین بەرەنگاری لە رووی سوسیولوجی سیاسی پاش جەنگەوە بڕیاردانە لەسەر گونجاوترین مەرجی ئابووری و کۆمەڵایەتی و دامەزراوەیی بۆ چەسپاندن و فراوانکردنی ئەو کۆمەڵە ڕژێمە دیموکراتییە لیبراڵە فرە باوەڕ (پلووراڵ)یە (*Topf: 1989 b*). لیپسێت داوای ئەوەی کرد کە باشتر وایە سیستەمی لیبرال دیموکرات لە ڕێی پرۆسەی مۆدێرنەکردنی کۆمەڵگاوە بە دەستبێت. هەروەها رای وابوو کە کاریگەریی هاووڵاتییان زیاد دەکات، بە تایبەتی لەگەڵ فراوانکردنی پەروەردەدا (فێرکردندا). لە زاری دیوییەوە، لیپسێت (*1959:5 b*) دەڵێت کە پەروەردە نەك بە تەنها هەستی لێبوردن لە لای خەڵك زیاد دەکات و ناهێڵێت کە پابەندی باوەڕە توندڕەوەکان بن، بەڵکو توانای هەڵبژاردنی ئەقلانی و پابەندبوونیان بە بەها دیموکراتیەکانەوە بەرزتر دەکات.

لە کاتێکدا کە زوربەی لێکۆڵەرەکان کۆکن لەسەر پابەندبوون بە نموونەکانی سیستەم — ئەرکەکان لە کۆمەڵگادا لە بارەی سوودە ڕێکوپێکەکانی بەشداریکردنی ڕاگەیەندراوی سیاسی لە لایەن هەموو هاووڵاتیانەوە، ڕێکەوتنی کەمتر لە نێوانیاندا هەیە لە بارەی ئەوەی کەچی ئاستی نموونەیی بەشداریکردن پێکدەهێنێت. لە

کرۆکی بیرۆکەی دیموکراتییە فرە باوەڕەکەدا ئەو ڕایە هەبوو کە لەناو بەشداریکردنی سیاسیدا، بە تایبەتی لە هەڵبژاردنەکاندا، تاکەکان و ئەو کۆمەڵانەی کە کۆمەڵگای مەدەنی پێکدەهێنن دەبێت توانای ئەوەیان هەبێت کە جیاوازیی بۆچوون دەربڕن لە بارەی سیاسەتە گشتییەکان و بەمەش بۆچوونی جیاوازی خۆیان لە بارەی کۆمەڵگای باش دەربڕن. لە ڕاستیدا، زۆر جار بەشداریکردنی سیاسی وەکو کارێکی کاریگەر سەیرکراوە (بڕوانە *Topf: 1989 b*) و بەشداریکردن لە هەڵبژاردندا شێوەیەکی نموونەییە لەم چالاکییە کاریگەرە.

بەڵام هێشتا وەڵامی ئەو پرسیارە نەدراوەتەوە کەچی ئاستی نموونەیی ئەنجامی هەڵبژاردن لە دەوڵەتە لیبرال دیموکراتەکاندا پێکدەهێنێت. زۆر لێکۆڵەر، بە لیپسێتیشەوە، لەو باوەڕەدان کە هەر کە سیستەمێکی لیبرال دیموکراتی سەقامگیر دامەزرا، ئیتر پێویست ناکات، تەنانەت مەترسیداریشە، کە بە دوای بەرزترین ڕێژەی بەشداریکردندا بگەڕێین. بە پێچەوانەوە، دەتوانین پلەی نزمی بەشداریکردن بە نیشانەی سەقامگیریی سیاسی و پلەی بەرزی بەشداریکردن، لەوانەیە بەنیشانەی ناسەقامگیری و ململانێی کۆمەڵایەتی دابنێین ( *Tingsten 1937: 225; (Lipset 1959: 32; Dittmch and Johansen 1983* لەسەر ئەم بنەمایە، ئالموند و ڤێربا ( *Almond and Verba 1963*)، داکۆکییانکرد لەوەی کە ناویاننا "ئەفسانەی توانستی مرۆڤی شاری (مەدەنی)ە کە بەپێی ئەوە، لە سیستەمی دیموکراتیی سەقامگیردا ئەوەی گرنگە ئەو هاووڵاتییە خاوەن توانا سیاسییانەن کە لەو باوەڕەدان دەتوانن، ئەگەر بیانەوێت، کاریگەرییان هەبێت لە پرۆسەی سیاسیدا، نەك ئەوانەی لە سیاسەتدا چالاکن.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئاشکرایە کە گرژییەکی شیکاریی بۆ ماوەیی هەیە لە نێوان بەشداریی سیاسیدا، بە تایبەتی هەڵبژاردن، کاتێك وەکو زاراوەیەکی بەشداریی کاریگەر پێناسە دەکرێت، لەگەڵ هەڵبژاردندا وەکو ڕووداوگەلێکی هێمایی بە نەریتکراو کە پێناسەی گشتی کۆمەڵگا پتەوتر دەکەن و دووبارەی دەکەنەوە ( *Parsons 1959; Eelelman 1964*). لەم گۆشە نیگایەوە، بەشداریکردن لە هەڵبژاردندا وەکو کارێکی سیمبولی (هێمایی) بیری لێکراوەتەوە کە پشتگیرییەکی گشتی دەداتە سیستەمە سیاسییەکە. بۆ نموونە داڵتن دەڵێت: "دەنگدان چالاکییەکە کە تاکەکان بە سیستەمە سیاسییەکەوە دەبەستێت و ڕەوایییەك دەداتە پرۆسە دیموکراتییەکانی دیکەی. (1988:44). کەواتە، بەشداریی سیمبولی، ئەگەر لە لایەنی ئەقڵییەوە سەیر بکرێت، دەبێت هەموو ئەوانەی هەقی دەنگدانیان هەیە بگرێتەوە.

ئێمە لە بۆچوونە هاوچەرخەکانی شیکردنەوەی بەشداریکردنی سیاسی هاوتەریبییەك لەگەڵ ئەم تەنگژەیەدا دەبینین. لە لایەکەوە ئەو لێکۆڵەرانەی کە لە ڕەفتاری هەڵبژاردن دەکۆڵنەوە، بە تایبەتی ئەوانەی هەوڵی لێکدانەوەی ڕەفتاری لایەنگریی سیاسی دەدەن، ڕاران لە بارەی بەهای ڕێژەیی سوسیولوجی و ژیریی ئەو نموونانەی ڕەفتاری هەڵبژاردن (*Tullock 1997;R.ker and ordeshok 1968; Crepaz 1990*) لە لایەکی دیکەوە، لێکۆڵینەوە لە بوارێکی فراوانتری چالاکی سیاسی لەسەر نەریتی (*Almond*) و (*verba*)، یان (*barnes*) و (*kaase*) و ئەوانی تر (1979)، کە تیایدا مەسەلەی سەرەکی ئەو بەرەنگارییانەن کە ڕووبەڕووی دیموکراتییە پەرلەمانییەکان دەبنەوە

خۆیان لە لێکۆڵینەوەی گەوهەری هەڵبژاردن لادەدەن. بۆ نموونە ئەو هۆیانەی کە ***maesh*** و ***kaase*** (*1979: 86*) لە بارەی "بەشداریی تەقلیدی لە سیاسەتدا.." دایاننا بۆ جیاکردنەوەی دەنگدان، رۆشنایی دەخەنە سەر ئەم مەسەلەیە.

دەنگدان شێوازێکی بێ هاوتای رەفتاری سیاسییە، بەو واتایەی کە بەدەگمەن روودەدات و میکانیزمی بەهێزی ئارەزووەکانی کۆمەڵگا و چاودێری کۆمەڵگا زۆر بەلادا دەبیات و ئەوەی دەیچەسپێنێت جۆرە شالاوێکی نەریتییە کە لە سەرووتەکانی سەمای باران دەچن و لە لایەن دەنگدەرەوە هیچ زانیاری و ئەرکی تری تێناچێت.. لەبەر ئەم ئەنجامانە بڕیارماندا کە دەنگدان نەخەینە نەخشەی بەشدارییە تەقلیدییەکانەوە.

هەر کە ئەم بڕیارە لەوانەیە رەوابێت بۆ گەشەکردنی وێنەی کۆمەڵایەتیی — دەروونی چالاکی سیاسی، بەڵام شیکردنەوەی ئەو نیشانانە دوور دەخاتەوە کە لەوانەیە گۆڕانکاری لە "میکانیزمی ئارەزووەکان و چاودێریکردنی کۆمەڵایەتی" پێشانبدەن کە دەخرێتە پاڵ دەنگدان. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو تێزەی کە دەڵێت لەوانەیە لەگەڵ پرۆسەی مۆدێرنەکردندا گۆڕانی بنەڕەتی لە پرۆسەی دیموکراتیدا بێتە ئاراوە، ئەگەری دەرفەتی لاوازبوونی ئەو میکانیزمە کۆمەڵایەتییە دێتە ئاراوە و لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی لاوازبوونی رەوایی ئەرکەکانی پرۆسەی هەڵبژاردن.

لەم بەشەدا سەرنجدەدەینە ئاستەکانی بەشداریکردن لە هەڵبژاردنە نیشتمانییەکاندا وەکو پێشاندەری پەیوەندیی نێوان فەرهەنگی سیاسیی نەتەوەیی و دەزگا سیاسییەکان. لێرەدا، بایەخ بە ئاستی گشتیی بەشداریکردن دەدەین: واتە بە ئەنجامەکانی دەنگدان نەک بە ئاستی بەشداریکردن.

بە تایبەتی بایەخ بە گۆڕانکارییەکان لە ئاستی بەشداریکردن بە تێپەڕبوونی کات. ئێمە، بۆ ئەو هۆیانەی کە لە خوارەوە باسیاندەکەین، ئەو راستییەی کە هیچ سیستەمێکی سیاسی لە ئەورووپای رۆژئاوادا رووبەڕووی هیچ کێشەیەکی سیستەمی نین بە بەڵگەنەویست دادەنێین، سەرەڕای ئەو جیاوازییەی کە هەیە لە ئاستی ئەنجامەکانی هەڵبژاردندا لە وڵاتە جیاوازەکاندا. واتە ئێمە پەرۆشی راڤەکردن و لێکدانەوەی هەر جۆرە گۆڕانێکین لە ئاستەکانی بەشداریکردن لە هەڵبژاردنە نیشتمانییەکاندا، نەك گەڕان بە دوای هۆیەکان جیاوازی لە ئاستە رەهاکانی هەڵبژاردنی گشتی.

بێگومان بەشداریکردن لە هەڵبژاردنی نیشتمانی بە هیچ جۆرێك تاکە شێوەی بە دامەزراوەکردنی (*institationalized*) پەیوەندیی نێوان هاووڵاتیان و دەوڵەت نییە. هەموو وڵاتە ئەورووپییەکان هەڵبژاردنی خۆماڵی ئەنجامدەدەن، هەندێکیشیان هەڵبژاردنی ناوچەیی (*regional*) ئەنجام دەدەن، زۆریشیان ئێستا بەشداریدەکەن لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئەورووپی. سەرەڕای ئەمەش، زنجیرەیەك کارلێکی نیمچە — دامەزراوەییکراو لەگەڵ سیاسەتمەدارەکان و کۆمەڵە مەدەنییەکاندا کە مارش و کاس وەکو کاری سیاسی پۆلێنیان دەکەن. بەڵام، ئێمە لە رێی ژمارەیەك لێکۆڵینەوەوە دەزانین کە هەڵبژاردنی نیشتمانی لە هەموو ئەم چالاکییانە گشتگیرترە: پەیوەندیکردن ***Contacting*** لە ئەورووپای رۆژئاوادا زۆر باو نییە. (داڵتن 1988، پاری، مۆیزەر و دەی 1992). بڕیاردانمان لەسەر دوورخستنی لێکۆڵینەوەی ئەم شێوانەی بەشداریکردنی سیاسی لەم بەشەو لە بەشەکانی

داهاتوودا بە واتای کەمکردنی گرنگیی پرۆسەی پەیوەندیکردنی دەوڵەت و هاووڵاتی نییە،

زاراوەی "هەڵبژاردنی نیشتمانی" زۆر ئامادەکاری و راهێنانی جیاواز لە خۆ دەگرێت. هەڵبژاردنی نیشتمانی لە ئەوروپای رۆژئاوادا لە دەوڵەتی فیدرالی یەکگرتوودا بەڕێوە دەچێت. ئەم هەڵبژاردنانە یان بۆ هەڵبژاردنی سەرۆک، یان بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی یاسا دانان دەبێت. دەنگدەرەکان، یان رووبەرووی هەڵبژاردنی تاکە کەسی کاندیدکراوی حزبەکان دەبنەوە، یان لیستی حزبەکان. هەڵبژاردنەکە یان لە ماوەیەکی دیاریکراو بە پێی دەستوور دەبێت، یان حکومەت ماوەکە دەستنیشاندەکات. هەرچەند ئێستا ماف دەنگدان بە پێی تەمەن دیاریکراوە، بەڵام هێشتا جیاوازی لە ئارادا هەیە، هەروەها جیاوازی هەیە لەو پێوەرانەی کە هەندێك گرووپ لە هەڵبژاردن بێبەش دەکات، بە تایبەتی پەنا بەرەکان. بە هەمان شێوە، هەر چەند زۆربەی هەڵبژاردنەکانی ئەوروپای رۆژئاوا بە پێی سیستەمی رێژەیی بەڕێوە دەچن، بەڵام شێوازەکانی رێکخستنی هەڵبژاردن جیاوازیی زۆریان هەیە.

لەوانەیە هەندێك لەم جیاوازییانە هۆی ئەو جیاوازییە بن کە لە ئاستی گشتیی ئەنجامەکانی هەڵبژاردندا لە نێوان وڵاتەکاندا بەدیدەکرێت، بەشداریکردنی تەوزیمی لە هەڵبژاردنەکاندا لەوانەیە ببێتە هۆی بەدەستهێنانی ئەنجامی بەرزتر، هەروەها گۆڕانکاری لە ماف بەشداریکردنی هەڵبژاردن و لە رێکخستنی هەڵبژاردندا بە هەمان شێوە کاریگەریی هەیە. بێبەشکردنی ژنان تەنها بیست ساڵێك لەمەوبەر، لە سویسرا و ئیسپانیا و پورتوگالدا، هەروەها سنووردارکردنی ماف دەنگدان هەتا تەمەنی 18 ساڵ لە ساڵانی 1960 هەتا 1970 ئەشێت هۆیەك بێت بۆ ئەو جیاوازییەی کە هەیە لە ئەنجامەکانی دەنگداندا.

جیاوازی لە نێوان دەوڵەتاندا لە بارەی دەزگاکانیان و ئەو ئامادەکارییەی ئەو دەزگایانە دەیکەن لەوانەیە ئاکامی گرنگی هەبێت لەسەر ئەنجامەکانی دەنگدان. بە پێی (لەین) و (ئێرسن) (1995)، تنگستن *Tingsten* (1937) یەکەم کەس بوو کە باوەڕی وا بوو بەشداریکردنی تەوزیمی کاریگەریی دەبێت لەسەر رەفتاری دەنگدان. (کەمپبیل) و ئەوانی تر (1960) پێداچوونەوەیەکیان ئەنجامدا لەسەر ئەو گریمانەیەی کە دەیگوت: لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، ئەو تەگەرانەی کە بە هۆی پێداچوونەوەوە هەبوون لە بەردەم تۆمارکردندا لەوانەیە هۆی دەنگنەدان بن. لە هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لە بارەی کەمی ژمارەی دەنگدەران لە ئەمریکادا ئەنجامدراون ئەم بۆچوونە دووبارە دەبێتەوە.

(*Kelley, Ayres, and Brown 1967; Powell 1986*) ماوەیەك بەر لە ئێستا لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆر و هەمەلایەنە ئەنجامدرا بۆ هەڵسەنگاندنی فاکتەری دەزگاکان لە کاتی بەراوردکردنی رەفتاری دەنگداندا، هەروەها بۆ بەراوردکردنی گرنگی رێژەیی فاکتەرەکان لەسەر ئاستی دەزگاکان و تاکە کەسەکاندا. (*Bartolini and Mair 1990; Dittrich and Johanson 1983; Flickinger and Studlar 1992; Jackman 1987; Lone and Ersson 1990; pedersen 1983; powell 1980, 1986*)

لەم نوسراوانەدا بۆچوونی جۆراوجۆر هەیە. هەندێك لێکۆڵەر لەگەڵ ئەو بابەتانەن کە (تنگستن) و (کامپێل) خستبوویانە روو (*Powell*

1980)، هەندێکی دیکەیان جەخت لەسەر پەیوەندیی نێوان سیستەمی حیزبی و هەڵگەڕانەوەی دەنگدەران دەکەن.

ئێمە لەم بەشەدا مەبەستمان ئەوە نییە کە بەوردی لەم جیاوازییانە بکۆڵینەوە، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە ئاستە جیاوازەکانی ئەنجامی هەڵبژاردن لە وڵاتە جیاوازەکاندا راڤە بکەین، واتە مەبەستمان ئاراستەی درێژیی (*longitudinal*) ئەنجامەکانی هەڵبژاردنە (بەراوردی *crewe 1985* *Flickinger and studlar 1992* بکە) (کروو) گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە ئەنجامەکانی هەڵبژاردن لە وڵاتە لیبرال دیموکراتەکاندا لە نێوان سالانی 1940 هەتا 1970 زۆر سەقامگیر بووە. بەلام لێکۆڵینەوەی نوێتر ئەوە دەردەخات کە ئەنجامەکانی دەنگدان لە دابەزیندان، هەندێکیش لایان وایە (*Martikainen and Xjonen 1991*) کە ئەم دابەزینە ئەوەندە کەمە کەمایەی نیگەرانی نییە. ئێستا دێینە سەر تاقیکردنەوەی داتاکان.

## داینامیکییەتی گۆڕانی دیمۆگرافی

زۆر ئاساییە کە لە نووسینەکاندا جیاوازی ببینین لە نێوان ئاستی فراوانی گشتی و ئاستی بچووکی تاکە کەسیدا لەمەڕ بەشداریکردنی هەڵبژاردنەکان. (*Weber 1949; Lane and Ersson 1990*) رەچاوکردنی ئاستی فراوان بە زۆری لە بارەی گۆڕاوە سیۆ – ئابوورییەوە دەبێت. جیاوازیی و گۆڕانی پێکهاتەی دیموگرافی وڵاتەکان هەمان گرنگیی هەیە بۆ راڤەکردنی بەشداریکردنی گشتی لە هەڵبژاردنەکاندا. بێگومان ئەمە لە ئەوروپای رۆژئاوادا زۆر راستە.

ئێمە لەم بەشەدا بایەخ بەشیکردنەوەی ئەو گۆڕانە بەراووردکارییانەی رێژەی سەدیی دەنگدان و رێژەی (*ratio*)، دەنگدانی ئەو کەسانەی کە مافی دەنگدانیان دەدەین ژمارەی گشتیی دیموگرافیای دانیشتوان لە گۆڕاندایە و بەردەوام لە گۆڕاندا دەبێت کە وا دەکات ئەم شێوازەی ئێمە لە کۆکردنەوەی داتا بە شێوازی رێژەی گشتی و رێژەی سەدی ئەو گۆڕانکارییانە هەتا رادەیەك دابپۆشن. بۆ نموونە، ئەو ئامارەی واپیشاندەدات کە ئەنجامەکانی هەڵبژاردنەکانی ئەوروپای رۆژئاوا لە نێوان سالانی 1950 و 1990 لە سەدا (4) خاڵ دابەزیوە، ئەو ئامارە دادەپۆشێت ژمارەی گشتیی دانیشتوان لە هەمان ماوەدا لە سەدا (22) زیادی کردووە و ژمارەی ئەوانەی کە مافی دەنگدانیان هەیە لە 143 ملیۆنەوە بۆ 263 بەرزبۆتەوە. بۆ ئەوەی واتای بەشداریکردن لە قەوارەی خۆیدا دابنێین، ئەرکی سەرشانمانە کە بیر لە داینامیکیەتی ئەو گۆڕانە دیموگرافییانەی ئەوروپای رۆژئاوا بکەینەوە. لە پێشدا لە گۆڕانی گشتیی دانیشتوان دەکۆڵینەوە، ئینجا گۆڕان لە تەمەن، رەگەز و ئاستی خوێندن.

## گۆڕانی دانیشتوان

ژمارەی گشتیی دانیشتوان لە وڵاتانی ئەوروپای رۆژئاوا لە پەنجا ساڵی رابوردوودا گەشەیکردووە. لە هەندێك حاڵەتدا ئەم گەشەکردنە زۆرە. بۆ نموونە، ژمارەی دانیشتوانی فەرەنسا لە سالانی (1940)ەوە هەتا ساڵی 1990 (15) ملیۆن زیادی کردووە کە دەکاتە لە سەدا 36 لەسەر بنەمای ساڵی 1940 رێژەی گۆڕانەکەش گرنگە. ئەم رێژەیە لە خشتەکانی ($2.1\,a - 2.1c$)[2]دا دەردەکەوێت کە لە دەوروبەری سالانی 1970 روویدا و پێی دەوترێت لوتکەی گەشەکردنی منداڵبوون لە وڵاتە زۆر پێشکەوتووەکاندا، وەکو

بریتانیا و ئیتالیا و ولاّتە ئەسكەندەناڤیەكان، لە سالآنی (1990)ەكان ڕێژەی منداڵبوون دابەزی ئەو ولآتانەی كە كەمتر گەشەكردوون، وەكو یۆنان و ئێرلەندە، دەساڵ دوای ئەوان هەمان شێوەی گەشەكردنی منداڵبوونیان بینی و لە ساڵی 1980 گەیشتنە لوتكەی زیادبوونی دانیشتوان. لە ساڵی 2000دا، ڕێژەی زیادكردنی دانیشتوان لە ولآتە ئەسكەندەناڤیەكاندا سفر بوو، بەلآم لە ولآتەكانی دیكەی ڕۆژئاوای ئەوروپادا زیادكردنی دانیشتوان بەڕێژەی 2–3 لە سەدا بەردەوامبوو، بێجگە لە ئێرلەندە كە ڕێژەی زیادكردنی دانیشتوان لە دەوروبەری لە سەدا (10)یەو هەر لە زیادكردندایە (*Simons 1992: 50 ff; United Nations 1989*).

بە هەر حاڵ، مەبەستی ئێستامان ئەو كەسانەن كە گەورەن و ماف دەنگدانیان هەیە. گەشەكردنی بەرچاو لەو كۆمەڵە خەڵكەدایە كە لە ساڵانی 1970 لە دایكبوون. بەلآم بونیادی دانیشتوانی ئەوروپای ڕۆژئاوا بەشێوەیەكی زۆر بنەڕەتی دەگۆڕێت. لە قۆناغی پاش شەڕی جیهانی، بە تایبەتی لە (1970)ەوە، ڕێژەی كە لە 1950دا (68) ساڵ بوو، لە (1990)ەكاندا گەیشتە (78) ساڵ. لە هەمان كاتدا سەرجەمی ڕێژەی مندالآن، لەگەڵ كۆنترۆڵكردنی كێشەی مردنی كۆرپەكاندا، كە لە ناوەڕاستی (1960)ەكاندا (2.8) بوو لە سالآنی (1990)ەكاندا دابەزی بۆ (1.7)، ئەمەش لە خوار ئەو ڕێژەی (2.1)ەوەیە كە پێویستە بۆ جێگرتنەوەی دانیشتوان. لە ڕاستیدا بە تەنها لە ئێرلەندەدا ڕێژەی منداڵبوون پۆزەتیڤە و وا چاوەڕواندەكرێت كە ڕێژەی نێگەتیڤی منداڵبوون لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا بۆ چەند نەوەیەكی داهاتوو بەردەوامبێت ئەمەش بەو واتایەیە كە ئەو ژمارانەی لە بارەی ڕێژەی گشتیی دانیشتوانانەوە هەن كاریگەرییەكی تێكەڵ دادەپۆشن. پێش هەموو شتێك ژمارەیەكی زۆری دانیشتوانی ئەوروپای ڕۆژئاوا مرۆڤگەلێكن كە تەمەنێكی زۆر ژیاون" دووهەم، لە هەمان كاتدا ڕێژەی دابەزین لە منداڵبووندا لەوە زیاترە كە خشتەكان دەریدەخەن. بە زاراوەیەكی سادەتر ساڵی 2000 لەگەڵ ساڵی 1950دا بەراورد بكەین، ڕێژەی دەنگدەران نیواونیو كەمیكردووە، لە كاتێكدا كە ڕێژەی ئەوانەی كە لە سەرووی تەمەنی خانەنشینییەوەن دوو ئەوەندە زیادیكردووە. (*United Nations 1989*)

بەمجۆرە، قەوارەی گشتی دەنگدەران لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا دوو ئەوەندە لە ماوەی پاش شەڕی جیهانیی دووەمەوە. سەرەرای ئەوەش، ئەگەر ئەنجامی هەڵبژاردن پەیوەندیی بە تەمەنەوە هەبێت، كەواتە ئەو ئامارانەی وا دەردەخەن كە هەمان ڕێژە لە گەنج و لە پیر بەشداریی هەڵبژاردن دەكەن لە ڕاستیدا زیادبوونی خێرای ژمارەی ئەو پیرانەی كە دەچن بۆ بنكەكانی دەنگدان دادەپۆشن.

یەكسەر لە دوای شەڕی جیهانیدا لادانێك لە ژمارەی دانیشتواندا ڕوویدا بۆ بەرژەوەندیی ژنان. لەم لادانەدا، لە ئوسترالیادا ژمارەی ژنان لە سەدا 14 لە پیاوان زیاتر بوون، هەتا دەگاتە لەسەدا (1.5) ژن زیاتر لە دانیماركدا. لە ئێرلەندە نەبێت كە ڕێژەی نێر لە سەدا (2) زیاتر بوو. فاكتەری هەرە گرنگی ئەم لادانە تەمەندرێژیی ژنان و كاریگەریی شەڕی جیهانیی دووەم بوو لە دانیشتوانی نێری زۆر لەو ولآتانەدا.

بە هەر حاڵ ئاراستەی گشتی لەم چل ساڵەی دواییەدا بەرەو نزیكبوونەوەی ڕێژەی هەردوو ڕەگەز دەچێت، وا چاوەڕواندەكرێت كە ئەم جیاوازییە لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا جێگیر ببێت و ڕێژەی زیادكردنی ژنان بەرەو 2–3 لەسەدا

بچێت. بەڵام لە نێو دانیشتوانە بە تەمەنەكاندا هێشتا ژمارەی ژنان زیاترە بە هۆی تەمەندرێژییانەوە.

گۆڕانی چەندێتی لە دیموگرافیای پەروەردەدا قورسترە. لە سیستەمی خوێندنی تەوزیمی و خوێندنی باڵادا وڵاتە جیاوازەكانی ئەوروپای رۆژ جیاوازییەكی زۆریان هەیە و ئەو سیستەمە گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە لە تەمەنی دانیشتوانی ئێستادا. بە گشتی، پەروەردە بەو ئاراستەیە دەچێت كە ماوەی خوێندنی تەوزیمی درێژتر بكرێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازی هەیە لەو تەمەنەی كە منداڵ لە قوتابخانە وەردەگیرێت لە نێوان (5) ساڵییەوە لە بریتانیاو نەزەرلاند تا دەگاتە (7) ساڵان لە دانیمارك و ئەڵمانیادا. هەروەها تەمەنی بەجێهێشتنی قوتابخانە دەگۆڕێت لە 14 ساڵییەوە لە ئێرلەندەو پورتگال و ئیسپانیا بۆ 18 ساڵی لە بەلجیكاو ئەڵمانیا. هەروەها ئەو تەمەنەی كە تیایدا یەكەم بڕوانامەی زانكۆیی وەردەگیرێت جیاوازی هەیە و لە نێوان تەمەنی 21 ساڵی هەتا تەمەنی 24 ساڵییە ( *OFCD 1992; Chisholn 1992*) كەواتە بەراوردكردنی خوێندنی تەواو یان تەمەنی بەجێهێشتنی قوتابخانە كەموكوڕی تێدایە. كێشەكەش، ئەگەر بەراووردی خوێندن لە چەند دەیەیەكدا بكەین، گەورەتر دەبێت.

لەوانەیە ئەلتەرنەتیڤی باشتر ئەوە بێت كە بەراوردی جۆری پەروەردەكە بكەین، یان ئەو دەزگا پەروەردەییانەی كە خەڵكەكە بۆی چوون، یان ئەو بڕوانامانەی كە بەدەستیانهێناوە. بەداخەوە ئەم جۆرە نیشاندەرانەش باشتر نین بۆ دامەزراندنی پۆلێنكردنێكی بەراوردكار: دامەزراوە پەروەردەییەكان و ئەو بڕوانامانەی كە دەیبەخشن گۆڕانی زۆری تێدەكرێت و جیاوازی هەیە لە نێوان سیستەمە پەروەردەییەكاندا. شێوازی كۆكردنەوەی زۆربەی داتاكانی پەروەردە ئەم دژوارییە ئاڵۆزتر دەكات و ناهێڵێت بەشێوەیەكی باوەڕپێكراو لە تاكە خاڵێكەوە دەستپێبكەین و لەوێشەوە بۆ كۆمەڵەی گەورەتر و ئینجا بەرەو كێشانی وێنەی پەروەردە لە نێو دانیشتوانی ئەوروپای رۆژئاوا بە گشتی بڕۆین. ئێستا دەبێت ئاوڕێك لە هەڵسەنگاندنی ئاستەكانی پەروەردە بدەینەوە.

لەم بەشەدا و لە بەشی دوای ئەودا هەوڵدەدەین ئەم كێشەیە لە ڕێگەی هەڵبژاردنی شێوازی پۆلێنكردنی پراگماتیی سێلایەنەی ئاستەكانی پەروەردە و هەڵبژاردنی گونجاوترین داتا بۆ ئەو كاتەو ئەو وڵاتەی كە مەبەستمانە جێبەجێیبكەین. سێ پۆل یان سێ ئاستمان داناوە بۆ پەروەردە: "زۆر كەم"، "مامناوەندی" و "بەرز". بۆ ئەم پۆلێنكردنە پێویستیمان بە داتا هەیە لە بارەی ئەو ساڵانەی كە خوێندنی تەواوی تێدا دەكرێت، تەمەنی ئەو كەسەی كە دەوامی تەواو دەكات, یان بەرزترین بڕوانامەی خوێندن كە بە دەستیهێناوە. ئەم داتایە بەراورد دەكرێت لەگەڵ سەرچاوە دیموگرافییە گشتییەكان، ئەگەر هەبوون، ئەگەر نا، ئەوا بە تەنها پشتدەبەستین بەو داتایەی كە لە پشكنینێكی خێرادا بە دەستمان دەكەوێت.

بێگومان، ئەم جۆرە داتایە دەستنادات بۆ پیشاندانی گرنگیی پەروەردە بۆ هەموو نەتەوە و لە ماوەیەكی درێژدا — لە فەرهەنگی سیاسی و لە بەشداریكردندا.

ئەم سێ پۆلە لەوە كرچ و كاڵترە، بۆ نموونە، كە بەراوردێكی گشتیی بەهاو چالاكییەكانی ئەوانە بكات كە بڕوانامەی بەرزیان هەیە. ئێمە لێرەدا

هەوڵی ئەوە نادەین. ئەم پۆلێنکردنە بۆ ئەوەیە کە ڕێژەی ئەوانەی پلەی باڵای خوێندنیان بڕیوە پیشانبدەین بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی کە کەمترین پلەی خوێندنیان بڕیوە، هەر جارە لە نموونەیەکی دانیشتواندا و لە کاتێکی دیاریکراودا. ئەم ڕێژەیە لە کاتی بەراوردکردنی هاوڕێژەی ئەوانەی خوێندنی باڵایان بڕیوە لەگەڵ ئەوانەی کەمترین پلەی خوێندنیان هەیە زیاد دەکات. بەمجۆرە ئەگەر بۆ نموونە ئەو داتایەی بریتانیا بژمێرین لەمەڕ ئەوانەی کە بڕوانامەیان هەیە بەرامبەر ئەوانەی کە هیچ بڕوانامەیەکیان نییە ژمارەکان بەمجۆرە دەبن: (0.01) لە ساڵی 1959، (0.14) لە ساڵی 1971، ئینجا لە ساڵەکانی هەشتاکاندا بەرز دەبێتەوە بۆ (0.29).

لە خشتەی (2.20) و (2.26) ئەم ڕێژەیەیان وەکو نموونە دانا بۆ دانیشتوانی وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا لە بیست ساڵی ڕابوردوودا[5]. ئەمە ئەو ماوەیەیە کە تیایدا پەروەردەی پاش جەنگی جیهانی گەشەکردنێکی بەرچاوی لە پەروەردەی گەورەکاندا کرد. هەرچەند، بێگومان، گۆڕانکارییەکە لە بواری پەروەردەی دانیشتواندا بە گشتی خاو بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، ژمارەکان جیاوازییەك پیشاندەدەن لە گەشەکردنی پەروەردەدا لە هەندێك وڵاتدا وەکو دانیمارك و نەزەرلاند و بەلجیکا کە لە نیوەی زیاتر دەچێت بۆ خوێندنی باڵا، لەگەڵ یۆنان و ئێرلەندە و بریتانیادا کە هێشتا کەمتر لە چواریەکی دانیشتوان بەم کارە هەڵدەستن (*OECD 1992*).

## کاریگەریی گۆڕانی دیموگرافی

ئاشکرایە کە ئەوروپای ڕۆژئاوا بە پرۆسەیەکی گەورەی گۆڕانی دیموگرافیدا تێدەپەڕێت. ڕێژەی گشتیی گەشەکردنی دانیشتوان لە سەرەتای سەدەی داهاتوودا بەرەو (سفر) دەچێت. لە هەمان کاتدا وێنەی دانیشتوان دەگۆڕێت بە ڕێژەی نیگەتیڤی منداڵبوون و زۆربوونی تەمەندرێژی و گۆڕانی ڕێژەی ژن و پیاو بەهۆی تەمەندرێژیی ژنانەوە. لە ئەنجامدا ڕێژەی تەمەندرێژەکان لە بەرامبەر دانیشتوانە گەنجەکاندا زۆر دەبێت و دەگاتە ڕێژەی (2:11) و لە ساڵانی (1990)ەکاندا لە وڵاتە زۆر پێشکەوتووەکاندا لەمەش زیاتر بوو. هەروەها وێنەی پەروەردەش گۆڕا، بەڵام بەشێوەیەکی جیاوازتر لە تەمەن و ڕەگەز، بە هۆی سیاسەتە جیاوازەکانی پەروەردە. هەندێك وڵات، وەکو بریتانیا، لە گەشەکردنی ئابووریدا بەرزترە، بەڵام هێشتا لەگەڵ ئێرلەندە و ئیسپانیادا پۆلێن دەکرێت لە لایەن ڕێژەی ئەو کەسانەوە کە بۆ خوێندنی باڵا دەچن. لەگەڵ ئەوەشدا ڕێژەی ئەوانەی بۆ خوێندنی باڵا دەچن لە ئەوروپا بە گشتی لە زیادکردنێکی خێرادایە، سەرەڕای جیاوازی لە دەستپێکردنی خوێندندا، هەروەها ڕێژەی ئەوانەی کە خوێندنی کەمیان هەیە بە خێرایی بەرەو کەمکردن دەچێت.

گۆڕانە دیموگرافییەکان ئەنجامی گرنگیان لە شیکردنەوەی بەشداریکردنی سیاسیدا وەکو لە خوارەوە بۆمان دەردەکەوێت، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ هەیە لە نێوان تەمەن و دەنگداندا. (*crewe, Fox and All 1977; Datton 1988; Parry, Moyser and Day 1992; Verb and Nie 1972*).

بەلایەنی کەمەوە، بە بەرەوپێشەوەچوونی تەمەن ئەگەری بەشداریکردن لە دەنگداندا زیاد دەکات. کەواتە گۆڕانی دیموگرافی دەبێتە هۆی زۆربوونی گشتیی ئەوانەی کە لەوانەیە دەنگبدەن. گۆڕان لە ئاستی خوێندندا هەمان کاریگەریی هەیە.

هەر لە کۆنیشەوە ئەو باوەڕە هەیە کە دەنگدان پەیوەندیی نزیکی هەیە لەگەڵ ئاستی ڕۆشنبیریدا. کەواتە، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە تەمەن و ڕۆشنبیری کاریگەریی پێکهاتەییان هەیە.

لەبەشی سێهەمدا، کاتێک کە دێینە سەر جۆرەکانی بەشداریکردنی سیاسی، بۆمان دەردەکەوێت کە گۆڕانی دیموگرافی کاریگەریی ئاڵۆزتری هەیە. زۆر شیکردنەوە (Beer 1982;Crozier, Huntington and watanuki; 1975; Dalton 1988; Dalton and Kuchler 1990) باسی ئەوەیانکردووە کە کارە سیاسییە راستەوخۆکان، وەکو بەشداریکردن لە ڕێپێوانی ناڕەزایی دەربڕین، بە زۆری جۆرە چالاکییەکە کە گەنجان و ڕۆشنبیران پێی هەڵدەستن. بەهەر حاڵ، ئاراستەی دیموگرافیی گشتی بەرەو دانیشتوانێکی ڕۆشنبیرتر دەچێت. بەڵام، بەرەبەرە ڕێژەی گەنجان لە بەرامبەر پیراندا کەمتر دەبێتەوە. ئەم ئاراستانە، لەوانەیە کاریگەریی پێچەوانەی لەسەر بەشداریکردنی سیاسیدا هەبێت، کە لە بەشی داهاتوودا لێی دەکۆڵینەوە.

### ئاراستەکانی هەڵبژاردن لە پاش شەڕی جیهانیدا:

پێشتر تێبینی ئەوەمانکرد کە هەمیشە جیاوازییەکی بەرچاو هەیە لە ئەنجامەکانی هەڵبژاردن لە وڵاتە جیاوازەکاندا. بۆ نموونە، لە هەشتاکاندا ڕێژەی ئەو دانیشتوانانەی کە مافی دەنگدانیان هەبوو لە سویسرا لە سەدا 47 بوو بەرامبەر لە سەدا 94 لە بەلجیکادا. ئەنجامی گشتی دەنگدەران لە سەرجەم هەژدە وڵاتەکەی ئەورووپای ڕۆژئاوادا لەسەدا 80 بوو[6]. لە لێکۆڵینەوەکاندا پێشنیازی ئەوەش کرا کە بەراوردکردنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی وڵات بە وڵات زۆر بەسوود نییە بۆ لێکۆڵینەوەی داینامیکیەتی بەشداریکردنی هەڵبژاردنەکان. بەڵام بەراوردکردنی ئەنجامەکانی هەموو وڵاتێک گرنگە بۆ هەندێک مەبەست. ئەوەی گرنگە لەم شیکردنەوەیەدا ئاراستەکانی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان لە وڵاتە جیاوازەکاندا بە تێپەڕبوونی کات. ئەگەر داتاکان بەم شێوەیە پێشکەش بکرێن، دەتوانین ڕێژەی گۆڕانەکان لێکبدەینەوە، ئەگەر هەبێت، لە بەشداریکردندا لە ڕێی بەکارهێنانی پێوەرێکی بەراوردکردنی گەردونیدا وەکو بناغەیەک بۆ پێوانی ئاراستەکانی ئەنجامی هەڵبژاردن لە سەردەمی پاش جەنگی جیهانی، بۆ ئەم مەبەستە ئەنجامە گشتیەکانی هەڵبژاردنمان ژمارد لە هەموو هەڵبژاردنەکاندا لە ساڵی (1945)ەوە[7]. لەبەر ئەوەی هەڵبژاردنە نیشتمانییەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا لە کاتی جیاوازدا ئەنجامدران، ماوەی پێنج ساڵمان هەڵبژارد وەکو ئامێرێک بۆ نمایشکردن. پاشان ئەو جیاوازییانەمان ژمارد لە ئەنجامەکانی هەڵبژاردندا کە لە ماوەی پێنج ساڵدا ڕوویانداوە. ئەگەر زیاتر لە هەڵبژاردنێک ئەنجامدرابوو ڕێژەی (Average) ئەو ژمارانەمان ژمارد کە لە پاش جەنگدا بەدەستهاتبوون. (بڕوانە ;Bartolini and Mair 1990 Flickinger and studlar 1992) ئەم تەکنیکە ماوەمان دەدات کە پرسیاری ئاستی تێکڕای ئەنجامەکانی هەڵبژاردن لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا بدەین.

ئەگەر سەیری هەر هەژدە وڵاتەکە بکەین، بەو سێ دەوڵەتەی باشووریشەوە، کە لە ساڵی (1945)ەوە هەڵبژاردنیان ئەنجامنەداوە، تێکڕای (معدل) پاش شەڕی جیهانی دەگاتە لەسەدا 83. بەرامبەر بەم تێکڕای گشتیە، لە پێنج ساڵی ڕابوردوودا کە لە هەموو وڵاتەکاندا هەڵبژاردن کرا، واتا ساڵانی 9–1985، تێکڕای ئەنجامەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا لە سەدا (80) بوو، کە لە هەموو

پێنج ساڵەكانی پێشوو نزمترە. بەرزترین تێكڕای پێنج ساڵەكان لە 5–1960 دابوو كە گەیشتە لەسەدا (85). بەم جۆرە، وەكو نەخشەی 2.3 پیشانیدەدات، جۆرە دابەزینێك لە ئەنجامەكانی هەڵبژاردندا لەم دواییەدا هەبووە، ئەگەر بەراوردی بكەین لەگەڵ تێكڕای پاش ساڵی 1945. بەڵام لەڕاستیدا، كەمكردنی 3 خاڵ گۆڕانێكی زۆر نییە. نابێت گۆڕانە دیموگرافییەكانی ئەم ولاَتانەمان لە چل ساڵی رابوردوودا لەبیر بچێت، لەبەرئەوە كەمكردنی 3 خاڵ لە تێكڕای 83 لەسەدا سەقامگیرییەكی بەرچاو دەردەخات لە ئەنجامەكان لە ماوەی پاش شەڕی جیهانیدا. دەبێت ئەوەش بزانین كە پێوانەی گشتی جیاوازیی ئەنجامەكانی هەڵبژاردن لە هەریەك لەم ولاَتانەدا دادەپۆشێت. نەخشەكانی *2.4 a-2.5c* ئەم جیاوازییانەمان پیشاندا لە ئاستی تێكڕای ئەنجامەكان هەریەك لە ولاَتانی باكوور و ناوەڕاست و باشووری ئەوروپادا.

كەواتە ئەمە سەلمێنەری پێشبینییەكانمانە سەبارەت بە جیاوازیی گەورەتر لەسەر ئاستی گشتیدا. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر سویسرا و ئەو ولاَتانەی كە تازە بوون بە دیموكراتی دەربكەین، جیاوازییەكان لە كەمتر لە سەدا (3)ەوە دەگۆڕێت بۆ كەمتر لە (8) خاڵ لە سەدا.

ئەگەر سەیری ئاراستەكان لەمەودایەكی كەمتردا بكەین، نەخشەكان ئەوەمان پیشاندەدەن كە لە هیچ لەم ناوچانەدا شێوازێكی نەگۆڕی جیاوازیی نەبووە لە ئەنجامە گشتییەكانی هەڵبژاردندا. لە هەندێك ولاَت لە هەریەك لەم كۆمەڵە ولاَتانەدا دابەزینێكی زۆر هەیە لە تێكڕای دەنگەكاندا لە دەساڵی رابوردوودا. لە كۆمەڵەی ولاَتانی باكوور ئەم دابەزینە لە فینلەند روودەدات كە لە ساڵەكانی 1970دا دابەزینێكی سەرەكی روویدا. (بڕوانە *Mortikainen and Yjonen 1991*). لە ناوچەی ناوەڕاستدا ئەم دابەزینە لە سویسرا و هەتاڕادەیەكی كەمتر لە ئەڵمانیای رۆژئاوادا روویدا. هەروەها لەو ولاَتانەش – ئەگەر داتاكان واتا بەخش بن – كە تازە بوون بە دیموكراتی، وەكو ئیسپانیا و پورتگال. گرنگیشە، ئەگەر حاڵەتی ئیسپانیا و پورتگال و سویسرا بە هەلاوێردوو بژمێرین و دەریانبكەین، كە تێبینی ئەوە بكەین كە لە دە ساڵی رابوردوودا.

ڕێژەی دەنگدان لە پانزە ولاَتەكەی دیكەدا بە یەكسانی دابەش دەبێت لە نێوان ئەو ولاَتانەی كە دواكەوتوون و ئەوانەی كە سەقامگیر و لە حاڵەتی گەشەكردندان.

ئەمەش ئەوە دەردەخات كە ڕێژەی گشتیی بەشداریكردن لە هەموو ئەوروپای رۆژئاوادا بەرەو دابەزین ناچێت. ئەمەش زۆر راستە ئەگەر ئەوروپا بەپێی ناوچە پۆلێن بكەین یان گوێرەی پێوەرەكانی مۆدێرنكردن.

بۆ نموونە، لەناو ولاَتە زۆر پێشكەوتووەكاندا لە سوید و ئەڵمانیادا ئاراستەكە تۆزێك بەرەو خوارەوە دەچێت، بەڵام لە بریتانیادا بەرەو سەرەوە دەچێت.

## دەنگدان و تەمەن

بێگومان، سەقامگیری لە ئەنجامەكانی هەڵبژاردن لە پاش جەنگی جیهانی لەوانەیە هەندێك ئاراستە بشارێتەوە كە هێشتا روون نین. ئەم ئاراستانە لەوانەیە لە ئەنجامی گۆڕانی دیموگرافیی گشتی دانیشتوانی ئەو ولاَتانەوە كە باسمانكردن هاتبێت. بۆ نموونە لەوانەیە پەیوەندییەكی بەهێز لە نێوان بەشداریكردنی هەڵبژاردن و تەمەندا هەبێت. لەبەر هەر هۆیەك بێت، گەنجان لە پیرەكان

کەمتر بەشداریی دەنگدان دەکەن. ئەم پەیوەندییەش بـە ئاراسـتەیەکی راسـت دەڕوات، واتـە مـرۆڤ چەند پیرتر بوو ئەگەری بەشداریکردنی دەنگدانی زیاتر دەبێت.

کەواتـە، ئەگـەر ڕێـژەی کۆمـەڵی پـیران لـە بەرامبـەر گەنجانـدا زیـاد بکـات، دەبێـت چاوەڕوانبکرێت کە ئەنجامی گشتی دەنگدەران زیاد بکات، لەگەڵ ئەوەشدا، وەکو لە پێشەوە بینیمان، تیـوری مـودێرنکردنی کۆمـەڵگا پێشـبینی ئەگـەری جـۆرە گـۆڕانێکی جیـاواز لـە رەفتـاری سیاسـیدا دەکـات. ئـەم تێـزە پێشـنیازی ئـەوە دەکـات کـە لـە کۆمەڵگای پیشەسازیی زۆر پێشکەوتوودا، شێوازی تـازەی سیاسـی نـەك هـەر لەوانەیـە بخرێتـە سـەر جـۆری بەشـداریکردنی سیاسـی، بـەڵکو لەوانەیـە ببێتـە جێگـری کەناڵـە دامـەزراوەیی کراوەکـانی سیاسی، وەکو پارتە سیاسییەکان. ئەو فاکتەرانەی کە ئەم جۆرە فەرهەنگە دروستدەکەن و دەیپارێزن ئەگـەر، لـە ئـەنجامی گـۆڕانی نەوەکانـدا، لـەناو کۆمەڵگادا بڵاوببێتەوە، بە تێپەڕبوونی کات رادەی بەشداریکردنی هەڵبژاردن کەم دەبێتەوە بۆ ئەوەی بنەمایەك بۆ تاقیکردنەوەی وردی ئەم تێزە دابنێین، لە بەشەکانی داهاتوودا، زۆر گرنگە ئەوە بسەلمێنین کـە پێکهاتـەی سۆسـیۆ – دیمـوگرافیی دەنگـدەرانی ئـەورووپای رۆژئـاوا لـە گۆڕاندایـە. بـۆ ئـەم مەبەسـتە ئێمە پشت بە داتای هەڵسەنگاندن دەبەستین، نەك راپۆرتە چاپکراوەکانی هەڵبژاردن بەڵکو زیاتر بایەخ بەو گۆڕانە دەدەین کە لە ئەنجامی تێپەڕبوونی کاتدا روودەدەن، نـەك ئـەو گۆڕانـەی کـە لەولاتێکـدا روودەدات چـونکە لەوانەیـە ئـەو جیاوازییانـە لـە ماوەیـەکی درێـژدا نـەگۆڕێن، یەکـەی پێوەرمـان، دیسـانەوە، ڕێژەیـە. بـەڵام ئـەمجارەیان رێـژەی ئـەو گەنجانەی کە لە کاتێکی دیاریکراودا دەنگیانداوە، بەرامبەر ئەو پیرانەی لەو ماوەیەدا دەنگیانداوە. بە تایبەتیش ڕێژەی ئەوانەی کە لە نێوان تەمەنی 20–30 سـاڵدان، بەرامبـەر بەوانـەی کـە لـە تەمـەنی 50 ساڵ یان زیاترن[8]. هەتا بۆمان بلوێت، ئەم داتایـەی کـە لێـرەدا سـوودی لێـوەردەگرین لـەو هەڵسـەنگاندنانەی کـە لـە پـاش هەڵبژاردنەکانـدا ئەنجامـدراون. ئەگـەر بـە دەسـتمان نەکـەوتن، پـەنا دەبـەین بـۆ داتـای ئـەو هەڵسـەنگاندنە بـەراوردکارە گشـتییانەوە کـە لـەو ماوەیـەدا وەرگـیراون. ئـەم جـۆرەی دووەم، بـە زۆری، پێچەوانەی لە دوای هەڵبژاردنەکاندا وەرنەگیراون.

لـە خشـتەی 2.1ەوە بۆمـان دەردەکـەوێت کـە ئەگەر تێکڕای هەڵسەنگاندنی داتاکان بەکاربهێنین، ناتوانین ڕێژەی تەمەن لە هەموو ئەورووپای رۆژئاوادا بـژمێرین، هـەروەها ماوەکـانیش. هـەروەها ئـەو هەڵسەنگاندنانەی کە لە راپۆرتەکانەوە وەرگیراون زۆر جێـی بـاوەڕنین، وەکـو راپۆرتـە رەسمییـەکانی دەنگدان (بڕوانە *Swaddle and Heath 1989*) لەگەڵ ئەوەشـدا، ئـەو داتایـەی خشـتەی 2.1 ئـەو تێـزە گشـتییە پشتراسـت دەکـات کـە ئەگـەری دەنگـدانی گەنجەکان کەمترە لە پیرەکان. هیچ برگەیەك ڕێژەی بـەرزتر لـە (1.00) پیشـانناداتت کـە دەبـوو ئەگـەر ڕێژەیەکی سەدیی زیاتر لە گەنجان، نەك لە پیرەکان، بیانووتایـە کـە لـە هەڵبـژاردنی پێشـوودا بەشـدارییانکردووە. لـە راسـتیدا تـەنها برگـەی خشـتەکە کـە نزیکـە لـە ڕێـژەی (1.00) لـەو هەڵسـەنگاندنەوە وەرگیراوە کـە *Eurobarometer* لـە سـاڵی 1992 ئەنجامیـداوە. تێکڕای ڕێـژەی گشـتی هەمیشە (0.82) بووە.

بەهۆی سروشتی داتاکان، دەبێت زۆر وریابین لـە لێکدانـەوەی وردی بەراوردکردنـەکانمان. ئەوەی کـە لـە یەکـەم سـەرنجماندا دێتـە بەرچـاو ئـەو

جیاوازییە سەرنجراکێشەیە کە لە نێوان ڕێژەکانی وڵاتانی باکوور و ئەوانەی باشووری ئەورووپادا هەیە. ئەم جیاوازییانە ئەوە دەردەخەن کە ڕەفتاری دەنگدان لە نێوان گەنجان و پیرانی ئەورووپای باشوور جیاوازیی زیاترە لەوەی کە لە باکووری ئەورووپادا هەیە. ئەم جیاوازییەش، لە ڕاستیدا دەستکردەو بەهۆی ئەوەوەیە کە ئەو داتایەی لە بارەی هەڵبژاردنەکانەوە لەوڵاتانی باکوور وەرگیراون بەزۆر لە هەڵسەنگاندنی هەڵبژاردنە نیشتمانییەکانەوەن، بەڵام لە باشووری ئەورووپا ئەم جۆرە داتایە لە بەردەستدا نین.

لەو وڵاتانەی کە هەڵسەنگاندنی هەڵبژاردن لە بەردەستایە – وەکو فنلەندە و نەرویج و سوید و بریتانیا و ئەڵمانیا و نەزەرلاند – هیچ جۆرە نموونەیەکی جێگیری کەمکردنی بەشداریکردنی گەنجان لە هەڵبژاردنەکاندا پیشاننادەن. ئەو دابەزینەی فنلەندە کە لە ساڵانی 1979–1981 دابەزی بۆ (0.90) و لە ساڵانی 1985–1989 بۆ (0.81) و لە ساڵی 91 دابەزی بۆ (0.75)، تایبەتە. (سەیری *Martikainen and Yjonen 1991* بکە بۆ بەراوردکردن). لە لایەکی دیکەوە، لە بریتانیادا پاش دابەزینی ڕێژەکان لە ساڵانی 1960ەکاندا، لە ساڵی 1970ەوە لەبەرز بوونەوەدایە و لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی 1992 گەیشتە (0.93) بڕوانە ( *Crewe, Fox and Alt 1977; Heath and Topf 1986*) ئەم داتایانە ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە لەسی ساڵی ڕابوردوودا ئەگەری بەشداریکردنی گەنجان لە پیرەکان کەمترە لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا. بەڵام بە تێپەڕبوونی کات، هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نییە ئەوە دەربخات کە ئەم جیاوازییە زیاد دەبێت، بەڵکو جۆرە دابەزین و هەڵبەزینێك هەیە لە زیادکردن و کەمکردنی ڕێژەکاندا لەم دە ساڵەی ڕابوردوودا.

ئێمە لەم بەشەدا هیچمان لا نییە بۆ ڕاڤەکردنی ئەو فاکتەرانەی کە دەبنە هۆی ئەم جیاوازییە لە یەکەیەکەی ئەم وڵاتانەدا. بەڵام، لە حاڵەتی بریتانیادا هەڵسەنگاندنێکمان لەبەردەستدایە لە بارەی داتاکانی هەڵبژاردنەکانی ساڵی 1980. لە ڕاپرسییەکدا کە نێوەندی ***British Election Study*** پێی هەستا، لە وەڵامدەرەوەکانی پرسیار کرد:

کام لەم ڕستانە نزیکە لە بیروبۆچوونی ئەو دەربارەی دەنگدانەکەی هەڵبژاردنی گشتی:

1–شایانی ئەوە نییە کە مرۆڤ دەنگی تێدا بدات،

2–خەڵك تەنها دەبێت ئەو کاتە دەنگبدەن کە مەبەستیانبێت کێ دەیباتەوە،

3–ئەرکی سەرشانی هەموو کەسێکە کە دەنگبدات.

تەنها لەسەدا 3ی وەڵامدەرەکان ڕستەی یەکەمیان هەڵبژارد و زیاتر لە 75 لەسەدا ڕستەی سێیەمیان هەڵبژارد. لەمەش زیاتر، ئەوانەی کە وتیان دەنگیان نەداوە تەنها 16 لە سەدیان ڕستەی یەکەمیان هەڵبژارد، بەڵام جیاوازی لە تەمەنیاندا هەبوو.

تەنها (2) لە سەدای بە تەمەنەکان لەو باوەڕەدا بوون کە شایانی ئەوە نییە مرۆڤ دەنگبدات و لە سەدا (6)ی گەنجەکان لەسەر هەمان باوەڕ بوون. لە کاتێکدا کە ئەوانەی لە تەمەنی 50 ساڵی و بەژوورەوەبوون بەشداریکردن لەدەنگداندا بە ئەرکی سەرشانی هەموو کەسێکیان دادەنا. لەسەدا (60)ی ئەو گەنجانەی کە تەمەنیان لە نێوان 20–30 ساڵیدا بوو هەمان بۆچوونیان هەبوو. بێگومان، لەوانەیە بریتانیا نموونە نەبێت بۆ فەرهەنگی سیاسی وڵاتەکانی دیکەی ئەورووپای ڕۆژئاوا، بەڵام

دەبێت ئەوەمان لا روون بێت کە فەرهەنگێك هەیە لە نێو گەنجاندان کە زۆر گوێ نەدرێتە هەموو جۆرە پرۆسەیەکی هەڵبژاردن، ئەمەش وا دەکات کە گەنجان دەنگدان بە کارێکی بێ کەڵك بزانن. جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان گەنجان و بە تەمەنەکاندا لە هەڵوێستیاندا بەرامبەر هەڵبژاردن و بە گشتی گەنجان دەنگدان بە ئەرکی سەرشان نازانن. ئەمەش نابێت ببێتە هۆی ئەوەی کە هەست بە مەترسی بکرێت لە بارەی پرۆسەی لە نێو ئەوانەی کە باوەڕیان بە تیۆری پلورالیزم (فرەیی) هەیە.

## دەنگدان و ڕەگەز

جیاوازییەکی سەرنجراکێش هەیە دەربارەی گرنگیی ڕەگەز لە دەنگداندا. لێکۆڵینەوە تەقلیدییەکان دەڵێن کە لە دەنگدانا ڕەگەز گرنگیی نییە. باتلەر و ستۆکس لە لێکۆڵینەوەکەیاندا (1974) باسی ڕەگەزیان هەر نەکردووە. دە ساڵ دوای ئەوان، هیث و جۆوێڵ و کێرتس (1985:23) گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە پەیوەندیدا لەگەڵ دەنگداندا "نەبوونی جیاوازیی ڕەگەزە کە زۆر سەرنجراکێشە". بە پێچەوانەوە، لە لێکۆڵینەوەیەکی فراوانتردا، کە تیایدا دەنگدان، وەکو چالاکییەکی سیاسی، باس نەکرابوو. مارش و کاس دەڵێن: "بەشداریکردنی سیاسی تەقلیدی کاریگەریی زۆری ڕەگەزی بەسەرەوەیە" (106: 1979) دە ساڵ پاش ئەو (داڵتن) جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە "ڕەگەزیش کاریگەریی هەیە لەسەر چالاکیی سیاسی لە هەموو دیموکراتییە ڕۆژئاواییەکاندا پیاوان لە سیاسەتدا لە ژنان چالاکترن." (49: 1988). ئەو ئەنجامانەی کە بۆمان دەرکەوتوون گومانی تێدا نییە. لە ساڵانی 1960ەوە و دوای ئەو لە هیچ ئامارێکدا نەهاتووە کە ڕەگەز کاریگەریی هەبێت لەسەر ئەنجامەکانی هەڵبژاردن. ئەگەر لە هەر شوێنێکدا، یان لە هەر کاتێکدا لە داتاکانی ڕاپرسیدا ئەگەر جیاوازیی ڕەگەز دەرکەوت زۆر ئاساییە. ئاساییشە ئەگەر ژمارەیەکی زۆرتری ژنان یان پیاوان بڵێن کە بەشداریی هەڵبژاردنیان کردووە. ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە لە هەموو ڕاپرسییەکان دەربارەی چالاکیی سیاسی ژنان لە پیاوان زیاتر دەڵێن کە بەشداریی دەنگدانیان کردووە. بەڵام داتا نوێیەکان هیچ نموونەیەکی بەرچاوی جیاوازیی ڕەگەزپیشان نادەن. ئەگەر جیاوازییەکی کەمیش دەرکەوت ئەوە شتێکی نا سروشتییە. بۆ نموونە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵانی 1980 لە ئەڵمانیادا پیاوان تۆزێك زیاتر بەشدارییانکرد لە هەڵبژاردندا، بەڵام لە بریتانیا و ئیسپانیا و پورتگال ڕێژەی ژنان زیاتر بوو.

ئەم ئەنجامە گرنگە. یەکەم، ئەگەر ئەوەمان لە بیربێت کە ڕێژەی دیموگرافیی ژنان زیاترە، دەبێت چاوەڕوانیی ئەوە بکرێت کە ڕێژەی ژنانی دەنگدەر زیاتر بێت لە پیاوان لە کۆی گشتیی دەنگدەراندا. ئەمە زۆر گرنگە نەك هەر بۆ ئەو سیاسییانەی کە ئەجێندای هەڵبژاردنە گشتیەکان دادەنێن بەڵکو بۆ پرۆسەی ڕەوایی سیستەمەکەش. دووەم، ڕەخنەگرە فێمینیستەکان. لە تیۆری دیموکراتیی فرەییدا دەڵێن کە شێوازی بەشداریکردنی پیاوان و ژنان لە سیاسەتدا جیاوازە (*Norris 1990; phihps 1991*). ئەوان دەڵێن کە ژنان بەشداری فۆرمی جیاوازی هاوولاتیی دەکەن و زیاتر حەز لە چالاکیی هاوکاری و بە کۆمەڵ دەکەن نەك لایەنی ململانی وپێشبڕکێ کە لە هەڵبژاردنەکاندا هەیە (*Chapman 1990*). لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو بەڵگانەی کە دەربارەی

هەڵبژاردن خستمانە ڕوو بە هیچ جۆرێك ئەوە پیشان نادەن کە ژنان لە پیاوان کەمتر بەشداریی دەنگدان دەکەن. لە ڕاستیدا، ئەو ئاراستەیەی کە بە ڕوونی یەکسانی بوونی پیاوان و ژنان لە بەشداریکردنی هەڵبژاردندا و، تەنانەت بەشداریکردنی زیاتری ژنان، ئەو پیشاندەدەن کە هیچ جۆرە جیاوازییەکی بۆماوەیی ڕەگەزی نییە لە چەمکی هاوولاّتیبووندا[9].

## دەنگدان و پەروەردە

دەمێکە وا سەیری پەروەردە دەکرێت کە کلیلی چارەسەرکردنی ئەو تەنگژە بۆ ماوەییەیە کە لە نێوان ململانێ و هاودەنگیدا هەیە لە پرۆسەی نوێی دیموکراتیدا. (لیپسێت) لەسەر ئەو باوەڕەی (دیوی)دایە کە دەڵێت پەروەردە ئەو توانایە دەبەخشێت کە هاوولاّتییان لە گرنگیی لێبوردەیی بگات و ناهێڵێت خۆیان بە باوەڕە توندڕەوەکانەوە ببەستنەوە. هەروەها توانایان زیاتر دەکات کە هەڵبژاردنەکانیان بەشێوەی عەقلاّنی بێت. هەروەها *Almond* و *Verba* لەو باوەڕەدان کە چینە ڕۆشنبیرەکان کلیلی بەشداربوون و تیگلانیان پێیە. *Almond and Verba 1963; 381;cf. Lipset* ) *1959: 65; Heath and Topf 1986: 546*) هەروەها زۆر لەو لێکۆڵینەوانەی کە لە ساڵانی (1960)ەکان و (1970)کان ئەنجامدراون ئەوەی سەلماندووە، هەر نەبێت لە بارەی هەڵبژاردنەکانی ئەمریکاوە، کە پەیوەندییەکی زۆر گرنگ هەیە لە نێوان ئاستی ڕۆشنبیری و بەشداریکردنی هەڵبژاردندا. کێرکپاتریك (1979:278) بۆ نموونە (30) خاڵی جیاکەرەوە لە هەڵبژاردندا لە نێوان ئەو کەسانەی کە (9) ساڵ خوێندنیان تەواو کردووە و ئەوانەی زیاتر لە (12) ساڵ خوێندنیان هەیە. زۆر لێکۆڵینەوەی دیکە لە ولاّتە جیاوازەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوادا ئەنجامدراون هەمان پەیوەندییان داناوە لە نێوان ئاستی ڕۆشنبیری و دەنگداندا، هەر چەند کەتێبینی هەندێك کێشەی میتۆد و دەرچوون لە پێوانە لە لێکۆڵینەوەکاندا کرا. کاڤانا (1980) پێداچوونەوەیەکی ئەنجامدا لەسەر داتاکانی ئەڵموند و ڤێربا و ئەو ڕاستیەی خستە ڕوو کە لە بریتانیادا ئەوانەی کە کەمترین ئاستی خوێندنیان هەیە بەرزترین ئاستی توانای سیاسییان هەبووە. لە ڕاستیشدا، پێداچوونەوەی داتاکان ئەوە پیشاندەدەن کە لەم سێ ولاّتەدا – بریتانیا و ئیتالیا و ئەلمانیای ڕۆژئاوا – هیچ پەیوەندییەکی پۆزەتیڤی ئاشکرا نییە لە نێوان دوا هەڵبژاردن و ئاستی ڕۆشنبیریدا.

ئەو داتایەی کە لە نەخشەی 2.2 دا لە بارەی بەشداریکردن لەسەر هەمان بنەما و لە هەمان سەرچاوەوە وەرگیراوە کە لە نەخشەی 2.1 دا هاتووە. هەروەها پێوەرەکە ڕێژەییە کە ئەنجامی هەڵبژاردن لە نێوان ئاستی ئەوانەی کە کەمترین ئاستی خوێندن و ئەوانەی کە بەرزترین ئاستی خوێندنیان هەیە.

ئەو ئەنجامەی کە گەیشتوونەتێ زۆر ڕوونە، لە ماوەی سی ساڵی ڕابووردوودا لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا، ئەگەر تێکڕای ڕێژەی ئەو دەنگدەرانەی کە نزمترین ئاستی خوێندنیان هەیە بەراوردبکەین لەگەڵ ئەوانەی کە بەرزترین ئاستی خوێندنیان هەیە، جیاوازییەکە ناگاتە (0.05)[10]. واتە هیچ کاریگەرییەکی گشتی خوێندن لەسەر دەنگدان نییە و نەبووە. خشتەی 2.2 ئاراستەیەکی تایبەتە بە ولاّتێك لە ماوەیەکی درێژدا. لە سێ خاڵی داتادا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە لە نەمساو سویسرادا ئەگەری بەشداریکردنی ئەوانەی پلەی نزمی خوێندنیان هەیە کەمترە لەوانەی کە پلەی بالاّتری خوێندنیان هەیە، بەلاّم داتاکان لە ڕاپرسیی گشتی وەرگیراون و ناتوانین بەراوردیان بکەین لەگەڵ

هەڵسەنگاندنە رەسمییەکانی هەڵبژاردندا. لەوانەیە لەوەش گرنگتر ئەوە بێت کە نموونەیەکی گشتی نییە کە جیاوازیی نێوان باشوور و باکوور، یان ولاَتە زۆر پێشکەوتوو کەمتر پێشکەوتووەکاندا پیشانبدات. ئەو داتایانەی کە لە بارەی ئێرلەندە و پورتگال و سویدن بە هەمان شێوە دێنە بەرچاو، لە ئەلمانیا و سوید ئاراستەکان بە پێچەوانەی یەکترەوەن. کەواتە، لە ئەوروپای رۆژئاوادا هیچ پەیوەندییەك نابینرێت لە نێوان ئاستی خوێندن و هەڵبژاردنەکاندا. بە واتایەکی دیکە، بەڵگەکان ئەوە پیشاندەدەن کە لە ئەوروپای رۆژئاوادا، لە ساڵانی 1960ەوە خەڵکانی ئاستە جیاوازەکانی خوێندن هەمان کارامەییان هەیە لە بەشداریکردنی هەڵبژاردنە نیشتمانییەکاندا. کاتێك کە بە داتا هاوتەریبەکاندا دەچینەوە، لە بەشی داهاتوودا، ئەو گریمانەیەمان بۆ دەچەسپێت کە دەڵێت ئاستی رۆشنبیری گرنگە بۆ شێوەکانی دیکەی چالاکی سیاسی. ئەمەش ئەو رایە بەهێزتر دەکات کە دەڵێت دەنگدان جیاوازە لە شێوەکانی دیکەی بەشداریی سیاسی. بەهەمان نیشانە بەڵگەی ئاشکرا هەیە کە لە ئەوروپای رۆژئاوادا، بەگشتی، ئەو هاوولاَتییانەی کە ئاستی نزم و ئەوانەی کە ئاستی بەرزی خوێندنیان هەیە بە شێوەیەکی یەکسان حەز لە بەشداریکردنی هەڵبژاردنەکان دەکەن.

لەو بەشەدا بەو بەڵگانەدا چووینەوە کە لە هەڵسەنگاندنی هەڵبژاردنە نیشتمانییەکاندا دەرکەوتوون و بەراوردکردن لەگەڵ لێکۆڵینەوە تایبەتییەکان چەند ولاَتێك. هەمووشیان ئەوە دەردەخەن کە ئاستی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن لەم ساڵانەی دواییەدا بەرەو نزمی دەچێت. هەر چەند کە ئەم بەڵگانە جێی گومان نین، بەلاَم ئێمە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە هیچ بەڵگەیەك نییە ئەوە پیشانبدات کە ئاراستەیەکی گشتی هەیە بەرەو دابەزینی ئاستی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن. بە پێچەوانەوە، ئاراستەکان بەرەو سەقامگیرییەکی بەرچاو دەچن، هەر چەند کە گۆرانی گرنگ روویانداوە لە شێوازەکانی بەرێوەبردن و لە پێکهاتەی دیموگرافیدا لە ئەوروپای رۆژئاوادا. بەردەوام و بە گشتی پیرەکان لە گەنجان زیاتر بەشداریی هەڵبژاردن دەکەن. ئەم دیاردەیە جێگیرەو هیچ بەڵگەیەکمان لا نییە ئەوەمان بۆ پیشانبدات کە گۆرانێکی رێژەیی روویداوە لە مەیلی دەنگدەران لە نێوان کۆمەڵە جیاوازەکانی تەمەندا.

کەواتە، لەسەر بنەمای ئەم داتانە دەتوانین بڵێین کە هیچ جۆرە ترسێك نییە کە لە هەڵبژاردنە نیشتمانییەکانی ئەوروپادا مەترسیی ئەوەی تێدا بێت کە پابەندبوونی هاوولاَتیان بە سیستەمی سیاسییەوە نەمێنێت، بەڵکو ئەگەر ئەو پەیوەندییەی لە نێوان تەمەن و مەیلی سروشتی بۆ دەنگدان بەردەوام بێت و ئەگەر تێکرای تەمەنی هاوولاَتیانی ئەوروپای رۆژئاوا، هەر نەبێت بۆ چەند نەوەیەکی داهاتوو، لە بەرزبوونەوەدا بێت، ئاستی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن بەهەمان شێوە لە بەرزبوونەوەدا دەبێت.

## تێبینییەکان

1-لەوانەیە ئێرلەندەی باکوور بەدەربێت لەم گشتاندنە (تصمیم). لەگەڵ ئەوەشدا توندو تیژیی سیاسی پەیوەندیی راستەوخۆی نییە بە هەڵبژاردنە نیشتمانییەکانی بریتانیاوە.

2-مەبەست لە رێژەی سەدیی گەشەکردن زیادبوونی قەوارەی دانیشتوانە لەوەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی دوای خۆی. واتە لە (1950)ەوە بۆ (1960) و (1970). ئەو ژمارانەی کە بۆ ساڵی 1960 دادەنرێن ئەو گەشەکردنە پیشاندەدات کە لەسەر بنەمای ژمارەکانی 1950 زیادیانکردووە. ئەگەر نەمانتوانی دڵنیابین لەوەی کە

پەیوەندیی نێوان خاڵەكانی داتاكە بەرەو پێشەوە دەروات، دەتوانین خشتەی فرە سنووریی بۆ دابنێین.

3–لەم بەشەدا "بریتانیا" لەبری "شانشینی یەكگرتوو" بەكار دەهێنین. هەموو شیكارە گشتیەكان و داتاكان و راپرسەكان وشەی دووەم بەكاردەهێنن، كە ئێرلەندەی باكووریش دەگرێتەوە، تەنها ئەو شیكارانە نەبێت كە لەسەر هەڵسەنگاندنی داتاكان دانراون.

4–هەموو ئەو ئامارانەی كە دەزگا نێو دەوڵەتییەكان، وەكو *OECD* و *UN* بلاویدەكەنەوە لەسەر راپۆرتی حكوومەتەكان دانراون. ئاستەكانی خوێندن بۆ تەمەنە جیاوازەكان پیشاندەدەن لە سیستەمی پەروەردەی وڵاتەكەیاندا. لەبەر ئەوە ئاسانە كە لەم بلاوكراوانەوە، لەسەر نموونەی پەروەردە، بۆ نموونە بۆ تەمەنەكانی 15–19 ساڵ، یان بۆ زانینی ژمارەی ئەو بڕواناماەنەی زانكۆكان لەو ساڵانەدا بەخشیویانە زانیاری وەربگرین. بۆ نموونە دەزانین كە لە ساڵانی دوای 1980، تەنانەت لە وڵاتە زۆر پێشكەوتووەكانیشدا جیاوازییەكی زۆر هەبووە لە پەروەردەكردنی ئەو كۆمەڵەی كە تەمەنیان 15–19 ساڵە. هەروەها بۆمان دەردەكەوێت كە دوو لەسەر سێی ئەوانەی تەمەنیان 19 ساڵە لە ئەڵمانیادا لەسەر خوێندن بەردەوامبوون، بەڵام لە بریتانیادا تەنها چارەكی ئەم كۆمەڵە لەسەر خوێندن بەردەوامبوون. (*OECD 1992; Chisholm 1992*) بەڵام داتای ساڵانەی پێداویستیەكان بۆ هەموو قۆناغەكانی خوێندن لە وڵاتدا ئاڵۆزە و پێویستی بە ژمێرەیەكی (*Calculation*) ئاڵۆز هەیە. پرۆژەیەكی *OECD* لە ئارادایە بۆ دەرخستنی نیشاندەرەكانی پەروەردەی جیهانی بۆ ئاسانكردنی لێكۆڵینەوە هاوچەرخەكان كە ئەم ئەركە ئاسانتر دەكات.

5–داتاكانی خشتەی *2.2a* و *2.2b* لەسەر بنەمای داتاكانی *Cumulaxine Eurobaro meter* بۆ ساڵانی 1973–1991 دانراوە، هەروەها لەسەر *Education at a Glance* كە *OECD* ساڵی 1992 ئەنجامیدا. ئەم داتایە هیچ شتێكی لە بارەی وڵاتە نا ئەوروپییەكانەوە تێدا نییە بۆ بەراوردكردن.

6–ئاماری ئەنجامەكان لەسەر زۆر بنەما دەژمێردرێن. ئەوەی زۆر باوەو لەم بەشەدا پەیرەویمان كردووە ژمارەی سەدیی ئەو دەنگدەرانەیە كە تۆمار كراون. لەوانەیە ژمارەی دەنگەكان هەندێك زیاتر بێت لە داتای گشتیی ئەوانەی كە ماف دەنگدانیان هەیە، بەڵام وەكو سەرچاوەیەك سوودی ئەوەی هەیە كە روون و نەگۆڕە. (بڕوانە *Powell* 1988) بۆ ژماردنی جیاوازی لە نێوان هەردوو پێوەرەكەی هەڵبژاردنی ساڵی 1970 كە رێژەی سەدیی دەنگە "یاساییەكان" ژمارەیەكی كەمتر پیشاندەدات. بەلای ئێمەوە دەنگ دەنگە بەبێ گوێدان بەوەی كە راستەیان "تێكچووە".

7–ئەم داتایە لە *Mackie 1992* وەرگیراوە، هەروەها (*Mackie and Rose 1991*) و راپۆرتە بلاوكراوە رەسمیەكانەوە.

8–تەمەنی ئەو گەنجانەی كە هەڵبژێردران 20 ساڵ بوو نەك 18 ساڵ بۆ ئەوەی رێژەی سەدیی ئەوانەی لێ دەربكەین كە هێشتا ماف دەنگدانیان نەبوو لە كاتی هەڵسەنگاندنی دوا هەڵبژاردندا. هەروەها ئەو تەمەن 18 ساڵانەیەمان لێ دەركرد لەو كاتەدا لە هەندێك وڵات ماف دەنگدانیان وەرنەگرتبوو.

9–ئەم ئەنجامەش دەتوانین بخەینە ناو تێزەكەوە لە رێی لێكدانەوەی ئەوەی كە شێوازی بەشداریكردنی ژنان و پیاوان جیاوازە.

10–ئەو داتایەی كە ئەم نەخشەیەی لەسەر بنیاتنراوە داتای *Eurobarometer* ژمارە 7 ی تێدا نییە كە دژایەتییەكی زۆری هەیە لەگەڵ هەڵسەنگاندنی هەڵبژاردنی نیشتمانیدا.

## سەرچاوە

***Citizens and the state Edited by: Hans – Dieter Kingman and Dieter Fuchs 1998***

# ڕەخنە و لێکۆڵینەوە

- ڕۆمانی (سەد ساڵ لە گۆشەگیری)

گابریل گارسیا مارکیز

لە عەرەبییەوە: کەژاڵ ئەحمەد

- بەبۆنەی یادی سەد ساڵەی دوا کۆچی چیخۆفەوە

مەکسیم گۆرکی

لە فارسییەوە: ڕەوف بێگەرد

- (ڕۆمان ڕۆلان) و ڕۆمانی ڕووبار

لە فەڕەنسییەوە: جەلال حەمید

# ڕۆمانی (سەد ساڵ لە گۆشەگیریی)

گابریل گارسیا مارکیز
لە عەرەبییەوە: کەژاڵ ئەحمەد

ئەو کاتەی لە یەکێ لە هۆڵەکانی مەزادخانەی بەرشەلۆنە ڕەشنوسێکی ڕۆمانی (سەد ساڵ لە گۆشەگیریی) کە یەکێکە لە بەناوبانگترین ڕۆمانەکان لە مێژووی ئەدەبدا و شاکارێکی نووسەری بەناوبانگی کۆلۆمبیا و خاوەنی خەلاَتی نۆبڵ (گابریل گارسیا مارکین)ە نمایشکرا، ڕەشنوسەکەش چاککردنی هەندێ هەڵەی چاپی بە دەستوخەتی نووسەر خۆی لەسەر بوو" بەو بۆنەیەوە گارسیا مارکیز لە گۆشە مانگانەکەی خۆیدا لە گۆڤاری (کامبیو)دا کە بۆ خۆی سەرنووسەریەتی وتارێکی بلاَوکردەوە و تیایدا گرنگترین بیرەوەرییەکانی هەوڵدانی بۆ بە چاپ گەیاندنی ئەم بەرهەمە دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

لە سەرەتای مانگی ئابی ساڵی 1966دا من و مارسیدس ڕوومانکردە نوسینگەی پۆستی سان ئەنخل لە شاری مەکسیك، بە مەبەستی ناردنی نوسخەی ئەسڵیی ڕۆمانی (سەد ساڵ لە گۆشەگیریی) بۆ بۆینس ئایرس، زەرفەکە پێنج سەد و نۆ پەڕەی تایپکراوی تێدابوو کە لەسەر کاغەزی زۆر ئاسایی ئاراستەی باکوبرِوای بەڕێوەبەری ئەدەبیی دەزگای بلاَوکردنەوەی (ڕەشپێستەکانی ئەمریکا)مان کردبوو، فەرمانبەری نوسینگەکە زەرفەکەی خستە سەر تەرازووەکە بۆ کێشانی و وتی:

–ئەمە هەشتاو دوو (82) بیزۆی تێدەچێت.

مارسیدس ئەو پارانەی ژمارد کە لە جانتا دەستیەکەیدا بوو ئینجا پێی وتم:

–لە پەنجا و سێ بیزۆ زیاترمان پێ نییە.

ڕۆژانە تەواو لەسەر ئەم قەیرانانە ڕاهاتبووین، پاش ساڵێکی تەواو لە دەستکورتی و نەبوونی وامان لێهاتبوو زۆر بیر لە چارەسەر نەکەینەوە، زەرفەکەمانکردەوە و کاغەزەکانمان کرد بە دوو بەشی یەکسانەوە تەنیا بەشێکیمان نارد بۆ بۆینس ئایرس بەبێ ئەوەی لە خۆمان بپرسین چۆن بەشەکەی تریان کە ماوە بینێرین. سەعات شەشی ئێوارەی ڕۆژی هەینی بوو، نوسینگەکانی پۆستیش تا ڕۆژی دووشەممە ناکرێنەوە. لەبەرئەوە تەواوی کۆتایی هەفتەمان لە بەردەمدا بوو بۆ ئەوەی بیر لە

چارەسەرێك بكەینەوە. ژمارەیەكی كەم لە هاوڕێیانمان بۆ مابۆوە تا قەرزیان لێبكەین، هەروەها باشترین ئەو شتانەی هەمانبوو لە پاڵ نمایشكراوەكانی مۆنت دی بیداد دانرابوون. بێگومان ئەو مەكینە سەیارەی چاپمان مابوو كە ڕۆژانە بۆ ماوەی شەش سەعات و زیاتر لە ساڵێ بەرامبەری دانیشتم بۆ ئەوەی لە نووسینەوەی ڕۆمانەكە ببمەوە، دیارە نەماندەتوانی ئەو ماشێنە بخەینە ڕەهنەوە چونكە سەرچاوەی گوزەرانمان بوو.

پاش چاوپێداخشاندنەوەیەكی ورد بە ماڵەكەدا دوو شتمان دۆزییەوە باشن بۆ ئەوەی بیانخەینە ڕەهنەوە، ئەوانیش زۆپای ژووری كتێبخانەكەم كە هیچی وایشی نەدەكرد لەگەڵ خەلاَتەیەك (ست البیت) كە خاتوو سۆلیداد مەندۆسا لە كاراكاس بە بۆنەی پێكەوەنانی ژیانی هاوسەرییەوە بۆیهێنایین.

هەروەها ئەڵقەكانی دەستی من و مارسیدس هەبوون كە ڕۆژێ لە ڕۆژان نەماندەوێرا بیانخەینە رەهنەوە چونكە شوومە. بەلاَم ئەو جارەیان مارسیدس مەسەلەكەی بڕانەوە و بڕیاریدا بیانخەینە رەهنەوە بەو پێیەی بۆ كاتی تەنگانە وەك پاشەكەوتێكی ستراتیژیی دانرابوون.

لەگەڵ سپێدەی ڕۆژی دووشەممەدا ڕوومانكردە یەكێ لە لقەكانی مۆنت دی بیداد كە مەعمیلێكی ناسراویان بووین. لەوێ بە بێ حسابكردنی دوو ئەڵقەكەمان ئەوەندەیان پارەداینێ كە كەمێ زیاتریش بوو لەوەی پێویستمان پێی بوو، كە گەیشتینە پۆستەخانەكە و سەیری ئەو كاغەزانەمانكرد كە مابوون بیاننێرین بینیمان كاغەزەكانی كۆتایمان بەر لە سەرەتاكانی ناردووە. بەلاَم مارسیدس ئەمەی بەلاوە گرنگ نەبوو بەڵكو وتی: ئێستا هەر لەوەمان كەمە ڕۆمانەكە باش نەبێت.

ئەم دەستەواژەیە كۆتاییەكی گونجاو بوو بۆ ئەو هەژدەمانگەی كە بەیەكەوە تیایدا خەباتمانكردبوو بۆ بە ئاكام گەیشتنی ئەو كتێبەی هیوای زۆرم لەسەر بنیاد نابوو.

تا ئەو كاتە هێشتا چوار كتێبم لە ماوەی شەش ساڵدا بلاَوكردبۆوە و ئەوەی لە پاداشتیشیاندا وەرمگرتبوو لە هیچ باشتر بوو، بێجگە لە كتێبی (لە كاتژمێری بەدبەختیدا) كە لە پێشبڕكێیەكی (اسو كۆلۆمبیان)دا خەلاَتێكی سێ هەزار دۆلاریم پێوەرگرت، ئەم پارەیەش لە خەرجیی لەدایكبوونی دووەم كوڕمدا (جۆن ساڵا) فریامكەوت كە بێجگە لەوەی یەكەم ئۆتۆمبێلمان پێ كڕیی.

لە ماڵێ لە ماڵەكانی چینی ناوەندا دەژیاین كە كەوتبووە سەر گردی سان ئەنخل ئان كە موڵكی كوێخا و پارێزەر لویس كۆدۆریر بوو. ئەم پیاوە یەكێ لە باشییەكانی ئەوە بوو بەشێوەیەكی تایبەتی گرنگی بە كێشەی كرێچییەكانی دەدا.

رۆدریگۆ كە ئەو كاتە شەش ساڵان بوو، جۆناسالویش سێ ساڵان بوو، لەو ماڵەدا باخچەیەكی جوانیان هەبوو یاریان تێدا دەكرد لەو كاتانەدا كە خوێندنگەیان نەدەبوو. منیش هەمەئاهەنگیی كاری گشتی نێوان هەردوو گۆڤاری (سۆشیسۆس) و (لافامیلیا) بووم بەرامبەر بە موچەیەك كە خراپ نەبوو، دوو ساڵم لەوێدا بردەسەر بەبێ ئەوەی یەك وشە بنووسم!

لەگەڵ كارلۆس فۆینتسدا چیرۆكی (كەڵەشێری ئاڵتونیی) خوان ڕۆلفۆمان ئامادەكرد بۆ سینەما و ڕۆبەرتۆ جایلدون وێنەگری فیلمەكەبوو. هەر لەگەڵ فوینتسدا لە نوسخەی كۆتایی سیناریۆیی فیلمی (پیدرۆ پارامۆ)دا كارمانكرد كە لە دەرهێنانی

کارلۆس بیلو بوو. هەروەها سیناریۆم بۆ فیلمی (کاتی مردن) نووسیی کە یەکەم کاری ئەرتۆرۆ ریستینی دەرهێنەر بوو. لەو سەعاتە کەمانەدا کە بۆم مابۆوە گەلێ کاری ترم دەکرد وەك ئامادەکردنی دەق بۆ بڵاوکردنەوە و ریکلامی تەلەفزیۆنیی و نوسینی شیعری گۆرانیی، هەموو ئەمانە ئینجا بەشی ئەوەیاندەکرد کە بەشێوەیەکی ماقول بژیم، ئەم کارانە کاتی ئەوەیان بۆ نەهێشتبوومەوە کە کورتە چیرۆك و رۆمان بنووسم.

لەگەڵ ئەوەشدا بیرۆکەی پڕ لە جورئەتی رۆمانێك بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ خەوی لە چاو زڕاندبووم هەر بە تەنیا بیرۆکەیەکی جیا نەبوو لە هەموو ئەوانەی کە پێشتر نوسیبوومن بەڵکو تەواو جیابوو لە هەموو ئەوانەی خوێندبوومنەوە.

جۆرێ بوو لە ترسێ کە سەرچاوەکەی نەزانرابێت" ئەمە لە سەرەتای ساڵی 1965دا بوو ئەو دەمەی مارسیدس و دوو منداڵەکەم بۆ بەسەربردنی پشووی کۆتایی هەفتە برد بۆ ئەکابولکۆ، ئەوسا هەستمکرد وەختە بتەقمەوە ئەوەندە لە ناخمدا پەنگی خواردبۆوە، زۆر شڵەژاوو تێر بووم بەو بیرۆکەیە تەنانەت بە گران خۆم لە مانگایەك لادا کە لەسەر جادەکە هاتە بەر ماشێنەکەم، رۆدریگۆ بە خۆشییەوە هاواریکرد: منیش کە گەورە بووم مانگا ئەکەم بە ژێرەوە!

لە کەناری دەریاکەش بۆ تاوێ ئارامیم بەخۆمەوە نەبینی، کە رۆژی چوارشەممە گەڕاینەوە بۆ مەکسیك چوومە سەر ماشێنی چاپەکە تا رستەی سەرەتا بنووسم چونکە نەمدەتوانی لەوە زیاتر لەناو خۆمدا بیهێڵمەوە نووسیم: پاش چەندین ساڵ و لەبەردەم ئەو چەکبەدەستانەدا کە بۆ گوللەبارانکردنی وەستابوون، کۆلۆنێل ئۆرلیانۆ بوینديا دەبووایە ئەو ڕۆژەی بیر بکەوتایەتەوە کە باوکی لەگەڵ خۆی بردی تا بە بەفر ئاشنابێت.."

ئیتر لەو ساتەوە رۆژێ لە تایپکردن دانەبڕام تا دوا دێڕ، ئەم لە خەونێکی باڵا دەست دەچوو.

لە مانگە بەراییەکاندا توانیم پارێزگاریی لە باشترین ئاستی گوزەران بکەم کە لە توانامدا بێت بەڵام لە راستیدا پێویستم بە کاتی زیاتر بوو بۆ ئەوەی بەو شێوەیە بنووسم کە دەمەوێت. تا شەو درەنگانێ کارمدەکرد بۆ ئەوەی لەو ئیلتیزاماتە رزگارم ببێت کە لەسەر شانم بوو ئیتر وایلێهات ژیان بۆ من مەحاڵ بێت، وردە وردە ئەو واقیعەی توانای بەرەنگار بوونەوەیمان نییە وایلێکردم کە بەبێ دوو دڵیی لە نێوان نووسین و مردندا یەکێکیان هەڵبژێرم. دوو دڵ نەبووم چونکە مارسیدس لە هەموو کاتێ زیاتر هەموو شتێکی خستە ئەستۆی خۆی پاش ئەوەی سەرجەم هاوڕێکانمان لەگەڵ خۆماندا ماندووکرد، قەرزی کراوەمان لای بەقاڵەکەی گەرەك و گۆشت فرۆشەکەی سەری کۆڵان هەبوو، قەرزێك کە هیوای دانەوەی لە ئارادانەبوو. لە یەکەمین قەیرانەوە کە تووشمان هات بە توندی خۆمان لە بیرۆکەی قەرزی سوو دەبوارد بەڵام لە کۆتاییدا ناچاربووین بۆ یەکەمجار سەر لە (مۆنت دی بیداد) بدەین و پاش دووجاری تر کە هەندێ شتی سوکەڵەمان خستە رەهنەوە دەستمانکردبە رەهنکردنی خشڵەکانی مارسیدس کە لەلایەن خزمە نزیکەکانیەوە بە درێژایی ساڵانی دوای ئاهەنگی هاوسەریمان وەکو دیاریی پێشکەشی کرابوون، کە پیشانی شارەزاکەی دوکانەکەماندا بە وردیی دەیپشکنی وەکو نەشتەرگەرێك دواتر تاقیدەکردەوە و بە هاوێنەیەکی ئەفسوناویی سەیری ئەڵماسی ناو گوارە و زمڕودی ملوانکە و یاقوتی بازنەکانی دەکرد لە کۆتاییشدا گەڕانیەوە بۆمان وتی:

–ئەمانە لە شووشەی پوخت دروستکراون.

نەکات و نە تاقەتی ئەوەشمان هەبوو رابوەستین و بیر بکەینەوە کەی مادده بە نرخەکانی ئەم خشڵانەی بە درێژایی ساڵانی هاوسەریمان پاراستوومانن گۆڕدراون بە شووشە، چونکە پێشوەخت دەمانزانی بەدبەختیی لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی داوین.

لەوانەیە باوەڕ نەکەن بەڵام گەورەترین گرفتی من لە کاتی نووسیندا کاغەزبوو، باوەڕم وابوو کە هەڵەی چاپ یان هەڵەی دارشتن یان هەڵەی زمانەوانی لە راستیدا هەڵەن لە داهێنانی نووسەردا بۆیە هەر کە یەکێ لەو هەڵانەم دەدۆزییەوە خێر هەموو کاغەزەکەم پارچە پارچە دەکرد و سەرلەنوێ دەستم پێکردەوە، مارسیدس نیوەی پارەی بەڕێوەبردنی ماڵەکەی بۆ کڕینی بەندە کاغەز خەرجدەکرد کەچی لە هەفتەیە زیاتر بەرگەی نەدەگرت، لەوانەشە لەبەر ئەمە نەموێرا بێت کاغەزی کاربۆن بەکار بهێنم.

گرفتی بچووکی ئەو وەك ئەمە پەتەکەی لە دەوری ملمان توندتر دەکرد تا وایلێهات هێزمان پێ نەما تا بەرگریی پێبکەین، چارەسەریی کۆتایی ئەوەبوو ئوتومبێلەکە بخەینە رەهنەوە ئەگەر چی تازەش کڕیومانە بێگومانیش بووین لەوەی کە چارەسەر لە دەرمان مەترسیدارتر دەبێت. ئەگەرچی قەرزە کۆنەکانمان دابۆوە بەڵام ئەو زیادەیەی مانگانە چوو بووە سەری دەتوت ملمانی لە هەزار بە هەزاری دۆزەخدا هەڵواسیووە.

لە بەختی ئێمە کارلۆسی هاوڕێمان ئەم زیادانەی بۆ داین نەك زیادەکانی قەرزی یەك مانگ بەڵکو هی چەند مانگێ بەمشێوەیە توانیمان ئۆتۆمبێلەکەمان رزگار بکەین. چەند ساڵێکی کەم لەمەو پێش زانیمان ناچار بووە یەکێ لە موڵکەکانی خۆی بخاتە رەهنەوە بۆ ئەوەی سووی قەرزەکەمانی پێبداتەوە.

هاوڕێ دڵسۆزەکانمان خۆیانکردبوو بە چەند گروپێکەوە تا هەموو شەوێ سەردانمان بکەن، دەهاتن و بەڕێکەوت کتێب و گۆڤاریان کڕیبوو یان بەڕێکەوت لە ڕێی بازاڕەوە بەشتومەکەوە سەریان لێدەداین کارمن و ئەلبارۆ مۆتیس لە هەمووان زیاتر سەردانیان دەکردین، دەبوایە بەشێوەیەکی بەردەوام بەشێکی رۆمانە تازەکەیان بۆ باسبکەم، خۆشم ماندوو دەکرد چیرۆکێکیان بۆ هەڵبەستم و بیگێڕمەوە لە کاتی تەنگانەدا چونکە لەو باوەڕەدا بووم لەو کاتانەدا کە گێڕانەوەی ئەوەی نووسیوومەوە بەڕاستی و دروستی جنۆکەکانیش دەترسێنێت.

کارلۆس فۆینتس ئەگەرچی لە فرۆکە دەترسا دنیای بەهاتن و چوون تەیدەکرد و هەمیشە گەڕانەوەی جەژن بوو بۆمان، باسی کارەنوێیەکانمان دەکرد وەك ئەوەی یەك کەس بین، ماریا لویس ئەلیو و هاوسەرەکەی خۆمی گارسیا پێیان وابوو ئەوەی بۆیاندەگێڕمەوە ئاماژەیەکە بۆ چاودێری خوا یان میهرەبانیی خوا لەگەڵم، بۆیە بەبێ دوو دڵی کتێبەکەم پێشکەشکردن و لەو کاتەدا هەستمکرد ئەو پەرچە کردار و حەماسەتەی لە چواردەورمە بۆمن وەکو ئەو تیشکەیە کە ریگاکەم بۆ رووناك دەکاتەوە بەرەو رۆمانێکی راستەقینە.

مارسیدس باسی قەرز و گرفتەکانی بۆ نەدەکردم تا مانگی مایسی ساڵی 1966 واتە پاش ساڵێ لە ڕۆژی دەستپێکردنی رۆمانەکەوە ئەویش کاتێ کرێخانووی سێ مانگمان لەسەر کەڵەکەبوو بوو. لەگەڵ خاوەن ماڵەکە بە تەلەفۆن قسەیدەکرد وەك هەمیشە بۆ هێورکردنەوەی و بۆ ئەوەی لەسەرمان رابوەستێ لە پڕێکدا دەستی گرت و بە

دەمی تەلەفۆنەکەوە و لێی پرسیم چەندت ماوە کتێبەکە تەواو بکەیت، بەسەیرکردنی ئەو بەشەی لە ماوەی ساڵێکدا تەواومکردبوو وامخەملاند شەش مانگم ماوە، ئیتر مارسیدس بە خاوەن ماڵە بە سەبرەکەمانی بە باوەڕ بەخۆبوون و بەبێ هیچ لەرینەوەیەك لە دەنگیدا وت:

—لە ماوەی شەش مانگی تردا دەتوانین هەموو قەرزەکەت بدەینەوە.

—خاوەن ماڵەکەمان بەسەر سوڕمانەوە وتی بەڵام ئایا پێت وانیە تا ئەو کاتەکە پارەکە زۆر زیاتر دەبێت؟!

—مارسیدس وتی بەڵێ دەزانم بەڵام ئەو کاتە هەموو گرفتەکانمان چارەسەر دەبن. کەواتە دڵنیابە.

ئەو پیاوە یەکێ بوو لە هەرە بەزەوق و بەسەبرەکانی ناسیومن بۆیە بە دەنگێکی پڕ لە لەرینەوە وتی:

—باشە خانم، وشەیەکم لە تۆوە بەسە - ئینجا حساباتی خۆی کرد و وتی لە حەوتی مانگی سپتەمبەری داهاتوودا چاوەڕوانی ئەو بڕە پارەیە دەکەم.

پیاوەکە بە هەڵەدا چوو بوو چونکە لە چواری مانگی سپتەمبەردا و لەگەڵ گەیشتنی یەکەم چەك بەشێوەیەکی کتوپڕ بەدەستم وەکو ماڤ ئەدەبیی چاپی یەکەم قەرزەکەمان دایەوە. لە راستیشدا شەش مانگی دوایی زۆر سەختبوو و هاوڕێ نزیکەکانمان کە ئاگاداری حاڵمانبوون زۆرتر دەهاتن بۆ دیدەنیمان و بە بەردەوامیی ئەو شتانەیان بۆ دەهێناین کە بۆ بەردەوام بوونی ژیان پێویست بوو. هاوڕێی تریشمان هەبوون وەکو ئەلکوریسا و ژنە ئوسترالیەکەی کە ناوی جانێت ریسنفیلد بوو نەدەهاتن بۆ لامان بەڵام لە ماڵەکەی خۆیاندا ئاهەنگی مێژوویی گەورەیان دەگێڕا لەگەڵ زۆرێك لە دۆستان و ژمارەیەك لەو کچانەی جوانیان لە جوانی ئەکتەرەکانی سینەمای تێپەراندبوو. گەلێ جار ئەم ئاهەنگانە دەکرانە بەهانە بۆ بینینمان. لویس تەنیا ئیسپانیەك بوو کە لە دەرەوەی ئەو وڵاتە بتوانێ کاری هەویری وا بکات لەوە بچێت کە فالینسیای پێناسراوە. ژنەکەشی دەیتوانی بەرزمانبکاتەوە بۆ ئاسمان بە سەما کلاسیکییە جوانەکەی.

بنەماڵەی گارسیا ریرایش کە عاشقی سینەمابوون رۆژانی یەکشەممە میوانداریيان دەکردین بۆ ماڵەوە تێرو پڕیاندەکردین لە بەختەوەریی ئەمەش یارمەتیدەداین بەرگەی هەفتەی ئایندە بگرین.

ئەو کاتە لە نووسینی رۆمانەکەمدا هێندە چووبوومە پێشەوە ماوەم هەبوو شاهانە بەردەوامبم لەسەر هۆنینەوەی ئەو چیرۆکانەی لە دانیشتنەکانمدا لەگەڵ برادەران دروستم دەکردن، سەریشم لە خێرایی بڵاوبوونەوەی ئەم چیرۆکانە دەسوڕما لە زمانی یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر و لەو زیادانەش کە لە کاتی گێڕانەوەدا دەخرانە سەریان.

لە کۆتایی مانگی ئابدا و رۆژ بە رۆژ بۆمدەردەکەوت کە لە ساتەکانی کۆتایی رۆمانەکە نزیکدەبمەوە، لەبەرئەوەی کاغەزی کاربۆنم بەکار نەدەهێنا نوسخەی ترم نەبوو لەم بەشە بۆیە نوسخە ئەسڵییەکەم پێکهاتبوو لە دوو هەزار پەڕەی قەبارە بچووك، ئەمەش وەکو دەعوەتێکی چەور وابوو بۆ ئەسپێرەنسا ئەریاسایان بیرا کە ژنێکە لە یاد ناکرێت، ئەم خانمە پەناگەی شاعیران و سینەماکاران بوو، وا ڕاهاتبوو لە کاتی بێکاریدا بەشێوەیەکی جوان هەندێ لەبەرهەمە دیارەکانی گەلێ لە نووسەرانی مەکسیك کۆپی بکات، لەوانەش

(بەشی هەرە دیار)ی کارلۆس فۆینتس و (پیدرۆ پارامۆ)ی خوان رۆلفۆ و زۆرێك لە سناریۆی فیلم، کاتێ داوام لێکرد رۆمانێکم بۆ کۆپی بکات کە لە دوا شێوەیدا رەشنوسێکی تارادەیەك چرچ و لۆچە و بە هۆی چاککردنەوەی هەڵەی چاپەوە شێواوە و جارێ بە مەرەکەبی رەش و جارێ بە سوور هەڵەکانی دەستنیشانکراون بۆ ئەوەی تێکەڵ نەبن، ئەمە کارێکی سەخت نەبوو بۆ ژنێکی بە ئەزموونی وەکو بیرا بۆیە نەك هەر بەتەنیا لەبەر حەزکردن بە خوێندنەوەی رۆمانەکە لێی وەرنەگرتم بەڵکو قایل نەبوو بەوەی هێندەی لە توانامدایە لە پاداشتی کۆپیکردنەکەدا بیدەمێ و ئەوی تریشی بۆ دوای وەرگرتنی ماف نووسەر دوابخەم.

بیرا هەفتەی بەشێکی تەواوی رۆمانەکەی کۆپیدەکرد منیش بەشێکی ترم بە مەرەکەبی رەنگاو رەنگ دەستکاریدەکرد، ئامانجم لەو دەستکاریکردنانە کورتکردنەوەی رۆمانەکە نەبوو بەڵکو حەزمدەکرد تا ئەتوانم چڕی بکەمەوە لە دواجاریشدا نیوەی ئەوەمایەوە کە نوسیبووم.

پاش بڵاوبوونەوەی رۆمانەکە بە چەند ساڵێك ئینجا بیرا دانیبەوەدانا کە لە کاتی بردنەوەی بەشی سێیەمی رۆمانەکەدا بۆ ماڵەوە کە دابەزیوە لە پاسەکە قاچی هەڵخزاوە بە هۆی گۆمی ئاوی بارانەوە و کاغەزەکان کەوتوونەتە ناو گۆمە ئاوە لیخنەکەوە، ئیتر ئەم بە هاوکاریی سەرنشینانی پاسەکە کۆیانکردۆتەوە پاش ئەوەی لە ئاوەکەدا خوساونەتەوە لە ماڵەوە بە پارچە پەڕۆ وشکی کردونەتەوە.

خۆشترین هەڵوێست کە لەگەڵ بیرادا هاتە پێشم ئەوە بوو لە یەکێ لە یەکشەممەکاندا ئەو بەشەم هەڵەبڕیی نەکردبوو کە پێویست بوو بیگەیەنمە دەستی بۆیە تەلەفۆنم بۆ کرد و پێم وت رۆژی دوو شەممە بۆتدەهێنم، پاش گفتوگۆیەکی دوورو درێژ ریگای بە خۆیدا بپرسێت ئایا ئۆرلیانۆ بۆندیا لە دوا جاردا لەگەڵ ریمدیۆس مۆسکۆت دەخەوێت؟

کە پێم راگەیاند بەڵێ ئەمە روودەدات هەناسەیەکی ئۆخەیی هەڵکێشا و وتی: ئۆخەی ئەگەر وەڵامت نەدامایەتەوە تا رۆژی دووشەممە خەو نەدەچووە چاوم.

لەو سەروبەندەدا وتەیەکی چاوەڕواننەکراوم لە باکۆبرواوە پێگەیشت کە تا ئەو کاتە ناویم نەبیستبوو، لەو وتەیەدا داوام لێدەکات مافی بڵاوکردنەوەی سەرجەم بەرهەمەکانم بدەم بەخانەی بڵاوکردنەوەی رەشپێستانی ئەمریکا کە ئەم بەرپرسی بەشە ئەدەبیەکەیەتی، پێی ڕاگەیاندبووم کە بەبەرهەمەکانم ئاشنایە چونکە چاپی یەکەمیانی خوێندۆتەوە. لە ڕاستیدا دڵم خەریك بوو لەت و پەت ببێت چونکە سەرجەم بەرهەمەکانم لە نێوان چەندین خانەی بڵاوکردنەوەدا دابەشبوو بوو کە بە پەیماننامەی دوور و درێژەوە پەیوەستبوو کە بە هیچ شێوەیەك رزگاربوون نەبوو لێیان.

بە بیرۆکەیەك دڵخۆشیی خۆم دایەوە کە بۆمهات و لە وەڵامی ئەودا نووسیم هێندەی نەماوە لە رۆمانێکی زۆر دوور و درێژم ببمەوە و پابەندی هیچ لایەنێك نیم سەبارەت بەم رۆمانە و دەتوانم نوسخەی یەکەمی لە ماوەی چەند رۆژێکدا بۆ بنێرم.

باکۆ لە بروسکەیەکدا قایل بوونی خۆی بە پێشنیازەکەم بۆ رەوانەکردم لە بروسکەیەکدا کە بە پۆستدا بۆیناردبووم لەگەڵ چەکێکی پێنج سەد دۆلاریدا وەکو پێشەکیی. کە ئەمە وەختە بوو بەشی قەرزی کرێ خانووەکەمانی دەکرد کە نەماندەزانی چۆن ئەو قەرزە بدەینەوە لە دوای ئەمەی بە هەڵەدا

چووم لە دەستنیشانکردنی کاتی تەواوبوونی ڕۆمانەکە. بە هەرحاڵ ئەو سێ کۆپیە باشەی بیرا بەکاربۆن کردبوونی لە ماوەی دوو تا سێ هەفتەدا ئامادەبوون. ئەلبارۆ مۆتیس یەکەم کەس بوو کە نوسخەی کۆتایی ڕۆمانەکەی بەر لەناردنی خوێندەوە. دوو ڕۆژ دیارنەماو لەسەرەی سێیەم ڕۆژدا بە تورەبوونە دڵگیرەکەیەوە لە تەلەفۆندا قسەی لەگەڵ کردم پاش ئەوەی بۆیدەرکەوت ڕۆمانەکەم پەیوەندیی بەوەوە نیە کە بۆ ژمارەیە لە هاوڕێکانم دەگێڕایەوە و ئەمیش بۆ هاوڕێکانی گێڕاوەتەوە هاواریکرد بەسەرما:

تۆ منت کرد بە پەڕۆی بێنوێژ، ڕۆمانەکەت پەیوەندیی بەوەوە نییە کە بۆتدەگێڕاینەوە ئینجا بە پێکەنینەوە وتی بەڵام باشیەکەی لەوەدایە ئەمەیان زۆر باشترە لەوەی دەتگێڕایەوە.

نازانم لەو کاتەدا ناونیشانم بۆ ڕۆمانەکە دانابوو یان نا هەروەها ئایا کەی و لە کوێ و چۆن بە بیرمدا هات ئەو ناونیشانەی بۆ دابنێم هیچ کام لە هاوڕێکانیشم ئەوەیان بۆ دەستنیشان ناکرێ، ئەرێ هیچ مێژوونوسێکی خەیاڵ فراوان دەتوانێت باشەیەکم لەگەڵدا بکات و وەڵامێکی گونجاوم بۆ دابتاشێ؟

ئەو نوسخەیەی ئەلبارۆمۆتیس خوێندیەوە ئەوە بوو کە بە دوو جار ناردمان بۆ بۆینس ئایرس، وەلێ نوسخەی دووەم پاش چەند ڕۆژێ بۆ خۆی بردی بۆ هەمان شوێن لە یەکێ لە گەشتەکانیدا نوسخەی سێیەمیش ئەو هاوڕێیانەی لە تەنگانەدا لەگەڵمانبوون لەناوخۆیاندا دەیانهێناو دەیانبرد.

کە یەکەم نوسخەی چاپکراوی کتێبەکەمان لە مانگی یۆنیۆی 1967 بە دەست گەیشت، من و مارسیدس ئەو ڕەشنوسانەی ڕۆمانەکەمان دڕاند کە بیرا کۆپیەکانی لەسەرکردبوو، بە بیرماندا نەدەهات ئەو کات کە لەوانەیە لە هەموو نوسخەکان نرخی زیاتر بێت بەو هەموو هەڵەبڕیی و بە فەسڵی سێیەمی ڕۆمانەکەوە کە بە هۆی باراناو و پرۆسەی ئۆتوکردنی لاپەڕەکانیەوە نەدەخوێندرایەوە. لە ڕاستیدا هۆکاری ئەم دڕاندنە لەلایەن منەوە بێگەرد و دەستپاکانە بوو بەڵکو من ڕەشنوسەکەم دڕاند تا کەس نهێنی پیشەکەم نەزانێت و درکی پێنەکات. لەگەڵ ئەوەشدا لەو باوەڕەدام لە شوێنێکی ئەم جیهانەدا نوسخەی تری بە دەست نووسراوی ئەم ڕۆمانە هەیە بە تایبەتی ئەو دوو نوسخەیەی بۆ خانەی (ڕەشپێستەکانی ئەمریکا)م ناردن، هەمیشەش وای بۆچووم کە باکۆ بڕوا تا ئێستاش پاراستوونی بەڵام ئەو ئەمە ڕەتدەکاتەوە و منیش قسەی ئەوەم بەلاوە وەکو ئاڵتونە.

کە خانەی بڵاوکردنەوەکە ئەزموونی چاپی یەکەمی بۆ ناردم بە هەموو هەڵە بڕیەکانیەوە و بردم بۆ ئاهەنگێکی ماڵی بنەماڵەی ئەلکۆریسا، هۆکاری یەکەمی ئەمەش ئەوە بوو میوانی شەرەفی ئەو ئاهەنگە لویس بۆنیویل-ی دەرهێنەر بوو، بۆنیویل پێی وابوو هونەری ڕاستکردنەوەی هەڵە بە ئامانجی گەیشتن بە باشترین نییە هێندەی کە مەبەستی دۆزینەوەیە، ئاستی ئەو بەختەوەرییەم بینی کە لەسەر سیمای ئەلکۆریسا دەرکەوت بە هۆی ئەو گفتوگۆیەوە کە لە نێوان دوو میوانەکەیدا ڕوویدا بۆیە ڕاستەوخۆ بڕیارمدا ئەم نوسخە ئەزموونیەی چاپی پێشکەشبکەم.

ڕستەیەکم بۆ نووسی لە پێشکەشکەدا جانێت و لویس بە دووبارەیان دایە قەڵەم بەڵام وتیان ڕاستگۆیانەیە بۆم نوسیبوون (لە هاوڕێیەکەوە کە لە هەموو کەسێ زیاتری

خۆشویستوون لەم دنیایەدا) لە پاڵ ئیمزادا مێژووی 1967م نووسی.

لەوانەیە تەعلیقەکەی جانێت و لویس سەبارەت بە دووبارەیی ئەو رستەیەی لە پێشکەشەکەدا نوسیبووم بەهۆی ئەو پێشکەشەوە بێ کە لە کتێبێکی ترم نوسیبوو بۆ ئەلکۆریسا بەڵام پاش 28 ساڵ لەم ڕووداوە و پاش ئەوەی ڕۆمانی (سەد ساڵ لە گۆشەگیریی) ئەوەی بەدەستهێنا کە بەدەستی هێناوە و بەرەو ئاسۆ فڕی لە کۆبوونەوەیەکدا کە لە هەمان ماڵ کرا یەکێ لە ئامادەبووان وتی ئەو پێشکەشەی لەسەر چاپە ئەزموونیەکە نووسراوە سەروەتێك دەهێنێ، جانێت هەستایە سەر پێ و نوسخەکەی دەرهێناو پیشانی ئامادەبووانیدا، لێرەدا کۆریسا وەستاو دەستیکرد بە کێشان بە سنگی خۆیدا و بە دەنگێکی زوڵاڵ هاواریکرد:

-مردنم باشترە لەوەی ئەو دیارییە بە نرخەی هاوڕێیەکم پێشکەشی کردم و بیفرۆشم.

لە نێوان چەپڵە ڕێزانی هەمووآندا بەهەمان ئەو قەڵەمەی جاری پێشوو بە کارم هێنا لە ژێر پێشکەشەکەی یەکەمجاردا کە (28) ساڵ بەسەر نووسینیدا تێپەڕیبوو نووسیم دڵنیابووم، ساڵی 1985 و ئینجا جارێکی تر ئیمزامکرد و نووسیم گابۆ (بچووککراوەی گارسیایە).

ئەو بەڵگەنامەیە کە لە 180 پەڕە پێکهاتووە و 1026 چاککردنەوەی هەڵەی بە دەستوخەتی خۆم تێدایە لەبەرشەلۆنە دەخرێتە زیادکردنێکی ئاشکراوە بە بێ بەشداریکردنی من یان هیچ سودێك کە من لێی وەربگرم.

لەو باوەڕەدام پرۆسەیەکی تەواو شەرعیە وێڕای نیگەرانی هەندێ سەبارەت بە دەستەبەرکردنەوەی دوو نوسخەکەی تر کە لە بۆینس ئایرسن بە هەموو دەستکارییەکانی خۆمەوە. لە ڕاستیشدا ئەم دوو نوسخەیە هیچ راستکردنەوەیەکی بە دەستوخەتی خۆمی لەسەر نیە چونکە بە لیستێکی جیا دەمناردن بۆ خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەکە و بە مەکینەش چاپمکردبوون.

ساڵی 1992 لویس ئەلکۆریسا لە تەمەنی شەست ویەك ساڵیدا لە نێو ماڵەکەی خۆیدا لە بکورنایاکا گیانی لەدەستداو شەش ساڵ دوای ئەویش جانێت-ی هاوسەری کۆچی دوایی کرد

ئەوەی لە دڵم دەرناچێت لە نێو ئەم یادەوەرییانەدا ئەوەیە هەستم بە چەوسانەوە دەکرد چونکە جانێت و لویس ساڵەکانی کۆتایی ژیانیان بە موڵکدارێتیکردنی ئەو کاغەزانەوە بردە سەر کە هەزاران دۆلاریان دەکرد بەڵام قایل نەبوون بیفرۆشن لەبەرئەوەی دیاریی هاوڕێیەکیان بوو کە لەم دنیایەدا لە هەموو کەسێك زیاتر خۆشیدەویستن.

## تێبینیەکانی وەرگێڕە کوردییەکە

-کتێبی (غریق علی ارض صلبە) کۆمەڵە وتارێکی ڕۆژنامەوانیی ڕۆماننووسی ناودار گارسیا مارکیزە و مەها عەبدولرەئوف وەریگێڕاونەتە سەر زمانی عەرەبی و ساڵی 2002 لە قاهیرە دەزگای میریت بە چاپی گەیاندووە. کتێبەکە لە 16 وتاری ڕۆژنامەوانیی وەرگێردراو پێکهاتووە کە وەختی خۆی مارکیز لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاویکردونەتەوە ئەمەی وەرمگێڕاوە تەنیا یەکێکە لەو وتارانە و ناونیشانەکەی خۆی ئەمەیە (ڕۆمانێك ڕۆمانێك دەگێڕێتەوە).

-کلنتۆن لە کاتی هەڵمەتەکانی خۆکاندیدکردنیدا بۆ سەرۆکایەتی ئەمریکا وتی ڕۆمانی (سەد ساڵ لە

گۆشــەگیریی) باشـترین کتێبــە بــەلای منــەوە، واتــە لــە هەڵمەتەکانـدا نـاوی ئـەم ڕۆمانـەی بـەکارهێنا بـۆ ئـەوەی خەڵکی دەنگی بدەنێ.

-مەها کە وەرگێڕی ئەم کتێبەیە بۆ سەر زمانی عەرەبی لـە پـەراوێزی ئـەم وتـارە ڕۆژنامەنووسـییەی مـارکیزدا نوســیوویەتی: ئەگــەر چــی ئــەم ڕەشنوســە خرایــە زیادکردنی ئاشکراوە و ئومێد هەبوو کە بە زیاتر لە نیو ملیۆن دۆلار بفرۆشرێت بـەلام هێرشـە تیرۆریسـتیەکانی 11ی سـێپتەمبەر بـوو بـە هـۆی کشـانەوەی زۆربـەی ئەوانــەی کــە دەیانویســت بەهــەر نرخــێ بێــت ئــەم بەرهەمــەیان دەســتبکەوێت یــەکێ لەوانــە یــەکێ لــە زانکۆکانی ئەمریکا بوو هەروەها کابرایەکی فەرەنسیش کـە بـەهۆی لەدەسـتدانی ژمارەیـە لـە هاوڕێکـانی لـە کارەســاتەکەدا کشــایەوەو نــەیکڕی بۆیــە ئــەم بەرهەمە نەفرۆشرا چونکە هیچکام لە بەشداربووان لە توانایاندا نەبوو لەو نرخە نزیک بکەونەوە کە لەسەری دانرابوو.

## سەرچاوە

کتێبی (غريق على ارض صلبة)

غابریل غارسیا مارکیز

## بەبۆنەی یادی سەد ساڵەی دوا کۆچی چیخۆفەوە

# یادەورییەکانی گۆرکی

مەکسیم گۆرکی

لە فارسییەوە: ڕەوف بێگەرد

جارێکیان چیخۆف بۆ گوندی "کوچک کوی" میوانداری کردم، لەوێ پارچە زەوییەکی بچووکی هەبوو، خانوویەکی دووقاتی سپی تیا دروست کردبوو، کە "موڵك"ەکەی خۆی پیشاندام بە هەڵچوونو تاسەیەکی تایبەتییەوە کەوتە قسە: "دەزانیت ئەگەر پارەیەکی باشم هەبوایە ئێرەم دەکرد بە خەستەخانە بۆ مامۆستایانی نەخۆشو بێتاقەتی ئەم ناوە؟ ئەزانیت؟ ڤێلایەکی گەورەو ڕووناك، گەلێك ڕووناكو هەتاو گیر، بە پەنجەرەی گەورەو ژووری تایبەتەوە، کتێبخانەیەکی جوانیشم بۆ تیا ئەکردن، جۆرەها ئامێری مۆسیقاو کوورەی هەنگو باخێکی پڕ لە سەوزەو بێستانی پڕ لە میوەم بۆ دابین ئەکردن، کۆڕی تایبەتیم لەمەڕ پیشەی کشتوکاڵیو هەواناسییەوە بۆ ڕێك ئەخستن، پێویستە مامۆستا ئاگای لە هەموو شتێك بێت.. هەموو شتێك، هاوڕێی خۆشەویستم".

لە پڕا بێدەنگ بوو، کەوتە کۆکین، بە گۆشەی چاوی لێی ڕوانیمو زەردەیەکی هاتێ، زەردەخەنەیەکی ئارام کە تایبەت لە خۆی ئەهاتو بێ چەندو چوون مرۆڤی بۆ لای خۆی ئەکێشا، وای لێ ئەکردیت بە وردی گوێ لە قسەکانی بگریت، وتی: "خۆ بەم قسانەم بێتاقەت نابیت؟ چی بکەم بە تاسەوەم باس لە حەزو ئارەزووەکانی خۆم بکەم. ئەگەر ئەزانیت دێهاتی ڕووسی چەندە پێویستی بە مامۆستای چاكو لێزان هەیە! ئەبێ لە ڕووسیادا ژیانێکی تایبەتیو باش بۆ مامۆستا دابین بکرێت، تا وەکو مامۆستا زیاتر ئاسوودە بێت چاکترە، ئەبێ ئەو ڕاستیە بزانین کە ئەگەر یاسایەکی گشتیو فراوان بۆ گەل بەدی نەیەت، ئەوا ڕووسیا بەرەو نەمان ئەچێت. ئەبێ مامۆستا هونەرمەند بێت، کارەکەی خۆش بوێت، کەچی مامۆستایانی لای ئێمە لە ڕێبوار ئەچن، چاکیان دەرس نەخوێندووەو کە بۆ فێرکردن ئەڕۆنە گوند هەست بە

دوورخراوەیی ئەکەن، مامۆستایانی لای ئێمە برسین، بێتاقەتو ماندوون، لە ترسی لەدەستنەدانی نانی ڕۆژانەیان هەمیشە لە ترسو لەرزدان، لە کاتێکدا کە ئەبێت مامۆستا هەڵبژاردەو دەمڕاستی گوند بێت، جوتیارو دێهاتی حسابی تواناو کەسێکی لێهاتووی لێ بکەن، توانایەکی شایانی ڕێزو سەرنجڕاکێش، کەس پڕکێشی ئەوە نەکات بە چاوی سووکەوە لێی بڕوانێت، کەس نەتوانێت هاواری لێ بکاتو یان بەم شێوەیەی ئێستای لای ئێمە کە بەسەر مامۆستادا هاتووە بە سووکیو نزمیەوە تەماشای بکەن، بەم ڕەنگەی کە پاسەوانی دێ، دوکانداری ملهوڕو پارەدار، قەشە، بەڕێوەبەری مەخفەر، بەڕێوەبەری قوتابخانە، کوێخای دێو کاربەدەستێك کە ناوی سەرپەرشتیاری قوتابخانەی لە خۆی ناوەو بە کێشی گەردیلەیەك دڵی بۆ پەروەردەو فێرکردنی منداڵانی خەڵکی نەسووتاوە، هەموو ئەمانە لەگەڵ مامۆستادا خراپ ڕەفتار دەکەن. بە ڕاستی شەرمەزاریە، لەگەڵ کەسانێکدا کە پەروەردەو فێرکردنی خەڵکیان لە ئەستۆیە ئاوا گەمژانەو بە مووچەیەکی کەمی مەمرەو مەژی پاداشتیان بدەینەوە، زۆر نابەجێیە کەسێکی ئاوا بەرگی شڕو کۆنی لەبەردا بێت، لە قوتابخانە ساردو سڕەکانماندا لە سەرما هەڵ لەرزن، سەرما بیباتو هەر لە تەمەنی سیساڵیەوە تووشی ملەخڕەو باداریو ڕەشە سیل بێت، شەرمە، مامۆستای ئێمە ساڵی هەشت- نۆ مانگ وەك خەڵوەت نشینان کەسێکی نیە قسەی لەگەڵدا بکات، نە هاوڕێو نە کتێب، هونەرو سەرقاڵیەکی نیە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەوجترو تەوەزەل تر ئەبێت، ئەمە گاڵتەکردنە بە مرۆڤێك کە کارێکی لە ڕادەبەدەر گەورەی لە ئەستۆیەو ئەنجامی ئەدات. ئەزانیت من کە مامۆستایەك ئەبینم تەریق ئەبمەوەو لە شەرمو تەقیەی ئەو، لە بەرگە شڕەکەی شەرمەزار ئەبم.، وا هەست ئەکەم کە من هۆی بێچارەیی ئەو مامۆستایەم، باوەڕ بکە ئەمە بە ڕاستی ئەڵێم".

بێدەنگ بوو، کەوتە خەیاڵاتەوە، پاشان دەستی ڕاوەشاندو لە سەرخۆ وتی "ئەم ڕووسیا خۆشەویستەی ئێمە چ وڵاتێکی بەدبەختو پشتگوێ خراوە" تەمی خەمێك چاوە جوانەکانی داگرتو چرچێکی گچکەیش دەوری دا کە چاوی خەماویترو ڕاماوتر کرد، پاشان تەماشای ئەملاو ئەولای خۆی کردو بە گاڵتەوە وتی: "ئەبینیت لە ڕۆژنامەیەکدا وەك تیر وتارێکی توندوتیژتان تێ ئەگرم، وەرە بەرانبەر بەوەی کە بەو وتارە سەخڵەت نابن پیاڵەیەك چاتان پێشکەش بکەم".

ئەمە تایبەتمەندی ڕەوشتی چیخۆف بوو، لەو گەرمو گوڕیو پێداگرتنو مەیلی قسەکردنەوە لە پڕا پێکەنین بە خۆیو قسەکانی! لەو زەردەخەنە خەمبارو ئارامەوە مرۆڤ گومانی وردی فەیلەسوفێکی ئەبینی کە لە نرخی وشەو خەوو خەیاڵی بە ئاگایە، هەر لەو زەردەخەنەیەوە بڵێسەی خانەدانیو هەستیاریەکی قەشەنگ ئەدرەوشایەوە.

لەسەرخۆو بێدەنگ گەڕاینەوە ماڵێ، ڕۆژێکی گەرمو ڕووناك بوو، شەپۆلەکان لەبەر پرشنگی خۆرەکەدا ئەدرەوشانەوە، لە دامێنەوە دەنگی وەڕینی سەگێکی دڵخۆش ئەبیسترا، چیخۆف قۆڵی گرتم، کۆکیو لەسەرخۆ، وتی: "گەلێك کەس هەن ئیرەیی بە سەگ ئەبەن، ئەگەرچی ئەمە مایەی داخو شەرمەزاریە. بەڵام ڕاستی تیایە" یەکسەر بە پێکەنینەوە بە دوای قسەکانیدا چوو "قسەی ئەمڕۆم کورتو بێپێزن. لەوە ئەچێت پیر بووبم".

زۆرجار لێم ئەبیست: "ئەزانیت؟ مامۆستایەکی تازە هاتۆتە ئێرە، خۆی نەخۆشە،

ژنیشی هەیە، ناتوانیت کارێکی بۆ بکەیت؟ ئێستا من کارێکم بۆ ڕەخساندووە، یان ئەیوت: "گوێ بگرە گۆڕکی، مامۆستایەك لێرەیە ئەیەوێت بتبینێت، خۆی ناتوانێت لە ماڵ بێتە دەرەوە چونکە نەخۆشە، ناتەوێت بچیت بیبینیت؟ ئەم کارە بکە" یان ئەیوت: "بڕوانە.. مامۆستا ئافرەتەکانی ئێرە پێویستیان بە کتێبە، ئەبێت بۆیان بنێرن".

جارجاریٚ دەچوومە ماڵی ئەو مامۆستایە، مامۆستاکە خووی وا پێوە گرتبوو لە کەناری کورسیەکە دائەنیشت، چونکە دەیزانی گەوجەو هیچی پیٚ نیە، ڕەنگی دەبزڕکاو ئارەقە دەکەوتە ناوچاوی، لەو کاتەدا کە ئارەقەی ئەڕشت و شەرمی ئەهاتیٚ وشەکانی هەڵئەبژاردو هەولی ئەدا بە ئەدەبەوە قسە بکات. کە ئەکەوتە حاڵو بارێکەوە تەواو خۆی لەدەست بدات هەولی ئەدا جارێکی دی سەقامگیر بێتەوە، وا بیری بخاتەوەگەڕ کە لە بەردەم نووسەرێکی گەورەدا گەوج نەیەتە بەرچاو، بە زنجیرە پرسیارێکی هیچ و پووچ چیخۆڤ ناڕەحەت کرد، پرسیار گەلێك کە تا ئەودەمەی تەنانەت بۆ جارێکیش بە خەیاڵیا نەهاتبوو یان هەر بیری لێنەکردبوونەوە.

چیخۆڤ بە وردی گوێی لە قسە بیٚ سەرەو بەرەو بێزارکەرەکانی ئەگرت، جار جار بزەیەك لە چاوە خەمگینەکانیا ئەدرەوشایەوەو چرچ و لۆچی دەخستە سەر نێوچەوانی، پاشان بە دەنگێکی نەرم و سادە ئەکەوتە قسەکردن، وشەکانی ڕوون و ئاسایی بەکارئەهێنان، قسەکانی زۆر زوو بەرانبەرەکەی لە ڕواڵەت بازیو خۆدزینەوەوە ئەهێنایە سەر سادەیی. ئیتر مامۆستاکە هەولی نەئەدا خۆی وا نیشان بدات کە زانایە، بۆیە بە زوویی هوشیارو سەرنجڕاکێش ئەهاتە بەرچاو.

مامۆستایەکم لە یادە بالأبەرزو لاواز، ڕەنگ زەردو بێحاڵ بوو، لووتی درێژو بەرەو چەناگەی چەمابووەوە، بەرانبەر چیخۆف دانیشتبوو، بە چاوە ڕەشەکانی لێی وردئەبووەوەو بە دەنگێکی بەرزی خەماوییەوە ئەیوت: "لەبەرئەوەی ئەم جۆرە دیاردانە دەوری فێرکردن و خوێندنیان تەنیوەو، لەگەڵ گیروگرفتی تەندروستیا خۆ دەنوێنن، بۆیە هەر چارەسەرێکی ئەم کۆبوونەوەو ڕاوێژانە ناگەنە ئەنجام و ئاڵۆزتری ئەکەن. لە پڕا مامۆستاکە کەوتە جەرگەی فەلسەفەوەو وەك سەرخۆشێك لەسەر شەختە یاری بکات سەرگەردان کەوتە باسی ڕووی دەرەوەی فەلسەفە. چیخۆف لەسەرخۆو بە خۆشەویستی وتی: "پێم بڵیٚ بزانم لای ئێوە مامۆستایەك هەیە لە منداڵان ئەدات کێیە؟" مامۆستاکە ڕاپەڕیو بە توورەییەوە کەوتە پەنجە ڕاوەشاندن و وتی: "مەبەستتان کێیە؟ من ئەڵێن؟ هەرگیز، من و لێدان؟" مامۆستاکە بەخۆ سەخڵەت کردنەوە کەوتبووە دەنگە دەنگ. چیخۆف بە دڵنیاییەوە زەردەخەنەیەکی هاتیٚو لەسەر قسەکانی ڕۆشت: "توورە مەبە، ئێوەم مەبەست نەبوو، بەلأم لە بیرمە، لە ڕۆژنامەدا خوێندمەوە کە لە ناوچەکەی ئێوەدا مامۆستایەك هەیە لە منداڵە قوتابیەکان دەدات" مامۆستاکە دانیشت، ئارەقەی ناوچاوی سڕی، هەناسەیەکی ئاسوودەی داو بە دەنگێکی بەرزو قووڵەوە وتی: "ڕاستە، شتێکی وا هەبوو، ئەو مامۆستایە ماکارف بوو، بەلأم ئەزانیت ئەمە جێگای سەرسوڕمان نیە، ڕاستە لێدان کارێکی ستەمکارانەیە، بەلأم ئەمە قابیلی ڕوونکردنەوەیە. ماکارف ژنی هەیە، چوار منداڵی سەروپێچکەی هەیە، ژنەکەی نەخۆشە، خۆیشی سیلیەتی، تەنیا بیست ڕۆبڵ مووچە وەرئەگرێت، قوتابخانەکەی ئەڵێی کاروانسەرایە، خۆیشی لە ژوورێکدا، لە تەنیا

ژوورێکدا دەژی، جا کە یەکێك ئەمە ژیانی بێت، ڕەنگە ئەگەر فریشتەی خوایشی بکەوێتە بەردەست دایپڵۆسێت. منداڵانیش! باوەڕت بێت زۆر لەوە دوورن کە فریشتەبن".

ئەو پیاوەی پێش کەمێك بێبەزەییانە چیخۆڤ بە قسەی زلو هەراو زەنا داگرتبوو، لەپڕا لووتە لارەکەی سڕیو دەستی دایە ئەوەی کە سادەو گرانو ڕوون قسە بکات، لە نێوان وشەکانیەوە وەك ئاگرێکی درەوشاوە ڕاستیە سەرسوڕهێنەرو نەفرەتیەکانی ژیانی ئەو گوندە رووسیە ئاشکرا ئەبوو. کاتێ ماڵئاواییمان لە خانەخوێکەمان کرد، دەستی چیخۆڤ خستە ناو هەردوو دەستە لاوازەکانیەوەو وتی: "کە هاتمە لاتان وەك ئەوە بوو بەرەو لای سەرۆك کارەکانم بڕۆم. ترسامو لەرزیم، وەك نێرە قەل فووم لە خۆم کرد، ویستم وا خۆم دەربخەم کە مرۆڤێکی ئاسایی نیم، بەلاّم ئێستا لە ماڵئاواییکردندا ئەڵێی لە هاوڕێیەکم جیائەبمەوە کە دۆستێکی هەرە نزیكو میهرەبانەو هەموو شتێکیش ئەزانێت، سوپاست ئەکەم، من ئەم یادگارە شیرینە لە یاد ناکەم کە پیاوانی گەورە سادەنو زووتر مرۆڤ لە مەبەستیان ئەگاتو، لە تەواوی ئەو ناپەسەندانەی کە ئێمە لەناویاندا ئەژین، بە دڵی خەڵك، بە دڵی مرۆڤ نزیکترن.. خوات لەگەڵ، هەرگیز تۆ لە یاد ناکەم" لوتی لەرزی، زەردەخەنەیەك لێوی لە یەکتر ڕەواندەوەو لەپڕا کەوتەوە دوای قسەکانی:

"لە ڕاستیدا ئەو ناپەسەندانەیش مرۆڤێکی بەدبەختن، خوا بیانباتەوە بۆ خۆیو ئاسوودەبن".

کە مامۆستاکە ڕۆیشت چیخۆف چاوی لە دوای بوو، زەردەیەکی هاتیو وتی: "مرۆڤێکی چاکە، بەلاّم تا سەر مامۆستایی ناکات".

-بۆ؟

-لە کاری ئەخەن، دارئەدەن بە ڕۆحیدا.

کەمێك بێدەنگ بوو، لەسەرخۆ کەوتەوە قسە: "لە ڕووسیادا پیاوی بە شەرەف وەك دووکەڵ کێشی زۆرپا وایە، دایکەکان منداڵەکانیانی پێ ئەترسێنن".

ڕای من وایە کە لە بەردەم چیخۆفدا هەموو کەسێك حەزی بەوە بوو سادەو ڕاستگۆیانەتر بێتو خۆی لە ڕاستیا چۆنە وایش بێتە بەرچاو، زۆرجار ئەو کەسانەم ئەبینی کە لای دائەنیشتن وازیان لە وشەی قەبەو بریقەدارو ڕستەی ناو کتێبو پف هەڵدراو ئەهێنا. وشەو ڕستەو هەموو ئەو شتە دەستکردە بێسەرمایانەی کە ڕووسییەك حەزدەکات بە خۆیانیەوە ببەستێت تا وەك ئەوروپاییەك لە قەڵەم بدرێ، وەك ئەو تیرەو خێڵە کێویانەی بە "گوێچکە ماسی" و "سەدەف" خۆیان ئەڕازێننەوە. ئەنتۆن چیخۆف لە "گوێچکە ماسی"ی و "پەڕی کەڵەشێر" و "مووروە کەرانە" بێزار بوو، هەر شتێکی بێگانەی پڕ لە زەرقو بەرق، کە خەڵك بە خۆیانەوە ئەبەست تا لەبەرچاو گەورە بنوێنن چیخۆفیان ناڕەحەتو بێزار ئەکرد. لە بیرمە هەرکاتێ زەلامێکی بەو جۆرە بەرگەوە بدیایە حەزی ئەکرد ئەو مرۆڤە بێچارەیە لە شەڕی ئەو پوولەکەو ڕەختە بێسوودو ناڕەحەتکەرە ڕزگار بکاتو لەژێر ئەوەدا بەرگە واقیعیەکەو گیانە ڕاستەقینەکەی بدۆزێتەوە، چیخۆف تەواوی تەمەنی بەو گیانە واقیعیەی خۆیەوە بەسەر برد، چۆن بوو وا ژیا، هەمیشە خۆی بوو، تەواو جوامێر. خۆی بەوەوە ماندوو نەئەکرد خەڵکانی ئەتەکێت باز چیان لێ ئەوێتو ئەیانەوێت چۆن بێت؟ هەرگیز خۆشی لەو قسەو گفتوگۆیانە نەئەهات کە لە بارەی باسو خواسی قووڵی دوور لە زەینەوە ئەهاتنە گۆڕێ، ئەو قسانەی کە هاوشاریە ئازیزەکانمان تەسەلای

خۆیانی پێ ئەدەن و ئەوە لە یاد ئەکەن کە ئەوانە قسەی گەمژانەیەو بە هیچ جۆرێك جێگیر نین. سەیرە.. مرۆڤ قسە لەسەر ئەو جلکە مەخمەڵیانە بکات کە لە دوا ڕۆژدا ئەیکڕێت و کەچی ئێستا تەنانەت شەرواڵێکی ئاسایی لە پێدا نەبێت!!

چیخۆف چونکە خۆی بێئەندازە سادە بوو هەموو شتێکی سادەی خۆش ئەویست، ڕاستی و پاکی لا پەسەند بوو، ڕەفتارێکی وایشی دەنواند کە هەموو کەسێك لە ڕوویا ڕاست و پاك بێت. لە یادمە ڕۆژێك سێ ئافرەت کە بەرگی ئاڵو والایان لەبەردا بوو هاتنە بینینی. خشەخشی تەنورەی ئاوریشمیان ژوورەکەی پڕ کرد. بۆن عەترێکی تیژیشیان لە هەوادا بڵاوکردەوە، بە ئەدەبەوە بەرانبەر خانەخوێکەیان دانیشتن، خۆیان وا نیشان دا کە حەزیان لە باسی سیاسەتەو یەکسەر کەوتنە پرسیارکردن.

-ئانتۆن پاڤلوڤیچ چۆنی بۆ ئەچیت؟ شەڕ چۆن کۆتایی پێدێت؟

ئانتۆن پاڤلۆڤیچ کۆکی، کەمێك بیری کردەوە، پاشان لەسەرخۆو بە دەنگێکی گەرم و جیدییەوە وتی:

-بێگومان ڕێ ئەکەون.

-بەڵێ، بێگومان! بەڵام کێ شەڕەکە ئەباتەوە؟ یۆنانی یان تورك؟

-بە ڕای من کێ بەهێزبێت سەرئەکەوێت.

-لای ئێوە کامیان بەهێزترن؟

-ئەوانەی چاکتریان خواردووەو چاکتریش پەروەردە کراون.

یەکێك لە خانمەکان هاواری لێهەستا "چەند هوشیارە!".

یەکێکی تریان پرسی:

-تۆ حەز بە کامیان زیاتر ئەکەیت؟

ئانتون پاڤلۆڤیچ بە گەرمی سەرنجی دایەو بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: "حەزم لەو میوەهاتانەیە کە ئەکرێنە ناو شیلەی شەکرەوە.. ئەی ئێوە چۆن؟" خانمەکە بە خۆشحاڵیەوە وتی: "بە تایبەتی میوەهاتەکەی کۆگای ئابرکوسوف" سێیەم بە نیوە چاو لێکنانێکەوە دەمی پڕبوو لە ئاوو وتی: "زۆر بۆنیان خۆشە". هەرسێکیان بە شەوقێکی تایبەتیەوە کەوتنە قسەو شارەزاییەکی تەواویان لە بارەی نوقڵی میوەوە نیشاندا، دیاربوو هەرسێکیان بەو کاتە خۆشحاڵ بوون کە ئەیانەوێت بە بیانووی ئەوەی گوایا زەوقی سیاسیان هەیەو لە مەسەلەی تورکیاو یۆنان ئەدوێن سەری خۆیان بیەشێنن. مەسەلەیەك کە تا ئەو کاتە هیچ کامیان کەمترین خەیاڵیان لێ نەکردبووەوە. کە ویستیان بڕۆن بەڵێنیان بە چیخۆف دا کە "نوقڵی میوەتان بۆ ئەنێرین". کە ڕۆیشتن من وتم: "زۆر چاك باسەکەت گۆڕی" چیخۆف لەسەر خۆ پێکەنی و وتی: "پێویستە هەرکەسێك بە زمانی خۆی قسە بکات" جارێکی دی لە ماڵی چیخۆف لاوێکی جوانم بینی دادوەرێکی تزاری بوو، ڕێکوپێك ڕووبەڕووی چیخۆف دانیشتبوو. سەری ڕائەوەشاندو هوشیارانە قسەی ئەکرد:

"ئانتوون پاڤلۆڤیچ ئێوە لە چیرۆکێکتاندا مەسەلەیەکی ئاڵۆزتان بەرەو ڕووی من کردۆتەوە، ئەگەر من دان بەوەدا بنێم کە "دنیس گریگۆریف" مەبەستی خراپ و بەدە، ئەبێ بۆ پارێزگاری لە سوودی کۆمەڵ زوو ڕەوانەی بەندیخانەی بکەم، بەڵام ئەو نەزان و بێ عەقڵە، نازانێت کارەکەی تاوانەو خراپەکاریە، پیاو دڵی پێ ئەسووتێ، بەڵام تۆ بیر لەوە بکەرەوە کە ئەگەر من بە پیاوێکی نەزانی دابنێم و خۆم بدەمە دەست هەستی مرۆڤایەتی و بەزەیی پێداهاتنەوە، لەم حاڵەدا چۆن

ئـەتوانم لـەوە دڵنیـابم کـە "دنـیس" جـارێکی دی بزمـــارو بـــورغی ڕێگـــای ئاســـن ناکاتـــەوەو شـەمەندەفەرێکی تیا ناچێت؟ لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ کە ئەبێ چی بکەین؟".

دادوەرەکە قسەکانی ڕاگرت، خۆی خستە سەر کورســـیەکەو ڕوانینـــە پـــڕ لـــە پرســـیارەکانی بـــە دەموچاوی چیخۆفەوە دووری. جلەکانی تەواو نوێ بـــوون، قۆپچـــەی کراســـەکەی بـــە سەرســـنگیەوە ڕێکوپێـــك ئەدرەوشـــانەوە، چـــاوە وردەکـــانی چـیخۆفیش بـە دەموچـاوە پـاكو جوانەکـەی لاوە دادوەرەکـەوە درەوشـانەوەیەکی تایبـەتی هـەبوو. ئـانتۆن پـاڤلۆڤیچ پێـی وت: "ئەگـەر مـن دادوەر بوومایە (دنیس)م بەرەڵا ئەکرد".

—بە چ بەڵگەیەك؟

—پـــێم ئـــەوت "دنـــیس تـــۆ هێشـــتا نەگەیشـتوویتەتە پلەوپایـەی ئـەو کەسـەی کـە بـە دەسـتی ئانقەسـت تـاوان ئـەکات، بـڕۆو بیگـەڕێ!" دادوەری لاو پێکەنی، بەڵام زوو کەوتە خۆیو وتـی: "نـا قوربـان ئـەو پرسـیارەی تـۆ کردووتـە ئـەبێ لـە لایـەن منـەوە وەڵام بدرێتـەوە، مـن کـە پارێزگـاری لـە سـوودو قـازانجو گیـانی خـەڵکی ئەکـەم، دنـیس بـێ عەقڵە بەڵام تاوانباریشە، ئەمە واقیعە".

ئـــانتۆن پـــاڤلۆڤیچ لـــە پـــڕا بـــە دەنگـــە نەرمەکـەی لێـی پرسـی: "تـۆ حـەز لـە گرامـافۆن ئەکـــەیت؟" بـــە خۆشـــیەوە وەڵامـــی دایـــەوە "بـەڵێ، بێگومـان زۆریـش، داهێنـانێکی سـەیرە" ئانتۆن پاڤلۆڤیچ بە نائومێدییەکەوە وتی: بەڵام من حەزی لێناکەم".

—بۆ؟

—قسەی تیا ئەکەنو گۆرانی تیا ئەڵێن، بەڵام هەستو ڕۆحی تیانیە. هەر شتێك وەك کاریکاتێر بێتـە بەرچـاو مـردووە. ئـەی ئێـوە حـەزتان لـە وێنەگرییە؟

وا دەرئەکـەوت کـە دادوەر شـەیدایەکی بـێ قـەراری وێنـەگری بێـت، چـونکە یەکسـەر بـەو شـەوقەوە کەوتـە دوانو قسـەکردن لەسـەر وێنـەو وازی لـە گرامـافۆن هێنـا، چـیخۆف زۆر بـە وردی پێشـــبینی ئەمـــەی کردبـــوو. بۆیـــە کـــەوتبووە ڕەخنـەگرتن لـە "داهێنانـە سـەیرەکە"ی و ئەوەیشـم هەست پێکـرد کـە لـەو بەرگـە تایبەتیـەدا ئـەو لاوە هەرزەیـە چالاکانە تـەنیا لـەشو لاری دەرئـەخاتو هەسـتی بەرانبـەر بـە ژیـان هێشـتا وەك هەسـتی تانجیەکی ڕاویە.

کە چیخۆف لە ڕەوانەکردنی بووەوە بە توندی وتـــی "ئەمانـــە کـــە لەســـەر کورســـی دادوەری دانیشـتوون وەك سـەرەڕۆیی لاوێـك کـە لـە جوانیـا ناکامڵن ئاوا بێجـێ دێنە بەرچاو، چارەنووسـی ئـەم خەڵکـە لـە دەسـتی کێدایـە!" پـاش کـەمێك بێـدەنگ بوون وتی "من وای بۆ ئەچم کە دادوەرەکانی تزاری زۆریـان حـەز لـە ڕاوە ماسـیە، بـە تایبـەتی ماسـیە بچووکەکان".

ئەمە هونـەرێکی تایبـەتی چیخۆف بوو، کە لە هـەموو شـوێنێکدا پـەردە لەسـەر ڕسـوایی (ابتـذال) لاداتو لەگەڵیا بجەنگێت. ئەمە پیشەی مرۆڤێکە کە داوای زیـاتر لـە ژیـان ئـەکاو ئارەزوویـەکی گـەرمی هەیـە بۆئـەوەی مرۆڤـەکان سـادە، جـوانو گونجـاو لەگـەڵ یـەکتردا ببینێـت، هەمیشـە دەستنیشـانی ڕسوایەتی ئەکردو بێبەزەییانە سەرکۆنەی ئەکرد.

لـە بـەردەمی چـیخۆفدا بـاس لـەوە کـرا کـە "خـاوەن گۆڤارێکی بە نـامێ کە هەمیشـە لـە بارەی خۆشەویستیو بەزەییەوە قسـەی کـردووە. بـێ هـیچ پاسـاوێك کرێکـارێکی ڕێگـای ئاسـنی داوەتـە بـەر جـوێن. بـەردەوامیش بـە مـل هـوڕیو بـێ چـاوو

ڕوویانە لەگەڵ ژێردەستەکانیدا ڕەفتار ئەکات" ئانتۆن پاڤلۆڤیچ بە زەردەخەنەیەکی خەمبارانەوە وتی: "بۆ لە چینێکی ئەشراف نیە؟ ئەی بۆ پیاوێکی بە تەربیەت و خوێندەوار نیە؟ لە قوتابخانە خوێندوویەتی، باوکی باشترین پێڵاو لەپێ ئەکات و خۆیشی بەردەوام پێڵاوەکانی بریقەدارن" لە ئاهەنگی قسەکانی چیخۆفدا دەرئەکەوت کە ئەو پیاوەی لە چینی (ئەشراف)ە بێ ئەندازە نزم و گەلۆرە. بەم شێوەیە یادی ڕۆژنامەنووسێکی ئەکردەوە "مرۆڤێکی وریایە، هەمیشە زۆر شەرافەتمەندانە، مرۆڤ دۆستانە شت ئەنووسێت، لە بەردەمی خەڵکیدا بە (گەمژە) بانگی ژنەکەی ئەکات، ژووری نۆکەرەکانی شێدارەو کارەکەرەکانیشی بەردەوام تووشی نەخۆشی ڕۆماتیزم دێن" لێیان پرسی جەنابی -ن-ن-ت خۆشی ناوێ؟ ئانتۆن پاڤلۆڤیچ بە دەم کۆکینەوە وتی: "بۆ.. گەلێکم خۆشدەوێت، مرۆڤێکی ئاساییە، لە هەموو شتێکدا لە پێشەوەیە، زۆری کتێب خوێندۆتەوە، سێ کتێبی منی بردووەو بۆی نەگەڕاندوومەتەوە، هەستی کەمێك پەرتە، ئەمڕۆ پێتان ئەڵێت ئێوە مرۆیەکن لە پلەی یەکەمداو سبەینێ لە پاشملە پێتان ئەڵێت ئێوە کڵاو ئەکەنە سەر نۆکەرەکانتان و گۆرەوی ئاوریشمینی مێردی ژنە دۆستەکانتان ئەدزن، پیشانیشیان ئەدات، گۆرەوی ڕەش کە بە ئۆیەی شین ڕازاوەتەوە.

یەکێك لای چیخۆف لە بارەی گۆڤارە مانگانەییەکانەوە دوا کە چەندە بەشە جیدیەکانی گران و بێزارکەرن. ئانتۆن پاڤلۆڤیچ وتی: "نابێت ئێوە ئەو وتارانە بخوێننەوە، ئەوانە ئەدەبیاتی هەڤاڵانن و بۆ ئەوان نووسراون، ئەو بەڕێزانە سورو ڕەش و سپی ئەو وتارانەیان بەسەریەکدا کردووە، یەکێکیان وتارێك ئەنووسێت، یەکێکی دی وەڵامی ئەداتەوە، سێیەمیش جیاوازی و دژایەتی بۆ هەردووکیان هەڵئەبەستێت، وەك یاری لەگەڵ لاڵدا بکەن وایە، لە ڕاستیا ئەمە ئاو لە دەسکەواندا کوتانە، هیچپیشیان بیر لەوە ناکەنەوە کە ئەم دەوەن بە ئاشە چ سوودێك بە خوێنەر ناگەیەنێت؟".

ڕۆژێك ئافرەتێکی جوان و شۆخ هاتە لای چیخۆف، چاك لەگەڵیا کەوتە قسەکردن "ژیان گەلێك ناخۆشە، هەموو شتێك تاریك و لێڵە مرۆڤ، دەریا، گوڵ لەبەرچاومدا ڕەشن، هیچ ئارەزوویەکم لە دڵدا نیە، گیانم لە ڕەنج و ئازاردایە، ئەڵێی نەخۆشم" ئانتۆن پاڤلۆڤیچ بە دڵنیاییەوە پێی وت: "بەڵێ تۆ نەخۆشیت، بە زمانی لاتینی بە نەخۆشیەکەت ئەڵێن موربوس فراد لنتوس (واتا نەخۆشی درۆبازی) خۆشبەختانە ئافرەتەکە زمانی لاتینی نەدەزانی یان هەر خۆی لێ گێل کرد. کە باسی ڕەخنەگران دەکرا چیخۆف زەردەخەنەیەکی زانایانەی ئەهاتە سەرلێو و ئەیوت "ڕەخنەگران وەك مێشی ئەسپ وان. ئەیانەوێت ئەسپ لە کاربخەن، ئەسپ لە کاری خۆیدایە، تەواوی ماسولکەکانی وەك ژێی کەمانچە کشاوە، لە پڕا مێشوولەیەك بە ویزە ویز دێت و لەسەر کلۆکی دەنیشێتەوە، ئەسپەکە ناچارە پێستی کرژ بکات و کلکی بجووڵێنێت، ئیتر تەواوی گیزە گیزی مێشوولە بۆچی؟ خۆیشی بە چاکی ئەمە ئەزانێت، بەڵام ئاشکرایە، چونکە ئەو مێشوولەیە ئارام ناگرێت و ئەیەوێت بڵێ: تەماشام بکەن منیش لەسەر ئەم زەمینە گیانداریکم و هەم و ئەتوانم ویزە لەگەڵ هەموو شتێکدا بکەم. بیست و پێنج ساڵە ئەو ڕەخنانەی لە بارەی چیرۆکەکانمەوە نووسراون ئەیانخوێنمەوە، لە بیرم نایەت گوێم لە سەرنجێکی بەنرخ یان وشەیەك بووبێت کە ڕێنماییەکی شایستەم بکات، تەنیا جارێك (ئەسکا بیچووسکی) شتێکی نووسی کاری لێکردم، نووسیبووی "کە من

لـە ئەنجامــدا زۆر بەدەمەســتانەو خــراپ ئەکەومــە شیوەڵۆکێکی نابووتەوەو تیایدا ئەمرم".

بەردەوام زەردەخەنەیەکی پڕ لە خۆشەویستی لە چاوە خۆڵەمێشیەکەیەوە ئەدرەوشایەوە، بەڵام کاتی وا ئەهاتە پێش کە چاوی ساردو سەخت تر بنوێنن، لەو شوێنانەدا دەنگی جەسووریو نەرمی ئـاوازێکی سـەخت تـری لـە خـۆی ئـەگرتو ئـەوە دەرئەکـەوت کـە ئـەو مرۆڤـە ئـارامو بـە ڕەوشـتە، لـە کاتی پێویستا ئەتوانێت دژی هێزە ناجۆرو گێلەکان ڕاپەڕیو هەرگیز خۆی بە دەستەوە نەدات. هەندێ جاریش وام ئەبینی کە سەرنجی بەرانبەر بە خەڵکی پڕە لە هەستی نائومێدی، نائومێدییەکی پڕ زەبری خۆ بەدەستەوەدان، جارێك وتـی: "ئـەم ڕووسـیانە خــەڵکانێکی ســەیرو ســەمەرەن، وەك بێــژنگ وان هیچیان تیا ناوەستێت، لە لاویدا سەرگەرمی ئەوەن دەم و دەستیان پڕبکەنو لە سی ساڵیدا بێجگە لە (زبڵـدانێکی پـیس) هـیچ تـری تیـا نەماوەتـەوە، بـۆ ئـەوەی شـاد بێـتو وەك مـرۆڤ ژیـان بەسـەر بـەرێت پێویستە کاربکات، بە برواو دڵسۆزییەوە کاربکات، بەڵام ئێمە، ئێمـە ناتوانین ئـەم کـارە بکـەین. تـەواوی تەمـەنی لەگـەڵ قومـاردا بەسـەرئەبات، یـان لەوانەیـە جێگایـەکی تـری لـە پشـت پـەردەوە بـۆ خـۆی پەیـدا کردبێـت، پزیشـکی ڕوسـی هـەر ئەوەنـدەی کەوتـە ژیـانی کارەکەیـەوە ئـیتر گـوێ بـە زانسـت نـادات، بێجگە لە گۆڤاری پزیشکی کتێبی تر ناخوێنێتـەوە، لـە چل ساڵیا بـە تـەواوی دێتـە سـەر ئـەو ڕایـەی کـە سەرچـاوەی هـەموو نەخۆشـیەکان سـەرمایە، مــن هــەرگیز کــارگوزارێکی ئیـداری وام نـەدیوە کـە بـە ڕاسـتی لـە مانـاو ئامـانجی کارەکـەی گەیشـتبێت، ئاسـایی کارگوزارەکـان لـە پایتـەختو شارۆچـکەو شــارە گەورەکانــدا نــاجوڵێنو بــۆ جێــی تــر دوورناکەونـەوە، لـەوێ ئـەژینو خـەریکی ڕۆتیـنن.

نامە بۆ (زمیف) یان (سورگون) ئەنێرن کە "سەرنج بدرێتە ناوەرۆکی ئەو نامانە" ئەبێ چییان تیابێت؟ ئـەو نامانـە بـۆ ئـەوەن کـە خـەڵکی دی لـە ڕاپـەڕینی ئازادیخوازانــە بێبــەری بکــەن، لــە ڕاپــەڕینێك کــە کارمەنــد بایــەخی نـاداتیو بـڕوای پێــی نییــەو خەیاڵیشــی لــێ قەدەغــە کــردووە، هــەر تــەواو وەك گومڕایــەك کــە بــڕوای بــە مــالیکی دۆزەخ نیــە، پارێزەرێـك کـە لـە داوایەکـدا سـەرئەکەوێتو ناوێـك دەرئـەکات ئـیتر گـوێ بە دادپـەروەری نـاداتو تـەنیا بـیر لـە مـاڵو دەسـتکەوت دەکاتـەوە، بێجگـە لـە قوماربـازیو خواردن کـاری تـر ناکـات، خۆیشـی بـە کەسێکی زاناو دیـاری ئـەوتۆ دەزانێت کە شـارەزای ڕازی هەموو هونەرەکان بێت. ئەکتەرێکی شانۆ هـەر ئەوەنـدەی یـەك دو جـار دەورەکـەی بـە چـاکی بینی ئیتر بۆ دەورەکانی دی خۆی ماندوو ناکات. کڵاوی ئاوریشمین لەسەر ئەنێو خۆی بە بلیمەت ئـەزانێت، ڕووســیا وڵاتــی مرۆڤــی برســیو تەمەڵــە، وڵاتــی کەسانێکە کە هەرگیز تێر ناخۆن، خواردنی بە تام ئـەخۆن، ئـەیش خۆنـەوە، حـەز ئەکـەن بـە ڕۆژیـش بخەونو لە خەودا بپرخێنن، ژن ئەهێنن تا یەکێکیان هــەبێت ماڵەکــەیان بــۆ بــەڕێوە بــەرێتو، هــاوڕێ ئـەگرنو ئەیانـەوێت لـەناو کـۆڕو کۆمەڵـدا پلەوپایـە بەدەســەت بهێــنن. تەبیعــەتو نەفســیەتی ســەگیان هەیە، کە لێیان بدەیت بە سەختی ئەکەونە قروسکە قروســكو ڕائەکەنــە نــاو کولانەکانیانــەوە، کــە نازیشـیان ئـەدەیتێ لەسـەر پشـت ئەخـەونو لنگیـان ئەکەنە حەواو کلکە لەقێ ئەکەن".

سـەر کۆنەیـەکی بـە ئـازارو سـارد لـە دووتـوێی ئـەم قسـانەدا بـوو، بـەڵام چـەندە سەرزەنشـت بـوو ئەوەنـدە بـە داخو خەفەتـەوە ئـەوتران. بـە ڕاسـتی چیخۆف ئازاری پێوە ئەکێشانو هـەرگیز مەبەستی سووکایەتیپێکردن نەبوو، چونکە ئەگەر لە بەردەمیا

بە خراپی باسی یەکێك بکرایە ئانتۆن پاڤلۆڤیچ بەرگری لیَ ئەکردو ئەیوت: "بۆ وا ئەڵێی؟ ئەو پیرە، تەمەنی حەفتا ساڵە" یان ئەیوت: "ئەو هێشتا هەرزەکارەو لە نەزانینەوە ئەمەی کردووە" کاتێکیش کە بەم جۆرە ئەدوا هەرگیز نیشانەی گاڵتەو سووکایەتی پێکردن بە ڕوویەوە دەرنەئەکەوت".

لە تاڤ لاویدا ڕسوایی لای مرۆڤ کارێکی نابەجیَو بێبایەخە، بەڵام وردە وردە ڕسوایی دەستی بە سەرا ئەگریَو ئەبێتە فرمانڕەوای، وەك ژەهر یان نەخۆشیە خنکێنەرەکان کار لە مێشك و خوێنی ئەکات، لەم کاتەدا مرۆڤ دەبێتە تابلۆیەکی ڕێنمای پڕ لە گەردو خۆڵ کە شتێکی لەسەر نەخش کراوە، ئەو نەخشەیە چیە؟ هەرگیز ناتوانرێت سەری لیَ دەربکرێت. ئانتۆن چیخۆف تەنانەت لە چیرۆکە بەراییەکانیشیدا زۆر لێهاتوانە دەریای ڕەش و نالەباری ڕسوایی باسکردووە، ئەوەندە بەسە کە چیرۆکە خۆشەکانی بە وردی بخوێنیتەوە تا بزانیت چەند مەبەستی ناجۆرو قێزەونی لەژێر پەردەو وشەی بە تامدا کردۆتە گاڵتەجاڕ، لە کاتێکدا کە نووسەر زۆر لەسەرخۆ لە ئاشکراکردنی ڕاستەوخۆیان خۆی پاراستووەو نەیدرکاندوون.

چیخۆف سادەو شەرمن و کەم ڕوو بوو، بە دەنگی بەرزو ئاشکرا بە خەڵکی نەئەوت: "ئیتر شەرم بکەن" بێهودە ئومێدی ئەوەی هەبوو خەڵکی خۆی بگاتە ئەوەی کە شەرم بکات، لە ناپاکی و ڕسوایی تەواو بێزار بوو، ناڕەوایی و پەشێوی ژیانی بە زمانی شاعیرێکی شەریفەوە ئەوت، لە کاتێکدا کە زەردەخەنەیەکی گاڵتەئامێزو شیرینی لەسەر لێو بوو، کەچی لە پشت شێوە جوانەکانی چیرۆکەکانیەوە مرۆڤ بە قووڵی هەستی بەو مانا پڕە ئەکرد کە لە ناوەرۆکدان و کەیلن لە سەرکۆنەی تاڵ.

خەڵکانی ئازیز کاتێك کە چیرۆکە ناودارەکەی چیخۆف، "کچی ئالیبون" ئەخوێننەوە ئەدەنە قاقای پێکەنین و بە چاکی لەوە ئەگەن کە کوێخای "خواردەو بردە" کاتێك ئەکەوێتە ڕابواردن بە مرۆڤێکی تەنیای بێگانە کە بە هەموو کەس و هەموو شتێك نامۆیە کارێکی خراپ و ناشیرین ئەنجام ئەدات، لە هەموو چیرۆکە پێکەنین هێنەرەکانی چیخۆفدا من ناڵەی قووڵ و ئارامی دڵی مرۆڤێکی پاك و ڕاست ئەبینم، ناڵەیەکی نائومێدانەی مرۆڤێکی واقیعی هاودەرد لەگەڵ مرۆڤێکی تردا کە لە مەزنی مرۆڤایەتی بێئاگایەو هیچ لەوە نازانێت ڕێز لە توانای مرۆڤ بگرێت، ناڵەیەکەو دێتە گوێم، ناڵەیەکەو بۆ مرۆڤێك هەڵکێشراوە کە ڕاستەوخۆ خۆی ئەداتە دەست زۆرو ستەم، ئاهێکی دڵەو بۆمرۆڤێکە کە وەك ماسی ئەژیَو بێجگە لە هەڵپەی ئاوو گۆشتی ڕۆژانەی خۆی کە چەند چەورتربێت چاکترە بڕوای بە هیچی دی نیە، ئاهێکە بۆ ژیانی سەختی مرۆڤێك کە هەست بە هیچ ناکات، تەنیا مەگەر ترس لە "کەسێك" لە "کەسێك"ی بەهێزو بیَ چاوو ڕوو کە باوکی لە گۆڕ دەربێنیَو پەنایەکی بدات، ئاهێکە لە سنگی دەردەدارێکەوە هاتۆتە دەریَ.

هیچ کەس بە چاکی و ڕوونی وەك چیخۆف ئازارەکانی ژیانی مرۆڤی بە وردی هەست پێنەکردووە، هیچ کەس وەك چیخۆف مرۆڤی بەم حەقیقەتە تاڵەو بەم بیَ پەردەییە نیشان نەداوە، هیچ کەسێك وەك چیخۆف وێنەی واقیعیانەی پڕ شەرمەزاری ژیانی مرۆڤی دنیای بیَ سەرەوبەرەو تاریکی بۆرژوای نەگرتووە.

چیخۆف دوژمنی ڕسوایی بوو، تەواوی تەمەنی لەگەڵ ئەو دوژمنەدا لە کێشەدا بوو، کردیە گاڵتەجاڕ، بە زەبری قەڵەمێکی دوور لە هەوەس

بـازی وێنـەی کێشـا، تەنانـەت لـەو شـوێنانەدا کـە هــەموو شــتێك ســەقامگیرو رێکوپێــك‌و تەنانــەت رووناکیش ئەهاتنـە پێشچاو، ناهـەمواری ڕسـوایی تیا دۆزینەوە. زۆر لەسەرخۆو بلیمەتانە ئەم کارەی بـە ئـەنجام گەیانـد، بـەڵام لـە ئەنجامـدا ڕسـوایی بێشــەرمانە تۆڵــەی لێســەند، چــونکە لاشــەکەی چــیخۆف، لاشــەی شــاعیرێك لــەناو فــارگۆنێکی بارهەڵگردا بینرا، فارگۆنەکە تـەنیا بۆ گواستنەوەی سەدەف تەرخان کرابوو. فارگۆنێکی سەوزو قێزەون کــە لاشــەی چــیخۆڤ بــە ســەرەوە بــوو لای مــن پێکەنینێکی گەورەی سەرکەوتن بوو کە ڕسوایی بە دوژمنـە بریندارەکـەی خـۆی کـردی. بڵاوبوونـەوەی (یاداشــتەکان)ی ئــەم‌و ئــەو لــە چــاپەمەنیەکاندا دەربارەی چیخۆف، خەمێکی درۆن کە لە پشتیانەوە بـۆنی هەناسـەیەکی بۆگـەن‌و بەسـتووی "ڕسـوایی" ئەکەم کە لـە پەنامـەکیا بـە مـەرگی دوژمنێکـی خـۆی شادمانە.

کە مرۆڤ چیرۆکەکانی چیخۆف ئەخوێنێتەوە وا هەســت ئــەکات لــە ڕۆژێکــی خــەمگینی کۆتــایی پاییزدایـە، هـەوا بێگـەردو روونـە، سیمای درەختی بێبەرگ‌و خانووی تەنگ‌و مرۆڤی بێڕەنگ‌و خـەمبار تـەواو ئاشـکران، هـەموو شـتێك غـەریب، بێـدەنگ، نائومێد، تەنیاو بێکەسە، ئاسۆ شین باوی بـێ بنـەو ئاسمـانێکی بێڕەنگـی گرتۆتـە کـۆڵ، هەناسـەکەی سامناکانە بە ڕوی زەویدا بۆتە زوقم، زەوی بە قوڕو چـڵپاوی بەسـتوو داپۆشـراوە، بـیری نووســەر وەك خـۆری پاییزانـە بـە تایبـەتی ئەمانـە نیشـان ئـەدات، شەقامی کۆن‌و کۆڵانی بە پێچ‌و پـەناو ئـەو خـانووە پیس‌و پۆخڵانەی کە مرۆڤی بێچارەو داماویـان تیا ئـەژی، کەسـانێك لـە ناڕەحـەتی‌و تەمـەڵیا خەریکـە بخنـێکن‌و، ماڵـەکانیان پڕکـردووە لـە جـەنجاڵی‌و ژاوەژاوی بـێ ئـەنجام، لـەم شـوێنانەدایە کـە مـرۆڤ ڕووبـەڕووی "نـازداریٚ" ئەبێتـەوە کـە وەك مشـك بـە پەلــە پرۆســـکیٚ ڕائــەکات، ژنێکـــی خـــاکی‌و خۆشەویست کە کۆیلـە ئاسا حەز دەکاو دەتوانێت ئاشق بێت، ئێوە ئەتوانن شەپازللەیەکی مزری پێدا بکێشـن‌و ئـەو نـەتوانێت فـزە بکـات، کۆیلەیـەکی خـاکی‌و گوێڕایەڵـە، نموونـەی ئەمـەیش (ئۆڵگـا)ی شـانۆنامەی -سـیٚ خوشـك- ە، ئـەویش وەسـتای ئاشـقێنیە، بـیٚ سـیٚ‌و دوو دەکەوێتـە داوی هـەواو هەوەسـی ژنـە بـیٚ ڕەوشـت‌و بازاڕیەکـەی بـرا بـیٚ کارەکەیـەوە، لەبـەر چـاویدا ژیـانی خوشـکەکانی نــابووت ئــەبێت، ئــەو فرمێســك ئەڕێــژێت، بــەڵام ناتوانێت کۆمەکێکی هەرە گچکە بە یـەکێك بکـات، تەنانــەت ناتوانێــت وتەیــەکی بێــزاری لــە ڕووی "ڕسوایی"دا دەرببڕێت.

لە جێگایەکی تردا مرۆڤ لەگەڵ (رانوسکی) نقە نق کـەرو یـارانی بـاخی گێلاسـدا ڕووبـەڕوو ئـەبێت. ئەوانـە وەك منـداڵ خۆپەسـەندن‌و لـە هـەمان کاتـدا پـیری سسـتی کـردوون‌و شـەل‌و شـەکەتن، لـە کـاتی خۆیشـــیاندا نـــامرن، هەمیشـــە ئـــەناڵێنن، لـــە دەوروبـــەریان بێئاگـــان، درك بـــە هـــیچ ناکـــەن، گەنەخۆرن‌و توانای ئەوەیان نیە سەرلەنویٚ ڕیشە بە ژیانـدا داکوتن "تروفیمـون"ی خوێنـدکاری بچووك بێچارە بە تـەواوی لێزانینـەوە باس لـەوە دەکات کـە کارکردن پێویستە، بەڵام خۆی هیچ کارێك بە ئەنجام ناگەیـــەنێت، تـــەنیا خـــۆی خـــەریك ئـــەکات‌و بێکاریەکەی ئەمەندە کاری لێکردووە کە کاتی خۆی بەوە بەسەربەرێت بە "ڤاریا" ڕابوێرێت کـە هەمیشـە خەریکی مفتەخۆری‌و بێکارەکانە.

لـــە چـــیرۆکێکی تریـــدا -ڕوشـــنین- ئەکەوێتــە خــەون‌و خــەیاڵی ئــەوەوە کــە ژیــانی ســیٚ ســـەد ســـاڵی داهـــاتوو چـــەندە خـــۆش تێئەپــەڕێت، نەفامانــە ئــەژی، دەوروبــەری خــۆی

نابینێت کە هەموو شتێکی پەسەند لە بەرچاویا بەرەو نەمان ئەچێت. "سولیونی" لەبەر گەوجی و بێکارەیی خۆی ئامادەیە بارون "تۆنزباخ"ی بێچارە بکوژێت.

لە بەرهەمەکانی چیخۆفدا ڕیزێك ژن و پیاو بە بەردەممانـدا تێدەپەڕن، ئەوانە بەندەی عەشق و، بەندەی گەمژەیی و، بەندەی تەماڵی و بەچکەی چاوچنۆکی خۆیانن، هەموو شتێکی خۆشی ژیانیان بۆ خۆیان ئەوێت، کۆیلەی ترسنۆکین و وەکو نوسنەك بە بەرۆکی ژیانەوە نووساون، خوارو خێچ و بێ ئامانج دێن و تێدەپەڕن، ژیانی ڕۆژانی ئایندەیان بە قسەی پڕوبووچی بێ سەرەو بەرە پڕئەکەن، وا هەست ئەکەن لە ئێستادا جێگایەکیان بۆ نەماوەتەوە.

جارجارە لە ژیانی ئەم کۆمەڵە نەفام و بێئاگایەدا کوتوپڕ دەنگی فیشەکێك ئەبیسترێت "ئیڤانۆڤ"[1] یان "تریپیلۆف"[2] تازە بە ئاگادێن و هەست ئەکەن کە ئەبێ چی بکەن و خۆیشیان کوشتووە.

زۆربەی ئەمانە خەونی خۆش بە ژیانی ئایندەی دوو سەد ساڵ لەوەو دواوە ئەبینن، کەچی بیر لەوە ناکەنەوە کە لە خۆیان بپرسن ئەگەر ئەمان هەر دابنیشن و دوای خەون و خەیاڵ بکەون ئەی کێ بێت و خێر بخاتە ژیانی مرۆڤەوەو بەختەوەری بکات؟ لە بەردەمی ئەم خەڵکە داماوو دڵتەنگ و نائومێدو بێچارەیەدا مرۆڤێکی تیژبینی گەورەو دانا ڕاوەستاوە، تەماشای هەموو ئەو خەڵکە بێتواناو دڵتەنگە دەکات، بە زەردەخەنەیەکی دڵ بریندارانە، بە ئاوازێکی لەبارو سەرزەنشتێکی قووڵ، لەگەڵ ئەو دەردە دڵەی بە ڕوویەوە دیارە، بە دەنگێکی دڵسۆزانەو ناسکەوە بەو خەڵکە ئەڵێت:

–هاوڕێکانم، ئێوە ژیانێکی خراپتان هەیە، ئەم جۆرە ژیانە مایەی شەرمەزاریە.

مەکسیم گۆرکی

## پەراوێز

1–ئیڤانۆڤ: پاڵەوانی شانۆگەری "ئیڤانۆڤ" کە وەرگێڕ ساڵی 1999 لە فارسیەوە کردوویەتی بە کوردی.

2–تریپیلۆڤ: پاڵەوانی شانۆگەریی "مەلی دەریا" کە مامۆستای نەمر (عوسمان چێوار) کردوویەتی بە کورد.

# (ڕۆمان ڕۆلان) و ڕۆمانی ڕووبار

**لە فەڕەنسییەوە: جەلال حەمید**

**ژیانی** (1866-1944)

ڕۆمان ڕۆلان کوڕی نووسەرێکی دادگایە، لە کلامسی (نییەڤغ) لە دایکبووە و لەوێش دەستی بە خوێندن کردووە. لە دواناوەندی لوی لۆگغان خوێندوویە و پاشان لە ساڵی 1886 چۆتە خانەی باڵای مامۆستایان.

1-**خوێندکارێکی پوختکار-** *Eclectique*، **انتقائی**[1] **ی خانەی مامۆستایان.**

ڕۆمان ڕۆلان خۆ بۆ فەلسەفە تەرخان دەکات بەڵام ڕقی لە دۆکترینە ڕەسمیەکان دەبێتەوە و درۆ و دەلەسەی نێو بەرابەرییەکان ڕەتدەکات و لە ساڵی 1889 بۆ بەدەسهێنانی بڕوانامەی مێژوو دەپاڵێورێ. ڕەوانەی قوتابخانەی فەرەنسی ڕۆما دەکرێ و لە پێناو کۆکردنەوەی بابەتی تێزەکە دەگەڕێتەوە ئیتالیا. فەیلەسوف و مێژوو نووس و هاوبیری تۆڵستۆی بوو گەواهیدەرێکی چاکی پوختەکاری بوو چوونکە تێزەکانی پشت بە بنەماکانی شانۆی لیریکی مۆدێرن و هۆیەکانی داڕووخانی بواری نیگارکێشانی ئیتالی سەدەی شانزەیەم دەبەستێ لە ساڵی 1895دا.

2-**لە دراماوە بۆ ڕۆمان** (1895-1914)

پاش ئەوەی خانەی مامۆستایانی باڵا تەواو دەکات لە ساڵی 1904-1912 لە سۆربۆن مێژووی هوونەر دەخوێنێ و ژیانی کەسایەتییە ناودارەکان بڵاودەکاتەوە لەوانە: بتهۆڤن (1903)، مایکل ئەنجلۆ (1906)، هایندل (1910) و تۆلستۆی (1911).

شانۆ یەکەم بەهرەی بوو. دوابەدوای نووسینی زنجیرە تراژیدیای ویژدانی -سانت لویس- خۆی بۆ شانۆ شۆڕشگێڕانەکەی تەرخان دەکات لە: (گورگەکان، 1898)، (سەرکەوتنی عەقڵ، 1899)، (دانتۆن، 1900)، (چواردەی تەمووز، 1902) و کۆمەڵێکی دی کە دوای پتر لە بیست ساڵ تەواویان دەکات ئەوانەش: گەمەی خۆشەویستی و مردن (1925) و (احد الشعانین، 1926) و لیۆنیەکان، (1928) و ڕۆپسپێر (1939)ن. لە ڕێگەی داستانە دراماتیکیەکانەوە تامەزرۆیی خۆی لە نوێگەری

شێوازی تراژیدی دەدۆزێتەوە کە لەو سۆنگەیەوە بەهۆی بیرۆکە مەزنەکانەوە بەرەنگاری کەسایەتیە تووند و تیژەکان ڕادەوەستێ. بەڵام ناتوانێ وەکو شانۆکار خۆی بسەپێنێ و ڕۆمان دەست بەسەر چالاکی داهێنەرانەیدا دەکێشێ. هەر دەبەرگەکەی جان - کریستۆف لە ساڵی 1903-1912 بڵاودەکاتەوە کە خەڵاتی مەزنی ئەکادیمیای فەرەنسی لە ساڵی 1913 پێدەبەخشرێ. پاشان لە بۆتەی زمانێکی ڕیتماوی بە تامو بۆ ڕۆمانی - کۆلاس برۆنیۆن-ی خۆشی بەخش دەنووسێ و لە ساڵی 1919 بڵاوی دەکاتەوە.

**3-ڕەنگاڵەییەکی لە ڕادەبەدەر.**

بێ ئەوەی لە تەمەنێکی ئامادەباش و خاوەن توانای جەستەیی تەواو بێت لە ئابی ساڵی 1914 ڕوو دەکاتە سویسرا تاکو ساڵی 1919 تیا دەمێنێتەوە و لە خزمەتی ئاژانسی دیلەکانی جەنگ کار دەکات. پاش ئەوەی لەمیان نامەیەکی کراوە بۆ گێهارت هۆپتمان پرۆتێستەی کاری دڕندانەی ئەلمانیەکان دەکات لە سۆنگەی ڕکابەرییەکی زیادەڕۆکاردا زنجیرە بابەتێك پێشکەش دەکات کە پاشان وەکو خیانەت تەماشا دەکرێن. یاداشتنامە جەنگیەکەی کە لە ساڵی 1953 بڵاودەکرێتەوە دەبێتە ڕیخۆشکەر بۆ دەرخستنی بیرۆکە ڕاستەقینەکانی کە لە سۆنگەیەوە خەمخۆری خۆی بۆ شۆکی کەسە هەرە شارستانەکان دەردەبڕێ. لە بەرهەمی ئەدەبی - ئەوپەڕی کینە، *audessus de la haine* - کە ناونیشانێکی بەرایی بوو خوازیار بوو داوا لە کەسانی هەردوو بەرەکان بکات خۆڕاگر بمێنن و بەها مرۆییەکانی نێوان هەردوو لایەنی شەڕکەر پێویستە یەکبگرن چوونکە برایەتی هەمان شارستانیەت چەشنی جیهانی دێرین لە چوار چێوەی کارەساتێکی گەورەدا هەڕەشەی تاریکبوونی لێدەکرێ. بەڵام ڕۆمان ڕۆلان لە ساڵی 1916 بێهودە خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی وەرگرت بەرامبەر بە نووسینەکانی کە مایەی خۆشحاڵی و تێگەیشتنی ئەو نیشتمان پەروەرانە نەبوو کە جەستە و دەروونیان ئامادەی شەڕ کرابوون و بە ئاگاییەوە بەرگریان تەنانەت لە بوونی خودی نیشتمانەکەیان دەکرد.

**4-بیر و هزری -چەپڕەو-**

ساڵی 1919 بەهۆی مردنی دایکییەوە دەگەڕێتەوە فەرەنسا و پاشان بە زووترین کات دەچێتەوە سویسرا و لە ساڵی 1921 تاکوو 1937 لەوێ نیشتەجێ دەبێ. ژمارەیەك کاری ئەدەبی بڵاودەکاتەوە لەوانە: چەند بابەتێکی ئاشتیخوازانەی وەك -لیلولی، *Liluli*- و نمایشی کۆمەنەی خوازەدار، 1919 و کلێغامبۆ (کە مێژووی ئاگاییەکی ئازادی ماوەی جەنگە) 1920 و زنجیرەی ئەندێشاوی و شۆڕشگێرانەی دەروونە ئاسوودەکان (1922-1933) و پاشماوەی شانۆی شۆڕش و لێکۆڵینەوەیەکی چوار بەرگی گەورە لە بارەی بتهۆڤن (1928-1943) و چەند ووتارێك لە مەڕ گاندی (1923) و لە مەڕ هیندستان (1929-1930) و هتد. بەڵام لە ڕوانگەی هاوچەرخەکانیەوە بە شێوەیەکی تایبەت بە کەسێکی سەر بە هزر و باوەڕی چەپڕەو لە قەڵەم درابوو. وەلێ بەرگری لە خۆی دەکات بەوەی کە سەر بە هیچ پارتێك نییە و بە وورییاییەوە بیروڕا ئازادەکانی دەپارێزێ و دەبێتە کەسێکی کەوتووی نێو داوی بزووتنەوە مرۆڤخوازییەکان. پەیوەندی بە سەرجەم ڕووداوە جیهانیەکان و پێشوازی لە چەندین میوانی ناوداری (بە تایبەتی وەك گاندی)

دەکات. خۆیشی سەردانی گۆرگی و ڕوسیا و سەرۆکایەتی چەند کۆبوونەوەیەکی نێو دەوڵەتی وەك - کۆنگرەی ئەمستردامی دژ بە جەنگ، 1932 - دەکات و مەدالیای گۆتە کە لەلایەن حکومەتی هیتلەرەوە لە ساڵی 1933 پێیدەبەخشرێ، ڕەتدەکاتەوە. لە ساڵی 1937دا ڕۆلان ڕۆمان دەگەڕێتەوە نیشتمانی دایك و دوا ساتەکانی ژیان و کاتە خەمناکەکانی داگیرکردن لە ڤێزلای دەباتە سەر لە میان - گەشتی ناوەوە، 1942 - کە بریتییە لە ژیاننامەیەکی شیعر ئامێز سەرقاڵی ڕابردوو دەبێ و یادەوەرییەکانی لە بارەی پێگوی لە ساڵی 1944 کۆ دەکاتەوە کە دووبارە بە شێوازی کلۆدیلی دەبەستێتەوە و تیادا پەی بە ناخێکی ئاییني وەك ئەوەی خۆی دەبات.

## مرۆڤ و بەرهەمە ئەدەبییەکانی

ژمارەیەکی کەم لە نووسەرانی قاڵبووی نێو ڕێچکەی ڕووداوەکان بە شێوەکی مەترسیدار گۆڕانکاری بیر و باوەڕیان بەخۆوە بینیبوو، ڕۆمان ڕۆلان لە مبارەیەوە بە هەمان ئەندازە لای دۆست و دوژمنەکانی گلەیی دەکرد و بەرهەمی یادەوەری و نامە گۆڕینەوەکانی ڕووی تەواوی ئەدەبەکەی وە دەردەخات. بێ ئەوەی خواکەی بە تەواوی بێتە ناسین بەشێوەیەکی گەوهەرییانە خۆی بە کەسێکی ئاییني ناوزەد دەکات و دەگاتە قەناعەتێك کەوا خاوەن بەهرەی پێشینکارییەکی ناوازەیە و لەو بڕوایەدایە کە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانی ئەرکن لەسەر شانی. ڕۆمان ڕۆلان بیرمەندێکی ئەریستۆکراتی و تاکوتەرای ڤینی بوو و هەروەها خۆی لەگەڵ کەسێکی چاودێرکاری نێو کەشتی بەراورد دەکات: "گەر کەشتی تاریك بێت دەزانرێ کەوا نغرۆ دەبێ بەڵام ئەرکی ئەو خۆهەڵنەقورتاندنە لە قەرەباڵغی پێکدادانی خوارەوە ئەرکی ئەو چاودێری کردنە، چاودێری کردنی ئەوەی کە دێت لە پاشماوەی داڕووخاو و شۆستەی لێوارە نادیارەکان". وێڕای ئەوەش هیچ ووشکوبرینگیەك لای ئەم خاوەن هزرە بەدی ناکرێ. هاوچەرخەکەی بیرجسۆن غەریزە وەك زیرەکی بە هەموو بوونیەوە خوازیاری گەڕان بوو بە دوای - ڕاستی زیندوو- "دەیگووت ژیان هەیە، غەریزەیەکی توند و تۆڵ بۆ ژیان و خۆشەویستی هەیە. ئەوانە خەون و پێشنیار نین بەڵکو چالاکترین و قوڵترین حەقیقەتن ناتوانین فەرامۆشیان بکەین تاکو خودی خۆمان لێنەکەینەوە" (1909). ئالێرەوە پێویستی بۆ هاوبەشی ویژدانی و ئاواتە میرخاسەکانی هەمیشە پتر مۆرکێکی مرۆییانە وەردەگرن. ئالێرەوە لە بری شکۆدار سروشتی دەربڕینی لیریکی لە کانگای دڵیەوە هەڵدەقوڵێ: "قەدیس ئەو ئاگرەیە کە دەسووتێ!" هەموو شتێك لە ناخیدا پەی بە پێویستی وەفادارییەکی ڕەها بەرامبەر بە خود و ئەویتر و ئیرادەی پاراستنی "سەربەخۆیی بیر لە سەرەتا و پێش هەموو شتێك و دژ بە هەموو شتێك هەرچەندی تێبچێت" دەبات (1929). مەترسیەکی گەورەی لە چوونە ڕیزی پارتەکان هەبوو و ڕقی لە دۆکترینە دۆگماکان بوو کە بەرامبەر بە لێکدارییەکانی ژیان توند و تۆڵ بوون. حەماس و تینوو گوڕی دڵ و وەفاداری پاڵیان پێوەنا پشتگیری لە پڕۆژەی کارەکانی - چەپڕەو- بکات بەڵام بەبێ بەشدارییەکی یەکلاکەرەوە و بەرپەرچدانەوەی دیکتاتۆرییەتی

عەقڵی دەوڵەت. بەردەوام ئەم قسانەی بە هاوڕێ کۆمۆنیستەکانی دەگووتەوە: "لەگەڵ پرۆلیتاریا هەموو جار ڕێز لە حەقیقەت و مرۆڤایەتی دەگیرێ، دژ بە پرۆلیتاریا هەموو جار حەقیقەت و مرۆڤایەتی پێشێل دەکرێ" (وەلاَمدانەوەی مرۆڤایەتی، 1922) یاخود هەروەها دەڵێ: "بیری ڕاستەقینەی شۆڕشگێڕانە بە هەمان ئەندازە چەکدارە دژ بە حوکمە پێشینە نوێیەکانی شۆڕشی پرۆلیتاری هەروەک حوکمە پێشینە کۆنەکانی مۆنارشی بۆرژوایی.. کە هیچ شتێك لە ڕوانگەیەوە پیرۆزی نییە" (ئەکادیمیای مۆسکۆ، 1925) خوازیار بوو دوور لە بیرتەسکی لە هەموو شتێك تێبگات بۆ ئەوەی هەموو شتێکی خۆش بوێ چوونکە دانبەوە دەنێ کە هیچ شتێك هەژموونی بەسەر حەقیقەتدا نییە. لەبری دابڕینەوەی ژیان. لە ڕوانگەیەوە ئاکار پێداگری لەسەر دەستەبەرکردنی هاوگونجانی نێو لێکدژەکان دەکات و "لە نێوماندا هەوڵ دەدات هاوسەنگی مرۆییمان بنیاتنێتەوە". هەروەك ژیان دەبڕێتەوە و دۆگما دەکرێ و لە ئایندەی بوونەوەرەکان شارستانیەتەکان دوور دەکەوێتەوە نووسەر لە بۆتەی گەشەسەندنی بیری تایبەتی خۆیەوە و ڕەنگاڵەیی کارەکانی ڕەچاوی ئەم ئایندەیە دەکات: "من بە هۆی پێداویستیەکی ناوەکی ناچار کرام کۆلاس برۆینۆن و لیلولی بنووسم. لە دەوروبەری پەنجاکاندا میراتیەکی باوکانەی گاڵتەجار و بەرلێگیراو گۆلوازی *gaulois*– دەبێتە بەش و شانبەشان میراتی دایك وەریدەگرێ و دەبنە مایەی سروشبەخشینی بەشێك لە جان کریستۆف و ژیانی مرۆڤە ناودارەکان. بەلاَم نەکەن دووچاری هەڵەبن چوونکە لە سایەی ڕووە جیاوازەکان بەردەوام هەمان بوونی هەبوو". نەوەی داهاتوو لە ڕێگەی جان کریستۆف بە شێوەیەکی تایبەتی دەیناسنەوە.

## جان کریستۆف

جان کریستۆف لە سەدەی بیستەم دەبێتە دەسپێکەری جۆرە ڕۆمانێك بە ناوی – ڕۆمانی ڕووبار[2]، *Le roman- fleuve*، الروایە النهر – ئەم دەستەواژەیە لە ڕۆمان ڕۆلان یاخود لە خودی ڕۆمانی موزیکی وەرگیراوە کە بریتییە لە جۆرێك سیمفۆنیای پاڵەوانێتی. ئەم کۆمەڵەیە لە دە بەرگ پێکهاتووە: بەربەیان (1904)، بەیانی (1904)، هەرزەکار (1905)، یاخیبوون (1907)، پێشانگای گۆڕەپانێك (1908)، ئەنتوانێت (1908)، لە ماڵەوەدا (1909)، هەڤالان (1910) و شوك النار[3] – *Le Buisson ardent* – (1911) و ڕۆژگاری نوێ (1912). ئەوە هەناسەی پاڵەوانەکان – بوو کە نووسەر خوازیاری هەڵمژینی بوو لە ڕێگەی وێناکردنی ژیانێکی بە ئەزموون تەنراو و لێوانلێو بە ووزە و چالاکی موزیکارێکی مەزنی ئەڵمانی و بوژاندنەوەی لە دەوروبەری سەردەمێك ئەویش – بتهۆڤنە لە جیهانی ئەمرۆماندا – کارەکە بریتیە لە پەیکەرێك لە – خواوەندێتی موزیك – بەلاَم بەوە کارمان تێدەکات کە ئەزموونی مرۆیی حەشار دەدات و چەند لاپەڕەیەکە لە بارەی منداڵی و هەرزەکاری و خۆشەویستی و هاوڕێیەتی. بەمجۆرە کارەکە پێکدێ لە ڕووداوێکی ویژدانی

بەرامبـەر هاوچـەرخە ئـەزموونکارەکانی لـە مـەڕ تراویلکـەی فریبەرانـەی سـامانی مـادی. نووسەر خوازیارە زەوق و چێژ و چوست و چالاکی و ئاکار و بەخشندەیی و خۆشەویستی برایانە و بە تایبەتی خۆشەویستی ژیانێکی بەر پرس بەرامبەر بە هەموو پارادۆکس و جیاوازییەکان بگەڕێنێتەوە. بەڵام چەند ڕوویەکی کۆن بوو کە لیریزمی لە بۆتەی ڕۆمانتیکیەتێکی دواکەوتوو دەژێنێتەوە و ئایدیالیزمی عەفەوی ڕەونەقی خۆی لە واقیعەوە وەردەگرێ.

## "ڕووبار.. زەنگەکان"

لەم لاپەڕەیەدا کە بە سیحری شیعریانە ناسراوە، نووسەر باسی ووریایی منداڵی دەکات لە جیهانی هەستەکاندا: لە بەرەبەیاندا ئەو ژیانە دەخاتە ڕوو کە سیمایەکی موزیکی پێدەبەخشێ، ئەم مەملەکەتە بەر لە هەموو شتێك مەملەکەتی دەنگ و ئاوازە. یادەوەری تایبەتی و پێشینکاری ڕۆمانووس لێرە زانستخوازی سایکۆلۆجیای سەردەم دەگرێتە خۆ کە ڕوو لە دیراسەکردنی – نیمچە ئاگایی *subcoscient* دەکات. هەر لە یەکەم ساتەوە ڕەچاوی دروست بوونی هاوگونجانی نێوان بوونەوەران و شتەکان دەکەین. لە سۆنگەی بەدواداچوونی ڕۆمانەکە ڕێچکەی ڕۆیشتنی ڕووبارەکە سروشتی قۆناغەکانی ژیان یاخود هاتنی دوا بە دوایەکی نەوەکان دەبەخشێ و هەڵڕژان و ڕۆیشتنی ئاوەکان لەگەڵ لایەنی ناوەوەی ڕووبارەکە دەگونجێ. نزیکایەتیەکی سەرکەوتوو لە هونەر و تێبینیکردن بەدیدەکرێ. بیرۆکەی ئەم ڕووبار و زەنگانە وەك دووبارەبوونەوەی سەمفۆنیا چەندین کەڕەت دووبارە سەر هەڵئەدەنەوە و هەر ئەمەش شانبەشان ساتەکانی ژیانی جان کریستۆف بەهاو تەبایی و ڕێکوپێکی بەڕێوەدەچێ: مانگەکان تێدەپەڕن.. دوورگەکانی بیرەوەری لەسەرچاوەی ڕووباری ژیان[4] دەس بە هەڵقووڵان دەکەن. سەرەتا دوورگە بچووکەکان ئەو تاشە بەردانە لە دەس دەدەن کە خۆیان لە ڕووبەری ئاوەکان ڕادەمووسن. لە دەوروبەریاندا کاتێکە خۆری نیوەڕۆ بەرز دەبێتەوە خوانی گەورەی هێمنی بەردەوام خۆی ڕادەخات پاشان دوورگە بچکۆلە نوێیەکان درێژدەبنەوە کە بەهۆی تیشکی خۆرەوە دەبنە پارچەیەك زێڕ. لە قووڵایی دەروون چەند شێوەیەك تێکەڵاوی پاکیزەییەکی نامۆ دەبن. لە ڕۆژگارە بێ سنوورەکان بە شێوەیەکی هەتایی و لەسەر یەك ڕەزم شانبەشان هاوسەنگیەکی وەرزکار و بە زەبر دووبارە دەسپێدەکەنەوە. بازنەی ڕۆژگارە ئاوێزانبووەکان وێنە دەکێشنەوە کە سیمای هەندێکیان ڕوخۆش و هی هەندێکی تریان غەمبار دەردەکەوێ بەڵام گرێبەندی زنجیرەکانیان بەردەوام لێکدی دەترازێن و یادەوەرییەکان لەودیو هەفتەو مانگەکان دەچنە پاڵ یەکدییەوە. ڕووبار و.. زەنگەکان لە دوو ڕاییەکی گەلێ بێ پایانەوە دێنەوە یاد، –لە دوورایی زەمەن و چەند کاژێرێك لەو ژیانەی کە لە ئارادایە.– دەنگە قووڵ و ئاشناکانیان بەردەوام گۆرانی دەچڕن.. شەو لە نیوە خەودایە.. تروسکاییەکی زەرد شووشەکە سپی دەکاتەوە.. ڕووبارەکە هاژە دەکات[5]. دەنگی لە بێدەنگیدا گەلێ بەتاو بەرزدەبێتەوە، بوونەوەران دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. جارێك خەونیان ڕادەموسێ و هێندەی ماوە بە هێوری خۆی نیشانی هاژەی

شەپۆلەكانی بدات. جارێك كە بێزار دەبێ وێنەی ئاژەڵێكی تووڕە كە دەخوازێ قەباڵ بگرێ، دەشیرێنێ. هاوار و ناڵەی چڕ دەبێتەوە: ئەمێستا كە چرپەی هێمنیەكی ڕەها و دەنگی زەنگی زیوین و زەنگۆڵەی تیژ و پێكەنینی منداڵ و دەنگە سۆزاوییەكان گۆرانی دەچڕن و موزیكایەك سەما دەكات[6]. دەنگی بەرزی دایكایەتی كە قەد نانوێ! منالێك ڕادەژەنێ بە هەمان شێوەی ماوەی بەر لە چەندین سەدە تەنانەت نەوەكانی پێش ئەو سەدانەش كە هەر لە منالیەوە تاكو مردن ڕایژەندووە، ڕۆدەچێتە خەیالیەوە و كار لە خەونەكانی دەكات و دەوروبەری بەرگی ئەو هارمۆنیا پەنهانەی دەگرێت كە دووبارە دایدەپۆشێتەوە كاتێك لەنێو گۆڕستانێكی بچووكی ڕاكشاوی دەمی ئاوێك خەو دەیباتەوە یان نووقمی ڕاین دەبێت.. ئەوەتا زەنگەكان لەبەرەبەیان! بە سكالاّ و كەمێك خەم و خۆشەویستی و هێمنیەوە وەلاّم دەدەنەوە. لە سەدای دەنگی خاوییانەوە خەونگەلێك بەرز دەبنەوە. خەونەكانی ڕابردوو، ئاوات، هیواكان. داخی بوونەوەرە ونبووەكان كە منال هەرگیز نەیناسیون و لەگەل ئەوەش لە دەستیان هەلاّتووە هەرچەند لە ناوییاندا ژیاوە و لە ناویدا دووبارە ژیاوەتەوە[7]. سەدەكانی یادەوەری لەم موزیكەدا شەپۆل دەدات. كۆمەلێك ماتەمی و كۆمەلە جەژنێك! – لە قولاّیی خانووەكە وا دەردەكەون كە ڕەچاوی ئەو شەپۆلە جوان و دەنگدارانە دەكەن كە دەڕژێنە نێو شنەی باو پەلەوەری ئازاد و هەناسەی ساردو گەرمی بایەكەوە. لایەكی ئاسمانی شین بۆ پەنجەرەكە پێدەكەنێ. بەشێك لە تیشكی خۆر لە درزی پەردەكانەوە دەخزێنە نێو پێخەفەكەی. جیهانە بچووكەكە بە ڕوانگەی منال ئاشنا دەبێت، هەموو بەیانیەك كە لە خەو ڕادێ تێكڕای شتەكانی سەر جێگەكەی كە دەس پێدەكەن ڕەچاو دەكات، لە هەولێكی بێ پایاندا دەكەوێتە ناسین و ناونانیان بۆ ئەوەی دەسەلاّتی بشكێ بەسەر ئەو مەملەكەتەی كە دەدرەوشێتەوە.

جان كریستۆف. بەرەبەیان (ئالبین میشێل. بلاّوكەرەوە)

### "لە دارستانی سەداكاندا"

لە شارۆچكەیەكی بچووكی ڕاین لە دایك بوو، كوڕ و كوڕە بچووكی میوزیكیەكان جان كریستۆف كرافات لە تەمەنێكی زووی منالیدا پەی بە هەستی هوونەر دەبات. لە ڕێگەی هەستیارییەكی بێ وێنەوە لە خەلكانی دی پتر ئازار بە دەست نەهامەتی و نادادوەری دەچێژێ. بەرامبەر بەوەش، دیمەنێكی سروشت، سەدای سروودێك كە لە شەودا بەرز دەبووەوە هەستێكی ناسك و سۆزێكی بە چێژی پێدەبەخشێ. ئەوەتانێ بەرامبەر بە كۆنە پیانۆیەك چەند خۆشنوودە بەم گەردوونە پڕ لە سەدا و كاریگەری و ئەو هەستیارییەی كە توانای وە ئاگایی دەداتێ. "لە یەكەم هەنگاوەكانی ژیانمەوە موزیك دەستی گرتم" ڕۆمان ڕۆلان دانبەوە دەنێ. ئاخۆ هەست و سۆزی ناكەوێتە خرۆش كاتێك كە لێرە سەراپای هوونەرەكەی دەخاتە ڕوو. بێگومان كاتێك كە لە -دارستانی سەداكان- دەست بەسەركێشی دەكات لە ڕێگەی یادەوەری و ئەو سیحرە گەوهەری و ڕۆحە پێشوەخت ئامادە نەكراوانە سەرسامی دەورووژێنێ:

ئـەو تەنیایـە. پیانۆکـە دەکاتــەوە. کورســیەك نزیك دەخاتەوە. لە سەریا سەقام دەگریّ. شانەکانی دەگەنـە ئاسـتی دووگمـەکانی پیانۆکـەوە: ئەوەنـدە بەسە بۆ ئەوەی حەز و خواستی بە دیبهێنێ. بۆچی چاوەڕێ بوو بە تەنها بیّ؟ هیچ کەس کۆسپ نییە لە بـەردەم ئـامێر ژەنـینی ئـەو بـە مـەرجێك دەنگـە دەنگێکی زۆر بەرپا نەکات. بەڵام بەرامبەر خەڵکی دی شەرمۆکە. بوێر نییە بەڵام کە قسە و جموجۆڵ دەکریّ ئـەوا خۆشـیەکە تێکدەچیّ. گـەلیّ جار کـە تـەنیا دەبـێن خۆشـیەکی گـەورەتر لـە ئارادایـە!.. کریســتۆف هەناســەی خــۆی دەگــریّ بــۆ ئــەوەی هێمنیــەکی بــەرفراوانتر بێتــە کایــەوە و هــەروەها چــوونکە خۆیشــی کــەمێك شــڵەژاوە وەك خــەریك تەقاندنــەوەی گوللــە تۆپێــك بێــت. لەگــەڵ دانــانی پەنجەی لەسەر کلیلی پیانۆکە دڵی دەکەوێتە لێدان، هەنــدیّ جــار دوای ئــەوەی پەنجــەی بــە نیــوەیی دادەگرێتە سەر کلیلێك بەرزی دەکاتەوە بۆ ئەوەی بیگوازێتــە ســەر شــوێنێکی دی. ئایــا دەزانــین لــە جیاتی ئـەویتر چی دەنگێك لەمـەیان دەردەچیّ؟.. لەناکاو دەنگێك بەرز دەبێتەوە، دەنگێك لە قووڵایی، دەنگێکی تیژ، دەنگێك کە زایەڵەی هەیە و دەنگی دی ســەدا دەداتــەوە. مناڵــە ماوەیــەکی درێژخایــەن گوێیــان لێــدەگرن، یەکبەیــەك. لــە دابــەزین و درێژبوونـدا چەشـنی زەنگـەکان هاوسـەنگ دەبـن، کاتێك کە لە کێڵگەکاندا بن و بایەکە هەڵیان دەگریّ و ناوبـەناو دووریـان دەخاتـەوە و پاشـان کـە گـویّ هەڵدەخـەین لـە دوورایییەکانـەوە گوێمـان لـە دەنگـی جــوداتر دەبــیّ تێکــەڵ یەکــدی دەبــن و وێنــەی هــەڵفرینی زینـدەوەران دەسـوڕێنەوە وا دەردەکـەون کە بانگت دەکەن و بەرەو دوور.. دەتبەن.. دوور.. دوورتر. بەرەو خەڵوەتگە پەنهانەکان کە تیادا نەغرۆ و ســەرنگووم دەبــن.. ئەوســا وون دەبــن! نــەخێر دووبـارە دەکەونـە چـرپە چـرپ.. شـەقەی لێـدانی بچووکی باڵـەکان.. چەند نامۆیە! ئەوانە وەك بیر و رۆح بـەمجۆرە ملکـەچ دەکـەن لـە نێـو ئـەم سـنووقە کۆنـەدا خۆیـان حەشـار دەدەن. ئـەو سـنووقەی کـە ناتوانیّ هیچ شتێك تاوتویّ بکات! بەڵام لە هەمووی جـوانتر ئەوەیـە کـە کـاتیّ بـە یـەکجار دووپەنجـە دەخەیتە سەر دوو کلیلی جیاواز. هەرگیز نازانین چی بە تـەواوەتی خەریکە ڕوودەدات. هەندیّ جار دوو بیرۆکە دوژمنی یەکدین، یەکدی وەڕز دەکەن و لە یەکدی هەڵدەدەن و کینیان لە یەکدی دەبێت، لە ڕووخسـارێکی هەڵچـوودا دەنگدەدەنـەوە: دەنگیـان قەبـەتر دەبێتـەوە، دەقیـژێنن جارێك بە تـووڕەیی و کـەڕەتێکی دی بە نەرمیـەوە. کریستۆف ئـەم جـۆرە گەمەیــە دەپەرســتیّ: هــەر لــە چــەند دڕندەیــەکی پێکـەوە بەندکراو دەکەن کە گاز لە پێوەندەکانیان دەگــرن و چــەپۆك لــە دیــواری زیندانــەکانیان دەوەشـێنن: وا دەنـوێنن کـە تـەمای کردنـەوەیانن و بــەرەو دەرەوە شــاڵاو دەبــەن وەك ئــەو کەســانەی کتـێبی چـیرۆکی ئـەو جنۆکـە بەندکراوانـەی نێـو سـنووقە عەرەبیـەکانی ژێـر ئەڵقـەی سـلێمان باسـی لێـوە دەکـەن وایـە. ئـەوانی دی بـە شـانو بـاهوت هەڵـدەدەن و هــەوڵی مـەدحکردنت دەدەن و تــەنها خوازیــاری قــەپاڵ هاویشــتن و تایــان لێــدێت. کریســتۆف نـازانیّ داخوازیـان چـییە: سـەرنجیان ڕاکێشا و توڕەیان کرد، خەریکبوون ڕەنگیـان سوور هەڵدەگەڕاند. چەند جارێکی دی دووبارە بووەوە، نیشانە و هێماکان یەکدیان خۆشدەویّ: دەنگەکان وەك چۆن لـە مـاچ و ئـاوێزان بووندا دەسـتەکانمان

تێکەڵ دەبن، بەیەکا دەچن. ئەوانە قسە خۆش و لەسەرەخۆن. بیرۆکەی دانسقە و سیمای ڕووخۆش بێگەرد و گۆڵن. کریستۆف بچووکیان خۆشدەویست و کریستۆف بچووکیش ئەوانی خۆشدەویست، کە گوێبیستیان دەبوو فرمێسک بە دیدەکانیا دەهاتە خوار. لەیادکردنەوەیان وەرز نەدەبوو، ئەوان هاوڕێی ئازیز و دڵسۆزی بوون.. بەمجۆرە منداڵەکە پیاسەی بە نێو دارستانی دەنگەکان دەکرد و لە دەوروبەریدا هەستی بە هەزارەها هێزی نادیار دەکرد کە سەرقاڵی چاودێری و بانگکردنی بوون بۆ ئەوەی دەس بەسەریا بهێنن و هەڵیلووشن.

جان کریستۆف. بەرەبەیان (ئالبین میشێل، بلاوکەرەوە)

## یەکەمین ئەوینداری

هەر لە تەمەنی حەوت ساڵیەوە وەك لاوێکی پیتۆڵ دەردەکەوێ. جان کریستۆف ئێستا لە تەمەنی پانزە ساڵیدایە و بووەتە موزیك ژەنی ڕەسمی کۆشکی میرانەی بچووك. ئێمە بەشێوەیەکی لاتەریب بەدوای قۆناغەکانی بالأبوون و ئەزموونی مرۆییانەی دەکەوین هەر لە نەهامەتی و بێ ئابڕوویی و هاوڕێیەتی و نائومێدی و یەکەم ئەوینداریییەکانی.. و بگرە بەهرەدانانە موزیکیەکەشی کە سەرنجی مەدام دۆکیریجی دەوڵەمەند و چاکەخواز ڕادەکێشێ و بە ئاگادارییەکی دایکانەوە هەوڵی دەوڵەمەندکردنی کولتوور و کاملکردنی ڕۆشنبیریی ئەو دەدات. داوای لێدەکات کە نینای کیژی فێرە موزیك بکات. لە نێوان هەردوو دڵە لاوەکە. لە ناخی تاق لاوێتیدا دەرفەتی دوورکەوتنەوەی ئەوینێکی بێگەرد لە ئارادا نەبوو. ڕۆمان ڕۆلان خوازیار بوو تەڕوبڕی و پاکیزەییەتی ڕەهای نێو یەکەمین ئەوینداری بگێڕێتەوە. -جێگای داخە! گەورەیی مەرجەکان مینای خانەدان بەدبەختانە لە موزیك ژەنی بچووك جیا دەکاتەوە: ئەم ساتە پڕ لە ئاسوودەییانە لە یاد ناچن گەرچی بەردەوام نابن:

ڕۆژێك بوو کە بە درێژایی بەیانی و بەشێك لە پاش نیوەڕۆی باران باریبوو. لە ماڵەوە بێ ئەوەی بۆ یەکدی بدوێن خۆیان بۆ خوێندنەوە و باوێشك دان و ڕووانینی دەرەوەی پەنجەرە ماتدابوو. بێزار و ڕووگرژبوون نزیك کاتژمێر چوار ئاسمان ساماڵ بوو لە باخچەکەدا ڕایان کرد و خۆیان کێشایە سەر دیواری بالکۆنەکە و کەوتنە ووردبوونەوەی خوارەوە و ئەو دۆڵ و شێوە سەوز هەڵگەڕاوانەی کە بەرەو ڕووبارەکە درێژببوونەوە زەوی هەڵم و خۆریش دوکەڵێکی شیلەتێنی لێ بەرز دەبووەوە. تنۆچکەی باران لەسەر گژوگیایەکە دەبریسکانەوە، زەویە تەڕەکە و عەتری لاگوڵەکان تێکەڵ یەکدی ببوون و هەڵفڕینی ئالتوونینی هەنگەکان بەدەوریانەوە گیزەی دەهات. هەردووك لە تەنیشت یەکدی بوون لە یەکتریان نەدەڕوانی. نەشیاندەتوانی بڕیاری بێدەنگبوون بدەن. هەنگێك بە شلەژاوییەوە هات و خۆی لەسەرە بۆلێك- گلیسین، *glycine*[8]- کە ئاوی باران قورسی کردبوو، کێشایەوە و چەند دڵۆپە ئاوێکی لە خۆی تەکاندەوە. هاوکات دەست بە پێکەنین دەکەن و دەمودەست هەست بەوە دەکەن کە چیدی لێکدی هەڵنەچن[9] و بوونەتە دوو هاوڕێی چاکی یەکتر. لەگەڵ ئەوەش بەردەوامبوونی لەسەر ئەوەی کە سەیری یەکدی نەکەن. کتوپڕ بێئەوەی سەر

وەرچەرخێنیٚ، دەستی گرت و گووتی: "وەرە!"، بەڕاکردنەوە ڕووەو ڕێگومکەیەکی داریناوی بچووك لەو ڕێگە دەور دراوانەی بە ڕووەکی - بقس، *buis*، (جۆرێك ڕووەکی قەدداری ڕازاوەکەرە لە جۆری بەقسیەکان لە باخچەکاندا بۆ دیاریکردنی تۆوەکان بەکاردیٚ) پەلکێشی کرد کە لە نێو درەختەکانەوە بەرزدەبنەوە. بەنزماییەکاندا هەڵدەگـژێن و لەسەر ئەو خاکە تەڕانەدا هەڵدەخزین کە درەختە شێدارەکانی لق و گەڵاکانیان بەسەر خۆیاندا دەجولێنن. کە لە گەیشتنە سەر دار نزیك دەبنەوە. ئەو بۆ هەناسە وەرگـرتن هەڵوەستە دەکات "چاوەڕوان بە، چاوەڕوان بە" زۆر بە هێواشی ئەوە دەدرکێنیٚ و هەولی هەناسە وەرگرتن دەدات. سەیری کچەکە دەکات. ئەویش سەیری لایەکی دی دەکات: پێدەکەنیٚ و هەناسەی دەبڕکیٚ و دەمی نیوە کراوەیە، دەستی لە نێو دەستی کریستۆفدا بچووك دەبێتەوە. هەردووك هەستدەکەن خوێنیان لە نێو لەپی گوشراو پەنجە لەرزۆکەکانیاندا جمەی دێت. بێدەنگی ئابلووقەیان دەدات. خونچەی زەردی درەختەکان لە بەردەم تیشکی خۆر دەلەرانەوە، بارانێکی کەم تنۆك تنۆك لە گەڵاکانەوە دەهاتە خوار و لە ئاسمانـدا شانبەشان دەنگی تیژی پاسارییەکان، دەنگێکی زەنگۆڵە ئاسا تێدەپەڕین. بەرەو ئەو سەری وەرچەرخاند تروسکاییەك دەرکەوت. خۆی نایە سەرگەردنی و ئەویش لە ئامێزیا گیرسایەوە. "مینا! مینای ئازیز!.. - کریستۆف خۆشم ئەوێی! خۆشم ئەوێی!" لەسەر کورسیەکی داری تەڕ دانیشتن ڕۆچوونە نێو ئەوینەوە: ئەوینێکی هێمن و قوولٚ و ناماقوولٚ. هەموو شتە جێگیرەکانی دەوروبەر ونبوون. خۆشەویستیەکی پتر و فیز و گەورەیی و نهێنگیرییەکی زیاتر کەوتە ئاراوە. سەرجەم خەیالٚ و ئەندێشەی ناخ بەهۆی ئەم هەناسەیەوە پاکژدەبێتەوە. "خۆشەویستی بکە، خۆشەویستی" چاوە تروسکاوی بە فرمێسك شۆڕاوەکانی دەیانگووت. ئەم کیژۆڵە سارد و نازدارە و ئەم کوڕە لووتبەرزە بوونە نێچیری خۆبەدەستەوەدان و ئازار چەشتن و مردن لە پێناوی یەکدی. چیدی یەکدیان نەدەناسیەوە. چیدی وەك خۆیان نەمان. هەموو شتێك گۆڕانی بەسەرهات: دڵیان، سیماو چاوەکانیان بروسکەی چاکەخوازی و سۆزێکی کارای یان ڕەنگدەدایەوە. چجای ساتەکانی پاکژی و فەرامۆشکردنی خود و بەهرەی ڕەهای خود کە دووبارە چیدی لە ژیان سەرهەڵنادەنەوە!

جان کریستۆف. بەیانی (ئەلبان میشێل. بڵاوکەرەوە)

## جان کریستۆف

## لەلایەن خوای خۆی سەردانی دەکریٚ

بەشە هەرە سەرنجڕاکێشەکانی جان کریستۆف بزووتە ڕاستخوازییەکان دەسەپێنێتە سەر ئەزموونی تایبەتی ڕۆمان ڕۆلان و هەروەها ئەشیٚ ئەوە خالی لاوازی بێت کە بە شێوازێکی گەلیٚ سادە و سۆزاوی هەست بە تەواوی ئامادەبوونی دەکەین. لە نزیك تەمەنی هەرزەکارییەوە کتوپڕ نوقمی نێو کەشوهەوای بڕیاردان دەبێت کە لە دەوروبەری ساڵانی 1880 لە پاریس ناوبانگ دەردەکات. وەك پاڵەوانەکەی بە دەست قەیرانی گومانکاری دەناڵیٚ و بەرگەی ناگریٚ

چـوونکە گوتبـووی ماهیـەتی بـوونی – هەمیشـە ئایینی کیژی یەزدان بوو – (گەشتی ناوەوە).

ڕزگـاربوونی لـە سـایەی جـۆرە ڕۆشـناییەکی سروشـــتی پێـــدەگات کـــە نـــاوی لێـــدەنێ – تروســـکاییەکانی – خـــۆی: تروســـکایی فـــیغنی (1882) کـــە سروشـــت خاوەنیـــەتی ئینتبـــاعی یـەکگرتن لەگـەڵ ژیـانی گـەردوونی بـە دەسـتەوە دەدات و پاشان لـە خانـەی مامۆستایان تروسکایی سپینۆزا دەناسێ کـە تیایـدا پـەی بـەوە دەبـات کـە "هـەموو ئـەوەی هەیـە، لـە خوادایـە" و تروسـکایی تۆڵسـتۆی ئەوەیـە کـە دەڵـێ: هـیچ شـتێك نـاتوانێ گیـانی نـەمر بکـات. ئەمـە لەلایـەن ڕۆماننووسـەوە گـۆڕانی بەسـەر دێـت. ئـەو پـەردە هەڵماڵینـەی کـە لێـرەدا پـەی پێدەبـەین و لـە *Buisson Ardent*، (1911) – دووبـــارە دەردەکـــەوێت: گیـــان و تینوویەتی ڕەهایە کە لە بۆتەی نەشوەت پەیوەندی نادیـاری بـوونی خـۆی و سروشـت و یـەزدان دەدۆزێتـەوە. شـەوێکیان بـە تـەنها لەسـەر کورسـیەکەی دانیشـتبوو، لـە سـایەی ڕۆشـنایی مۆمێکـدا خـۆی دابـووە سـەر مێزەکـەی بـەردەمی. بەرەو پەنجەرەکە پشتی وەرگێڕابوو. هیچ کارێکی ئەنجام نەدەدا. ماوەی چەند هەفتەیەك نەیتوانی کار بکـات. هـەموو شـتێك لـە سـەریدا گێـژی دەخـوارد. بەیـەکجار پرسـیاری لـەبارەی هـەموو شـتێکەوە دەکرد: ئایین، ئاکار، هوونەر و تێکڕای ژیانی. لەم توانـەوە گەردوونیـەی بیریـدا هـیچ میتـۆد و ڕێکخسـتنێك لـە ئارادا نـەبوو. خـۆی هاویشتە سـەر دەقگـەلێکی بەڕێکـەوت وەرگـیراوی نێـو کتێبخانـە تێکەڵ و پێکەڵەکەی باپیری و قۆگێل[10] لـە: کتێبی زانســتی ئــایین و زانســتەکان و فەلســەفی کــە کەموکوڕییەکی زۆر لە بەشەکانیاندا هـەبوو و لێیان تێنەدەگەیشـت و کـاتێ کـە دەیخواسـت لـە هەموویانـەوە فێـر بـێ هیچیانی بـۆ تـەواو نـەدەکرا. خـۆی لـە نێـو ئـەو ورێنەکاریانـەدا وون دەکـرد کـە بریتی بوون لە گەڕانێکی بێ کۆتا و دەبوونە مایـەی ماندووبوونێکی زۆر و خەمێکی کوشندە. ئەو شـەوە لـە چوارچـێوەی داهێنـراوی و مانـدوو بوونـدا سەقامی گرت. پەنجەرەکەی کرابووەوە. هیچ بایەك لە حەوشـەکەوە نـەدەهات. بـەفرێکی زۆر تـەنگی بـە ئاسمـانی هەڵچـنیبوو. کریسـتۆف وەك گەمژەیـەك دەیڕوانیـە مۆمەکـە کـە لـە قـوڵایی مۆمدانەکـە دەتوایـەوە و ڕوو لـە کـەمبوون بـوو. نەیـدەتوانی بنـوێ. بیری لـە هـیچ نەدەکردەوە. هـەوڵی دەدا ئـەو قـوڵایی و ناکۆتایـەی کـە هیـوای بـۆ دەخواسـت نەبینێ. ناچار بەسەرلایەکدا نەوییەوە. لە بۆشاییدا تەمومـژەکان دەبـزوان و سـێبەرە تارەکـان چـڕ دەبوونـەوە. ڕاڕایـی نـاخی دەپێکـی. پشـتی لـەرز دایـدەگرێ و موچـڕکە بـە پێسـتەکەیدا دێـت. بـۆ ئـەوەی نەکـەوێ خـۆی بـە مێزەکـە دەلکـێنێ. لـە چاوەڕوانی بە پەلەی شتە نادیارەکان و موجیزە و خوایەکـدا بـوو.. لـە پـڕ وەك نهێنیـەکی کـراوە لـە حەوشـەکە و دوای پشتیەوە گوڕمێك ئـاو بـارانێکی قـورس و بـەربڵاوی تەسـك دابـاری. ڕووخسـارە جێگیرەکـەی تـەزووی پیاهـات. خاکـە ووشـك و ڕەقەڵەکە وەك زەنگێك لێیدا. بـۆنێکی زۆری زەویـە سووتاو و گەرمەکە چەشنی بۆنی گیانەوەر و گوڵ و میـوە و جەسـتە ئەویـندارەکان بـەناو گـرژی و مـۆنی نائیرادییانـەی تـرس و خۆشـی بـەرزبووەوە. کریسـتۆف بـە دۆشـداماوییەوە ڕوویکـردە تـەواوی بوونی خۆی، لە ناخیەوە هەڵدەلەرزێ.. پەردەکە[11]

دادەدڕێ. سەرسامی بەرپا دەبێ. لە ژێر ڕۆشنایی تروسکاییەکەدا شتێك لە قووڵایی شەو دەبینێ، شتێك دەبینێ کە ئەویش -بوونی خوا- بوو. خوا لە ناخیدا بوو: لە بنمیچی ژوور و دیواری ماڵەکە دەکەوت. تەقوهوڕی دەخستە نێو سنوورەکانی بوون و ئاسمان. گەردوون و عەدەمی تەنیبوو. جیهان وەك شالاوێك بەرەو ڕووی دەهات. لە نێوان ترس و نەشوەتی ئەم کەوتنە کریستۆفیش دەکەوێت و گەردەلوولێك هەڵیدەگرێ، وەکو شریتێکی ئاسنین یاساکانی سروشت دەکوتێتەوە. هەناسەی سوار دەبێ، بەم کەوتنەی نێو خودا مەست دەبێ[12].. خوای قولاییەکان! خوای گێژاو و ئاگری پشکۆی بوون! گێژەڵووکەی ژین! شێتی ژیان - بێ مەبەست، بێ جڵەو، بێ هۆ- لە پێناو خۆشەویستی شێتگیرانەی ژیان!

جان کریستۆف. هەرزەکار (ئالبین میشێل، بلاوکەرەوە)

### شادی ئاسمانی ئەفراندن

ژان کریستۆف بە دەست سووك و ڕسوایی شارە بچووکەکە و ناتێگەیشتوویی میرەکە کە ڕاوی دەنێ دڵبریندار دەبێ و شادی ئاسمانی ئەفراندن فریای دەکەوێ. "زمانی ڕاستەقینەی من موزیکە" ڕۆمان ڕۆلان ئەمە لە ساڵی 1906 دەنووسێ کە لە ڕوانگەی کلۆدێل ڕاستەوخۆترین دەربڕین بوو لە ئومێدی بەرز بەخواوەندێتی. لە ڕاستیدا مایەی زانینە تێبینی ئەم چەند بەشە بکەین کە تیادا کریستۆف هەست بە لەدایکبوونی هوونەرمەندێکی گەورە و نزیکایەتی نێوان تەموحی موزیکی دەکات. نووسەر دەڵێ ئەوە لە شێوەی هەورەگرمە خۆی دەسەپێنێ. - و تروسکایی دۆزینەوەی ئاییناییە. لەوێوە، لە جیاتی خەمە کۆمەلایەتیەکانی نووسەر بیری کارەکتەری پیرۆزی هوونەر لە پشت هەموو مۆرالێك دەردەکەوێ و هیوای دەرخستنی شەوێکی 1926ە بۆ ئەوەی لە ڕێگەی کارەکەیەوە بێتە ئامرازێکی خوایی: "کارە هوونەریەکە بەلامەوە لە خۆم گرنگترە. نەك لەبەرئەوەی کارە هوونەرییەکە خودی منە بەڵکو لەبەرئەوەی خودی من نیە و لای ئەوەوە هەڵقوولاوە".

شادی، خۆشەویستی شێتگیرانەی شادی، ئەو خۆرەی کە هەموو ئەو شتانەی هەن و نین و ڕۆشن دەکاتەوە، شادی ئاسمانی ئەفراندن! شادی نیە تەنها لە ئەفراندندا نەبێت. بوونەوەران نین تەنها ئەوانە نەبێ کە ئەفراندن ئەنجام دەدەن. هەموو ئەوانەی دی کە بەسەر زەویدا شەپۆل دەدەن و بە ژیان نامۆن تارماین. هەموو شادییەکانی ژیان و شادی ئەفراندن: خۆشەویستی، پیتۆڵی و کرداری هەڵکراو بەهێزی دەرکەوتووی ئاگری تاقە پشکۆیەکن. خودی ئەوانەی کە ناتوانن شوێنێك لە دەوروبەری ئاگردانی گەورە بدۆزنەوە: خواستی گەورە و خۆپەرستی و سۆزانیە نەزۆکەکانن کە هەوڵ ئەدەن بەم تروسکاییە زەردهەڵگەڕاوانە[13]. خۆیان گەرمکەنەوە. ئەفراندن لەسەر بنەمای جەستە یاخود لەسەر بنەمای ڕۆح دەرچوونە لە زیندانی جەستە و ڕۆیشتنە بەرەو گێژەڵووکەی ژیان و بوونی ئەوەی کە هەیە. ئەفراندن کوشتنی مەرگە[14]. کاتێکە کریستۆف بە دەرپەڕینی ڕووناکیەکە سەرسام دەبێ بەتاڵبوونەوەیەکی کارەبایی جەستەی دەتەنێ، بەهۆی هەڵچوونیەوە هەڵدەلەرزێ وئەمەش وەك ئەوەی لە هەڵکشانی ئاو و تەواوی شەودا بەبێ زەوییەکە دەردەکەوێ.

یاخود وەك بڵێی لە ناوەڕاستی قەرەباڵغیەکەدا تێدەپەڕێت و پێشوازی لە بەریەککەوتنی دووچاوی قووڵ دەچێت. زۆر جار ئەمە کتوپڕ دوای چەند کاژێرێك داهێزراوی ڕوویدەدا کە تیادا هزری بیرۆکەکان لە بۆشاییدا دەوروژێنێ. زۆر جاری دی دووبارە لەو ساتانەی کە تیادا بیری لە شتی دی دەکردەوە دەدوا و یاخود پیاسەی دەکرد. گەر لە شەقامێکدا بوا ڕیزێکی مرۆیی ڕێگەی نەدەدا بە دەنگە دەنگەوە شادی خۆی بخاتە ڕوو. بەڵام لە ماڵەوە هیچ شتێك کاری تێنەدەکرد. بە قاچەکانی لە زەوی دەدا و بوقی سەرکەوتنی لێدەدا. دایکی چاکی دەناسی و ئاکام دەگەیشتە ئەوەی کە ئەم ئامێر ژەنینەی چی دەگەیەنێ. بە کریستۆف دەگووت لە مریشکێك دەچێ لە کاتی هێلکەکردندا. بیری موزیکی ڕۆدەچووە نێویەوە. جارێك شێوەی ڕستەیەکی گۆشەگیر و تەواوی هەبوو و زۆر جاریش تەموومژییەکی[15] گەورە هەموو کارەکەی دادەپۆشی: پێکهاتەی پارچە موزیکیەکە و هێڵە سەرەکیەکانی ڕێگەیان بەخۆیان دەدا بە ئاراستەی پەردەکە پێشبینی بکەن کە بە شوێنی ڕستە دۆشداهێنەرەکانی گریان دەدا و بە پاکیزەییەکی پەیکەرییانەوە خۆیان لە تارماییەکە جیادەکردەوە. ئەوە لە تروسکایی بەولاوە چیدی نەبوو. هەندێ جار بە بەردەوامی لەو بارەیەوە هێزی بۆ دەهات: هەریەکە و سووچەکانی دی شەوی ڕووناك دەکردەوە. بەڵام وەك هەمیشە هێزی گۆڕاو دوای ئەوەی بۆ جارێك لە پڕ دەردەکەوێ بۆ چەند ڕۆژێك لە میان کشانەوە پەنهانەکانیدا وون دەبێت و لە دوای خۆی هێڵێك ئاسەواری ڕۆشن جێدەهێڵێ. ئەم چێژ وەرگرتنە لە سروشت و ئیلهام هێندە زیندوو واقیعیە کە کریستۆف حەز لە پاشماوەکەی ناکات. هوونەرمەندی ئەزمونکار چاك دەزانێ کە سروش و ئیلهام دەگمەنن و لە ڕێگەی زیرەکیەوە کاری هوونەری پێشبینیکارانە بەدەسئەهێنرێ. بیرۆکەکانی دەخاتە ژێر فشار و هەڵگووشینەوەو وایان دەپەستێنێ تا دوا تنۆك و پێکهێنانی گوشراوی یەزدانی کە قەبارەیان بەرفراوان دەکات و هاوکات هەندێ جار بە ئاو ڕوونیان دەکاتەوە.

–کریستۆف بۆ ئەوەی بە چاوێکی سووك سەیری ئەم توانایانە نەکات گەلێ لاو و زۆریش لە خۆی دڵنیابوو. بە ڕادەیەك خەونی مەحاڵ دەکرد کە هیچ بەرهەم نەهێنێ و بەتەواوی نەبێتە کارێکی هەڕەمەکیانە. گەر خۆی لە نێو چێژدا نوقم نەکردبا پێویستی بە ناسینەوەی پوچی مەبەست و ئامانجەکەی نەدەکرد. بێگومان ئەوسا دەکەوتە نێو قۆناغی خۆشی و دەوڵەمەندی ناوەوە کە هیچ دەرچەیەکی نەبوو و لە ڕێگەیەوە عەدەم دەیتوانی بێتە ژوورەوە. هەموو شتێك بۆ ئەم دەوڵەمەندی و بە پیتیە لە بن نەهاتووە دەبوو بە بەڵگە. هەموو ئەو شتانەی کە دیدەکانی دەیبینن و هەموو ئەوانەی دەیبیستن و ئەوانەی لە ژیانی ڕۆژانە خۆیان بە بوونی دەکێشا. هەر ڕوانینێك و ووشەیەك لە ناخدا ترۆقەی بە خەونگەلێك دەکرد و لە ئاسمانی بێ سنووری بیریدا ملیۆنەها ئەستێرە دەڕژانە خوارەوە.

جان کریستۆف. یاخیبوون (ئالبین میشێل، بلاوکەرەوە)

## ماڵئاوایی لە نیشتمان

بۆ داکۆکیکردن لە کیژە لاوێك ژان کریستۆف لە گیانبازییەکدا ئەفسەرێك دەکوژێت. ناچار لە وولات هەڵدێت. هەرگیز وولاتەکەی نابینێتەوە تەنها لە ڕێگەی چەند مانەوەیەکی کورتی نهێنی نەبێ.

بێگومان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕەگەزە هوونەرمەند و "بیرۆکانەی کە کوڕی خۆرن" و بە شێوەیەکی بەرتەسك لە نیشتمانێکدا دەژین: بێگومان لە ناخیا پێشتر موزیکارێك گەشت بەرەو پاریس دەکات وێڕای ئەوەش ئاخۆ لە کاتی دوورکەوتنەوە لە زەوی دایك - چی هەستێك مرۆڤ دادەگرێ! لەم ماوەیەی ساڵی 1907 ڕۆمان ڕۆلان پێدەچێ هەست بە مشتومڕی ناوخۆ بکات. لە نێوان بیروباوەڕی ئەنتەرناسیۆنالیزمی و پابەندبوونی بە نیشتمانەوە دوو هەست بە توونەدی و قوڵییەوە هەوڵی بەستنەوەیان دەدات بێئەوەی لەو میانەوە بەردەوام بگاتە ئاوات.

کریستۆف لە گوندێکی چۆڵدا بە چەند هەنگاوێك دوور لە سنوور هەڵوەستەی کرد. لە بەرامبەرییەوە گۆمێکی فرە بچووك و ئەستێڵێکی گەلێ ڕوون هەبوو کە ئاسمانی خەماویان ڕەنگدەدایەوە. بە میغگەلێك کە بە دوو درەخت دەورەدرابوو پەرژین کرابوو. لای ڕاستەوە سوورە چنارێك کە بەشی سەرەوەی ڕووتابووەوە دەلەرایەوە. لە دواوە دار گوێزێك لقەکانی وەك (مەیخ)[16]ی زەبەلاح ڕەش و ڕووت بوون. پۆلێك قەلە ڕەش بە قورسیەوە بەسەر لا هەڵدەفرین. دوایین گەڵا خوێنپژاوەکان لێکدی دەترازان و یەکبەیەك دەکەوتنە سەر گۆمە مەنگەکە.. پێی وابوو لەوەوبەر ئەم دیمەنانەی بینیوە: ئەم دوو درەخت و ئەم گۆمە..

-کتوپڕ بووە خاوەن ساتێکی ئەم وونبوونەی کە بە دەگمەن لەسەر دەشتایی ژیان دەرچەیەك لە زەمەن بۆ خۆیان دەکەنەوە. چیتر نەیدەزانی لە کوێیە و کێیە و لە چی سەردەمێکدا دەژی و ماوەی چەند سەدەیە دوونیا بەم شێوەیەیە. کریستۆف هەستێکی ئەوتۆی بۆ هات کە ئەم شتانە لەوەوبەر بوونیان هەبووە و ئەوەی کە ئێستا بووە ئێستا نەبووە بەڵکو لە زەمەنێکی دیدا بووە. ئەو هەرگیز خۆی نەبووە. خۆی لە دوورەوە، لە دوورییەکی زۆرەوە دەیبینی و وەك ئەوێکی دی کە لەوەوبەر و هێشتا بەڕاوەستاوی لەم شوێنەدا ماوەتەوە. گوێی لە یادگارگەلێکی چالاکی نادیار دەبێت کە ڕێچکە سەرەکیەکانی دەزرنگێنەوە:

"بەمجۆرە.. بەمجۆرە.. بەمجۆرە.. " سەداو زایەڵەی سەدەکان، ژمارەیەکی زۆر لە کرافت لەوەو پێش هەمان ئەو ئەشکەنجە و ئەزموونەیان چەشتووە کە ئەمڕۆ ئەم دەیچێژێ و تامی ناخۆشی ئەم دووایین کاژێرەی سەر خاکی دایکیان کردووە[17]، بنەچەیەکی هەمیشە گەڕۆك و لە هەموو شوێنێك بە هۆی سەربەخۆیی و ڕاڕابوونیەوە دوور خراوەتەوە. بنەچەیەکی هەمیشە بێچیر بۆ شەیتانێکی ناوەوە کە ڕێگەی نادات لە هیچ کوێدا سەقام بگرێ وێڕای ئەوەی کە بنەچەیەکی وابەستەی خاکێکە کە لە ڕیشەوە هەڵیدەتەکێنن و ناشتوانێ لێی ڕزگار بێت.. کریستۆف بە دەوری خۆی بە هەمان قۆناغەکاندا تێدەپەڕێ و هەنگاوەکانی لەسەر ئەو ڕێگە و ئاسەوارانە پەیان پێدەبرێ کە بەر لە خۆی هەبوون. بە چاوی پڕ لە گریانەوە دەڕوانێ و زەوی نیشتمان. ئەو زەوییەی دەبوو ماڵئاوایی لێبکات لە نێو تەمومژدا وون دەکات.. ئاخۆ بە کەفوکوڵەوە هیوای خۆ لێدورخستنەوەی بۆنەدەخوازت؟ - بەڵێ، بەڵام ئێستا کە بەڕاستی بەجێیدەهێڵێ لە خەماندا هەست بە خنکاوی دەکات. تەنها دڵی گیانەوەر دەتوانێ بێ هەستانە بەرگەی دوورکەوتنەوەی زەوی دایك بگرێت. لە خۆشی و ناخۆشیدا پێکەوە ژیانی ئەو گوند و دایك بوو، ئێمە لە ئامێزیا خەوتین، لەسەریا

نووسـتین، ئێمـە بـەو تێـر ئـاوبوین و لـە ئامێزیـا خەزێنـەی خەونـەکانمان و ژیـانی ڕابـردوو و تـۆز و گـەردی پـیرۆزی ئەوانـەی خۆشمـان دەویسـتن بەجێهێشت. کریستۆف چاوی بە ڕۆژەکانی دواتر و ئەو وێنە ئازیزانەی کە لەسەر یاخود لە ژێر ئەم زەوییە بە جێیهێشتبوون خشاندەوە.. ناتوانێ لە مردووەکانی جیابکاتەوە.. لە نێو سەرجەم ئەوانەی خۆشیدەویستن تەنها بیری دایکی بەجێهێڵراوی لا زیندوو بوو و لە نێو تارماییەکان تەنها بەرگەی تارمایی دایکی نەدەگرت. وەخت بوو سنوور ببەزێنێ بەڵام بەڕادەیەك لە گەڕان بە دوای هەڵاتندا دەسڵەمیەوە.

جان کریستۆف. یاخیبوون (ئالبان میشیل. بڵاوکەرەوە)

ئەمێستا جان کریستۆف لە پاریسە، لە ڕوانگەی ڕۆمان ڕۆلان دەرفەتە بۆ دەربڕینی ئەوەی کە بیری لێدەکرێتەوە لەبارەی هەڵبژاردەی دزێوکراو و جیهانی گەندەڵی هوونەرەکان و سیاسەت و هەروەها مۆزیکی لاواز کە لە - پێشانگای گۆڕەپانەکە، 1908، *Le Foire sur laplace*- ئاشکرای دەکات و سرووش لە گێڕەرەوەکانی سەدەی هەژدەهەم وەردەگرێ. تووڕەیی و هەڵچوونەکانی دەبەخشێتە - ژان کریستۆڤ ڕەفتار سەیر-. نامۆ و داپڕاوە و "ناڕەوایە بەرامبەر بە شارستانیەتێك کە لە یەکەم بزاوتەوە فەرامۆشی دەکات" (یادەوەرییەکان). بەڵام پاڵەوان لە خانوەکەیدا پەی بە چەند کرێچیەك دەبات لە سەرجەم "خێزانە ڕۆحیەکان"ی وڵاتەکەمان و بە تایبەتی هەلی چاوپێکەوتنی ئۆلیڤییە جانێن ی بۆ دەڕەخسێ کە بۆ ئەو دەبێتە پتر لە هاوڕێ و لە برا.

لەگەڵ کەمێك گەشبینی مناڵانە - بەڵام بە داخەوە بە تۆنێکی دروستکراو کە هیچ هەستێکی تەنز ئامێزی تیا بە دیناکرێت - ئۆلیڤیە ئەوەی بۆ دەدۆزێتەوە کە لە ڕوانگەی ڕۆمان ڕۆلان ڕوخساری ڕاستەقینەی فەڕەنسایە: هەڵبژاردەی بوژاوەیە لەلایەن ئایدیال و یاخود لە ڕێگەی باوەڕێکەوە و کەسانی زەحمەتکێش کە فەزیلەتە بێ خەوشەکان دەپارێزن. موزیك دانەرەکە هێواش هێواش ناوبانگ دەردەکات. شارەزایی لە مەڕ ژمارەیەك سەرکێشی ئەویندارى پەیدا دەکات، خۆی تێکەڵ بە بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی دەبینێ و بەهۆی لەدەستچوونی ئۆلیڤیەی کوژراو لە میان یاخیبوونێکی میللی دووچاری ئەشکەنجە دەبێت. لە تخوبەکانی ژیانێکی ئاسوودەی دەستەبەرکراو بە هۆی - خواوەندێتی موزیك - هێمن بە دەستئەهێنێ. لە سویسرا و ئیتالیا نیشتەجێ دەبێ و دووایین کەفوکوڵ و بالابوونە موزیکیەکەی دەکوژێتەوە.

### ئەو ڕۆژەی کە لە دایك دەبێت

لەسەر بنەمای ڕەسەنایەتیەکی ڕاستەقینەی ئەدەبیدا دەردەکەوێ هەرچەند لایەنی سیمبۆلیزمی تیادا کەمێك تێکەڵ و پێکەڵ دەبێت. هاوکات وەك چەند مۆتیفێکی موزیکی بابەتە سەرەکیەکانی سیمفۆنیایەکی گەورە لەخۆدەگرێ. لە ڕووی بوونێکی چڕوپڕەوە وێنەکانی ڕابردوو بە کۆمەڵ دێنەوە یاد، وێنەکانی منالی، وێنەکانی خۆشەویستی و بە تایبەتی وێنەی هاوڕێیەتی کە شانبەشان موزیك پانتاییەکی بەرفراوان لە ژیانی جان کریستۆف داگیر دەکات. لە لێواری مەرگدا.

لێوەکانی موزیکاری گەورە بە شێوەیەکی سروشتی هەڵدەقوڵێ. ئەوە – سروودی ژیانە – ئەو ژیانەی بە هەموو هاودژیەکانیەوە، نەشوەت و گیانەلاّ، شەو و ڕۆژ و خۆشەویستی و کینەیە.

–ئالۆزییەکی دەوڵەمەند کە هارمۆنیا پێکدەهێنێ. بە گوێرەی نووسەر بابەتە لە خودی مۆڕاڵەوەیە و سەبارەت بە پاڵەوانەکەی کە کەسایەتیەکەی لە تەواو بوونێتیدایە چەشنی ناوبانگی ئەم ووتەیەی گۆتەیە: "بمرەو ببەرەوە! *Meurs et deviens*" هاندەر و دڵخۆشکەرێکی گەورە نەبوو دوای دانانی پەیامە قورسەکەی سەر زەوی و پاش ئەوەی دەبێتە ئامرازی خواکەی، – لە لێوارەکەی دی بوەستە کە تیادا "هەموو شتێ تەنها دڵێکە" لەگەڵ دڵنیا بوون لەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان دووبارە لە پێناو "جەنگە تازەکان" لە دایك دەبێتەوە. کریستۆف کەوتە نێو دیمەنێکی پەرۆشی لقی درەختێك کە بە بەردەم زەوییەکی چوار گۆشە تێدەپەڕێ. لقەکە هەڵئاوساو و کانیە شێدارەکان تەقیبوون. گوڵە بچووکە سپیەکان کرانەوە. لەناو ئەم گوڵ و گەڵایانەدا هەموو بوونێکی ژیاوە عەفەویەتێکی سەرنجڕاکێش و فرە بەرهەمی هەبوو کە کریستۆف هیچ هەستی بە چەوساندنەوە و جەستە داماوەکەی نەدەکرد کە لە گیانەڵادا بوو بۆ ئەوەی لقی دارەکەی تیادا بژێنێتەوە. تیشکی هێمنی ژیان وەك ماچکردن شتیەوە. دڵە پڕ لە خۆشەویستیەکەی خۆی بە درەختە جوانەکە بەخشی کە لە دوایین ساتەکانیدا خەندەی دەهاتێ، تەنها بیری لەم خولەکە کردەوە کە بە ملیۆنەها بوون یەکدیان خۆشدەویست و ئەم کاتی گیانەلاّیە بۆ خۆی و کەسانی دی کاتی نەشوەت بوو کە ئەویش بەردەوام بەم جۆرە هەیبوو و هەرگیز لە ئاسوودەیی بەهێزی ژیانی کەمنەدەکردەوە. بە دەنگێك کە مل بۆ بیرۆکەکەی کەچ ناکات دووچاری هەناسە بڕکێ دەبێت، – (لەوانەیە هیچ دەنگێك لە قوڕگیەوە دەرنەچێ بەلاّم ئەو هەست بەو شتە ناکات) – دەست بە ووتنی سروودێکی ژیان دەکات. تیپێکی موزیکی نادیار وەڵامی دەداتەوە. کریستۆف لەبەرخۆیەوە دەڵێ: چییان کرد بۆ ئەوەی بزانن؟ ئێمە وەڵاممان نەدایەوە وەلێ ئەوان بە بێ هەڵە تاکو دوایی بەردەوام بوون! لەسەر قنگ دانیشت بۆ ئەوەی لە نێو تێکڕای تیپەکە بە جوانی ببینرێ. بە دەسە زلەکانی ڕیتمەکەی ڕێکخست. بەلاّم تیپەکە هەڵەیان نەدەکرد و لە خۆیان ڕازیبوون. چەند موزیکێکی دڵڕفێن بوو! ئەوەتا ئێستا بێ ئامادەکاری وەلاّمەکان دەژەنن! کریستۆف بە گاڵتە جاڕییەوە گووتی: "کەمێك چاوەڕێم بە ئەی هاوڕێی خەڵەفاوم! بە نیازم چاك لاسایت کەمەوە". و لێدانێکی سەرگێژکەری ئەنجامدا. پێشەوەی جێهێشت بەرەو لای ڕاست و چەپ کەوتە هاتووچۆیەکی ترسناك.

–"تۆ چۆن خۆت لەوە دەکێشیتەوە؟.. ئەی لەوەیان چۆن؟ هەی سەرلێشێواو! ئەی لەمەی تر چۆن خۆت دەکێشیتەوە؟ ئەوان هەمیشە دەکەونە بۆسەوە، لە ڕێگەی کەسانی سەرکێشتر بوێرانە وەلاّم دەدەنەوە. – بەتەمان چی دابهێنن؟ ئەو کارامە هیچ و پوچانە!.." کریستۆف هاواری کرد براڤۆ و دایە قاقای پێکەنین. – "سەرسامیە! بتوانی فریایان کەوی! بڵێی بتوانم تیادا سەرکەوتووبم؟.. دەزانی ئەوە گەمە نیە! من ئەمڕۆ ماندووم.. گرنگ نییە! ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئەوانە خاوەنی دووایین

ووتە بن.." بەڵام تیپەکە بەشێوەیەکی ئیرتجالی و تازەگەرییانە فانتازیایەك نمایش دەکات کە تەنها گوێ هەڵخستن و دەمکردنەوە نەبێت چیدی لە دەسەڵاتدا نامێنێ. "جوانە! جوانە! هاوڕێیان دووبارە هاردی.. بەڵام ئاخۆ ئەمەیان هی کێبێ؟.. ئێوە دەیڵێن؟ ئێوە دەڵێن ئەمەیان موزیکی جان کریستۆف کرافتە؟ کەواتە بیڵێن! من دەمناسی، لەوانەشە! هەرگیز نەیتوانیوە ئەو موزیکە لە دە ڕیتمدا بنووسێتەوە.. چیتر دەڵێتەوە؟ مەیکەرە هەرا؟ ئەم هاو ئاوازییە چییە؟.. ئەی ئەوی دی؟.. پەلەمەکە! چاوەڕێ بکە!.." کریستۆف چەند هاوارێکی خنکاو چاك دەردەبڕێ. بە تووندی دەس بە پۆشاکەکەی دەگرێ و هێمای نووسین وێنەدەکێشێ. مێشکی ماندوو دەبێ و ئامێرییانە لە گەڕان بە دوای ئەو ڕەگەزانە بەردەوام دەبێ کە ئەم هاو ئاوازیە ئەنجام دەدەن و ئەوانیش ئاشکرایان دەکەن. لەوێڕا ناگاتە هیچ دەرەنجامێك و هەست و هەڵچوونەکان دەردەکەون. دەستپێدەکاتەوە.. ئۆو! ئەمجارەیان، زۆر بوو.. "بوەستن، بوەستن، من زۆر ماندووم.." خواستی ئەو تەواو خاوبووەوە. کریستۆف بە هێمنی چاوەکانی داخست. فرمێسکی شادی لە پێڵوە داخراوەکانی هاتە خوارەوە. ئەو کیژۆڵەیە کە چاودێری دەکرد بێ ئەوەی ئەم ئاگای لێبێ و بە شکۆمەندییەوە کەوتە سڕینەوەی فرمێسکەکانی. هەستی بە هیچ شتێکی ئەوانە نەدەکرد کە لە خوارەوە ڕوویان دەدا. تیپەکە بێدەنگ بوو و لە سەر هارمۆنیایەکی سەرخولێنەر سەقامی گرت کە نهێنیەکەی نەزانرا چییبوو. سێ زەنگی هێمنی لێدرا. چۆلەکەکان لە پەنجەرەکەوە دەیانچریکاند بۆ ئەوەی ئەو کاتانە بێننە یادی کە لە ئاقاریەوە ووردە نانی بەیانی دەدانێ.. کریستۆف لە خەویدا ژوورە بچووکەکەی منداڵی هاتەوە یاد.. زەنگەکان و ئەوەتا بەرەبەیان! و شەپۆلە دەنگیە قەشەنگەکان دەڕژێنە نێو سروەی باکەوە. لە شوێنێکی زۆر دوورەوە دێن. لە گوندەکانی خوارەوە دێن.. هاژەی ڕووبارەکە لە پشتی خانووەکەوە بەرز دەبێتەوە.. خۆی دەبینێ ئانیشکەکانی ناوەتە سەر پەنجەرە پێپلیکانەدارەکە. وەك ڕووباری ڕاین تێکڕای ژیانی ڕژانە ژێر چاوەکانی. هەموو ژیانی.. هەموو ژیانەکانی، لیزا، کۆتغرید، ئۆلیڤیە، سابین[18].. "دایك، دۆست و خۆشەویستان، هاوڕێیان.. چۆن ناویان ئاشکرا دەکەن؟.. لە کوێی خۆشەویستی؟ ڕۆحەکانم لە کوێن ئێوە؟ ئەزانم ئێوە لێرەن و ناتوانم بتانگرم. – ئێمە لەگەڵ تۆداین. – بێدەنگبە ئەی خۆشەویستمان!– حەز ناکەم چیدی لە دەسم بچن، زۆر بە دواتاندا گەڕام!– ئازاری خۆت مەدە. ئێمە هەرگیز جێتناهێڵین. – جێگای داخە، شەپۆلەکان منیان لەگەڵ خۆیاندا برد. – ئەو شەپۆلانەی تۆ لەگەڵ خۆیاندا دەبەن، ئێمەشت لەگەڵ دەبەن.

–ئێمە بۆ کوێ دەڕۆین؟ – بۆ ئەو شوێنەی کە تیادا یەکدەگرین. –ئایا ئەوە بەم زووانە ڕوو دەدات؟ – بڕوانە!" کریستۆف هەوڵێکی زۆری دا بۆ ئەوەی سەری بەرزبکاتەوە.– ئای خوایە! چەند قورس بوو! – ڕووانی ڕووبارەکە لە پڕیاندا کەفاو هەڵدەدات و کێڵگەکان دادەپۆشێ، بەشکۆداریەوە گێنگڵ دەخوات. هێواش و نیمچە ئارامە. وەك تروسکایی پۆلا لە لێواری ئاسۆ وادیار بوو هێڵی شەپۆلە زیوینە لە راوەکانی سایەی خۆر بەرەو ڕووی دێن و

لەولاشـەوە هـاژە و ناڵـەی ئۆقیانووسـە[19]... دڵـە داهیزراوەکـەی دەپرسـێ: "ئایـا ئـەوە خۆیـەتی؟" دەنگـــی خۆشەویســـتانی وەڵامـــی دەدەنـــەوە: "خۆیـەتی" هـەر کـە هـزری دەکەوێتـە گیانـەڵا، بـە خـۆی دەڵـێ: "دەرگاکـە دەکرێتـەوە.. ئەمـە ئـەو قوتابخانەیەیە کە بۆی دەگەڕام!.. بەڵام ئەمە کۆتایی نییە؟ چی ڕەهەندگەلێکی نوێیە!.. سبەی بەردەوام دەبینەوە" ئای چەند خۆشە، چەند خۆشە خۆت لە نێـو ئاشـتی بـاڵای یەزدانـدا وون بکـەیت کـە تیـادا هەوڵی تەواو لە پێنـاو خزمـەتکردنی تێکڕای ژیانی دەدەیـن!.. "ئـەی پـەروەردگار، ئایا لـە پەرسـتارانی خۆت نارازی نیت؟ من لە پێنـاوی تـۆ کـارێکی کـەمم ئەنجامـدا! لـەوە زیـاتر توانـام نـەبووە.. مـن کۆشـام، ئـازارم چەشـت، هەڵـەی زۆرم کـرد و ئەفرانـدنم ئەنجامــدا[20]. ڕێگـــەم بـــدە لـــە ئـــامێزی ســـۆزی باوکایەتیتـدا هەناسـە وەرگـرم. ڕۆژێـك دێـت لـە پێنـاوی جـەنگی تـازەدا لـە دایـك ببمـەوە" گرمـە و ناڵەی ڕووبار و دەریا هاژاوییەکە لەگەڵیا گۆرانیان دەچڕی: "تۆ لە دایك دەبیتەوە، بحەسێرەوە! هەموو تـەنها یـەك دڵـە. خەنـدەی شـەو و ڕۆژی ئـاوێزانبوو، هارمۆنیا[21]، دووا لێزمەی شکۆداری خۆشەویستی و کینە! بۆ هەر دوو باڵە بەهێزەکە گۆرانی دەچڕن و دەڵـێن شـکۆداری بـۆ ژیـان! شـکۆداری بـۆ مـەرگ!" ســان کریســتۆف[22] ڕووبارەکــەی بــڕی. هــەموو شەوێك بە پێچەوانەی تـەوژم دەڕۆیشت. وەك تاشـە بــــەردێك جەســــتەی بــــە هــــەموو ئەندامــــە وەرزشــکارەکانیەوە ئاوێتــەی بەشــی ســەرەوەی ئاوەکــان بــوو. منــداڵێکی لاوازی قــورس بەســەر شــــانیەوە بــــوو. ســــان کریســــتۆف بەســــەر دارسنەوبەرێکی ڕەك هەڵتەکاوی لارەوەبوودا بـوو و هــەروەها بڕبــڕەی پشــتی چــەمابووەوە. ئەوانــە ئەوانـەی بینیـان ڕۆیشتن و ووتیـان هـەرگیز ناگـات. ماوەیـــەکی درێژخایـــەن دوای گاڵتـــە جـــاری و پێکـەنینیان کـەوتین. پاشـان شـەو بـە سـەرداهات و مانـدووبوون. ئێسـتا کریسـتۆف گـەلێ دوورە بـۆ ئەوەی دەنگی ئەوانەی بگـاتێ کە لـەوێ مابوونـەوە. بـە هـۆی هەورەگرمـەوە تـەنها گوێبیسـتی دەنگـی هێمنی مناڵەکە بوو کە بە دەستە چکۆلانەکەی تەڵـە موویـەکی خستە سـەر تـەوێڵی دێوەکە و دووبارەی کــردەوە "بــڕۆ بــەرێوە!" - ڕۆیشــتەڕێ، پشــتی چـەماوەو چـاوەکانی ڕاسـتە سـەیری پێشـەوەیان دەکـرد و لەسـەر ئـەو لێـوارە تاریکـە جێگیر بـوو کـە کەندەلانــە ســەختەکەی ســپی دەبــووەوە. کتــوپڕ، تـەپڵی مـۆژدە گەیانـدن لێـدرا و کۆمەڵـە زەنگەکـە بەدەم بزاوتـەوە وەئاگا هـاتن. ئەوەتا بەرەبەیانێکی نـوێ! لـە پشـت ئـەو قەراغـە بەردینـەی کـە پێشـە ڕەشـــەکەی بـــەرز دەبـــووەوە و خـــۆری وونبـــوو سـەردەکەوێتە نێـو ئاسمـانێکی زێـڕین. کریسـتۆف خـەریکبوو دەکـەوت ئاکـام گەیشـتە لێوارەکـە. و بـە منداڵەکـەی گـووت: "ئـەوە گەیشـتین! چـەند قـورس بـووی! ئـەی منـاڵ، کـەوا بـوو تـۆ کێـی؟" مناڵەکـە ووتی: "من ئەو ڕۆژەم کە لە دایك دەبم"[23]

ژان کریستۆف، ڕۆژێکـی نـوێ (ئالبین میشێل، بڵاوکەرەوە).

## پەراوێزەکان

1- *Eclectique*، انتقـــائی: لـــە ووشـــەی ئیکلێکتیـــزم داتاشـراوە و بریتیـە لـە دۆکترینێکی فەلسـەفی کـە هـەموو لایەنە چاکەکانی فەلسەفەکان گوڵبـژێر دەکـات. وەرگێـڕ، فەرهەنگی مەنهول.

2-ڕۆمانی ڕووبار، *Le Roman – fleuve*، روایة النهر: چیرۆکێکی درێژە کە ژیانی خێزانێک بە سەرجەم نەوەکانیەوە دەخاتە ڕوو.

3-*Le Buisson ardent*، شوك النار: جۆرە ڕووەکێکی قەددار و جوان و ڕازاوەیە سەر بە جۆری گوڵەکانە و بەرەکانی سوورن. وەرگێڕ (فەرهەنگی مەنهەل، فەرەنسی – عەرەبی)

4-جان کریستۆفەکەم ڕووباری ڕاینە کە بەرەو دەریا دەڕوات. ئەمانە بۆ من خوازە گەلێك نین بەڵکو دەنگی ناوەوەی ڕووبارەکەن. (1933).

5-ڕووباری ڕاین بە بەردەم ماڵەکەدا دەڕژێتە خوارەوە. پەنجەرە قادرمەدارەکە وەك لەناو باخچەیەکی جولاوەدا بێ بەسەرووی ڕووبارەکەوە هەڵواسراوە. (بەرەبەیان)

6-هەستی موزیکیم ئەو حەزەی کە ژیانم دەتەنێ لە موزیك و ئامێرە موزیکیەکاندا بەدی ناکرێ. ئەوە لە سەرەتای سروشتە و پاشان لە گشت ئەو شتانەدایە کە خۆراکی ڕۆحیان لێوەردەگرم. ئەوە موزیکی دارستان و چیاو دەشتەکانە کە لە دەفتەری یاداشتەکانی لاویمدا تۆمارم کردبوون. (یادەوەرییەکانی ناخم، 1938)

7-ش ف. ل، 113

8-گلیسین، *glycine*: ڕەگەزێك ڕووەکی لقلێکەوتووەکانە لە جۆری شاخدارەکان. (مەنهەل)

9-بۆماوەیەك تووشی بێزاری دەبن وەك بڵێی لێکتر تووڕە ببوون.

10-ڤۆگێل: ئەو کەسەیە کە جان کریستۆف لە پاش مردنی باوکی لە ماڵەکەیدا پەی بە میوانداریی‌یەکی چاك دەبات.

11-تروسکایی ڤێغنی: "ئەوە پەردەیەك بوو کە دادەدڕێ. هەستی کرد کە گیان -بیر- لەلایەن نەشوەتی یەکلاکەرەوەی سروشت هێرشی بۆ دەبرێ"

12-تروسکایی (*eclair*)ی سپینۆزا: "هەموو شتێك لە نێو خوادایە، منیش هەروەها لەناو خوادام! لە پەنجەرە بەستووەکەمەوە کە شەوی زستانی بەسەردادێ، لە میان خۆری سپیبووندا لە دەست گێژاوی گەوهەر – ماهیەت – هەڵدێم" (گەشتی ناخ)

13-"بوونە خودا بە دەوری خۆی بوونە بە ئاگردانی شادی، بوونە بە خۆری ژیان" جان کریستۆف.

14-ئەم هێزە بە سوود یاخود بێ سوود دەردەکەوێت و لە میانی پراکتیکیدا مەترسیدارە. ئەمە هێزە، ئەمە ئاگرە، تروسکایی هەڵقولاوی نێو ئاسمانە: پیرۆزی لەوێوەیە، چاکەکاری لەوێیە.. لەو ئاسمانە دەچێ کە لێمەوە دیارە. خۆر نەمۆراڵە و نەش نامۆراڵ. ئەو ئەوەیە کە هەیە. شەو و هوونەریشی لەناو دەبات. (لۆ بویسۆ داغدان)

15-سەرەتا ئینتیباعی موزیکی تێکڕای کارەکەم وەك تەمومژ بینی و پاشان مۆتیفە سەرەکیەکانیم لەو ڕوانگەیەوە وێناکرد. (1895)

16-مەیخ: ڕەگەزێك گیانەوەری دەریاییە سەر بە کۆمەڵەی پەراسوودارەکانە. وەرگێر فەرهەنگی ئەلمەنهەل. فەرەنسی – عەرەبی.

17-کرافتەکان بە بنەچە هۆڵەندی بوون. باپیرە گەورەی جان کریستۆف هەروەها بەناچاری بەهۆی شەڕێکەوە هۆڵەندەی جێهێشتووە.

18-دایکی ژان کریستۆف و مام و هاوڕێ هەرە ئازیز و ئەو بێوەژنەی کە خۆشی دەویست.

19-هێمایە بۆ ڕووباری ژیان و دەگاتە دەم ڕووبارەکە و خۆی لە نێو ئۆقیانووسدا وون دەکات واتە خۆی لە نێو خواوەندێتی – *divinite* –دا وون دەکات.

20-"گرنگ ئەوەیە.. لە تویێ سەرجەم کارەکانماندا ئاگری نەمری هەڵبکەین" (بڕوانە جان کریستۆف، لاپەڕە 111، پێشەکی.

21-"بـــەدوای جـــوانترین هارمۆنیـــا بگـــەڕێ، ئـــەو هارمۆنیایـــەی کـــە هـــەنگوینی ڕەشـــی لێکنەچـــووەکانە" (ڕۆحـی ئاسـوودە). لـە ڕوانگـەی ڕۆمـان ڕۆلان کـە دوورە لەوەی بێتـە وابەسـتەی هـیچ دۆکترینێـك، هوونـەری ژیـان بـریتی نییـە لـە بچووککردنەوە بـە هـۆی پوختکردنـەوەی لێکدژایەتی دۆکترینەکان بەڵکو بریتییە لە پێکهێنانەوەی دژەکان.

22-کریســـــتۆف هەســــــتی هـــــەڵگری - مەســــــیح - (کریستۆفرۆسی یۆنـانی) دەگەیـەنێ: ئەفسانەکە دێوێك دروسـت دەکـات کـە ڕۆژێکیـان بـۆ تێپـەڕینی ڕووبارەکـە منداڵێــك بەســـەر شــان هەڵــدەگرێ. ئــەو منداڵــەش تــەنها مەسیحی منداڵە.

23-ئەو منداڵەی کە جان کریستۆف هەڵیدەگرێ پەیامی ژیـــــانێکی پـــــڕ لـــــە ووزە و خۆشەویســــــتیەکی گەردوونیـە. پەیامەکـە پـیرۆزی خـۆی لـەم ڕۆژە نوێیـەدا دەدۆزێتەوە کە بوونی سـەر زەوی خـۆی ئاراسـتە دەکـات و ناونیشـــانی دووایـــین کتـــێبی جـــان کریســـتۆف لێـــوە هەڵدەهێنجرێ.

## سەرچاوە


*collection Litteraire Lagarde et Michard*

***XX e siecle***

***Roman Rolan, Page 105-116***




# گفتوگۆ

## فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست

-گفتوگۆ لەگەڵ ئەنتۆنی کێنیدا-

برایان ماگی

لە فارسییەوە: محەممەد کەریم

## فەلسەفەی سیاسی لە جیهانی ئەمڕۆدا

-گفتوگۆ لەگەڵ جۆرج کاتبدا-

رامین جەهانبەگلو

لە فارسییەوە: کارزان محەممەد

# فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست

## گفتوگۆ لەگەڵ ئەنتۆنی کێنیدا

**برایان ماگی**

**لە فارسییەوە: محەمەد کەریم**

### پێشەکی

لە خوێندندا، واباوە کە مێژووی ئەوروپا دەکەن بە سێ قۆناغی گەورەوە واتە چاخی کۆن و سەدەکانی ناوەڕاست و سەردەمی نوێ. لە فەلسەفەی خۆرئاواشدا هەروا باوە و قسە لە فەلسەفەی کۆن و فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست و فەلسەفەی نوێ دەکەن. کتێبەکانی مێژووی فەلسەفەش کە چاپ دەکرێن، زۆریان دەکرێن بە هەمان ئەو سێ بەشەوە، هەروەکو وتیشمان، لە خوێندنی زانکۆکانیشدا هەمان بەشکردن بەکار دەهێنرێ.

لە فەلسەفەی کۆندا، ئەفلاتون و ئەرستۆ بالا دەستن. ئاشکرایە نەك تەنها بەر لەم دوانە، بەڵکو دوای ئەوانیش فەیلەسوفی دیکەی گرنگ و جێگەی بایەخ لە دنیای کۆندا هەبوون، بەلام هیچ کام لەوانە چەند نووسراوێکی وایان لێ بەجێنەماوە کە بە گشتی لە رووی چەندایەتی و چۆنایەتی و کاریگەرییەوە لەگەڵ بەرهەمەکانی ئەو دوو فەیلەسوفەدا شایانی هەڵسەنگاندن بێت. بالا دەستی ئەفلاتون و ئەرستۆ بەرادەیەکە کە هەرکەسێ بۆ خوێندنی فەلسەفەی کۆن بچێتە زانکۆ، تەقریبەن دەبینێ - یان رەنگە بە ڕاستی - هەموو کاتەکەی بۆ بەرهەمەکانی ئەم دوو فەیلەسوفە تەرخان دەکرێ.

پاشان ئەگەر کەسێکی وا بیەوێ درێژە بە خوێندنەوەی فەلسەفە بدات، رەنگە ببینێ کە پێیدەڵێن لە ئەرستۆوە ڕاستەوخۆ بچێتە سەر فەلسەفەی تازە و بەیەك بازد یەکسەر سەدەکانی ناوەڕاست بەجێبهێڵێ. بەلام ئەو قۆناغەی کە قسەی لەبارەوە دەکەین، زیاتر لە هەزار ساڵ لە خۆیدەگرێ، واتە لە ڕوخانی ئیمپراتۆریەتی رۆم-ەوە هەتا ڕێنیسانس. بەداخەوە نەوەکانی ئەم دواییە بە زۆری لە فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست بێئاگان، بەڕای من، هۆی سەرەکی ئەمەش ئەوە بووە کە تەقریبەن هەموو فەیلەسوفانی جێی متمانە لەسەراپای سەدەکانی ناوەڕاستدا زانای ئاینی و قەشە

مەسیحیەکان بوون، لە کاتێکدا کە لە یەك دوو سەدەی بەر لە چاخی نوێدا، کاردانەوەی بەرفراوان بەرامبەر بە مەزهەب و بە تایبەتی دژایەتی بەر فراوانی دەسەڵاتەکەی لە فیکردا هەبووە. لە سەردەمی ئەم کاردانەوەیەدا فەیلەسوفانی سەدەکانی ناوەڕاست ڕووبەڕووی بەدگومانیی بوونەوە کە بە چاوپۆشیی لەوەی لێکۆڵینەوەکانیان بە چ ئەنجامێ بگات، شوێن ڕاستی ناکەون، بە پێچەوانەوە، بۆ ئەو شتەی پێشان باوەڕیان پێیەتی بە دوای بەڵگەی بەهێزدا دەگەڕێن. بەڵام ئەم کاردانەوەیەش وەکو زۆربەی کاردانەوەکان– لەوانەش کاردانەوە ڕاستەکان – سنووری بەزاند. جێی متمانەترین فەیلەسوفانی سەدەکانی ناوەڕاست بەراستی زانای مەزن بوون بەو مانایەی کە ئەمڕۆ ئێمە لە فەلسەفەمان دەوێ، بەڕاستی لە فەلسەفەدا کاریان دەکرد و ئێمە هێشتا دەتوانین زۆر شتیان لێوە فێر بین.

لە فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاستیشدا وەکو فەلسەفەی کۆن، دوو فەیلەسوف لەوانی دی دیارتربوون، هەرچەندە یەکێکیان لەسەرەتای ئەو قۆناغە و ئەوی تریان لە کۆتاییدا ژیاوە. یەکەمیان (قەشە ئۆگەستین – *St. Augustine- o*) کە لە ساڵی (354)ی زایندا لە باکووری ئەفریقا هاتۆتە دنیاوە و گەرچی لە ژیانیدا سەفەری زۆری کرد، لە هەمان شوێنی لەدایکبوونی لە ساڵی (430)ی زایندا کۆچی دوایی کرد. دوو کتێب لە نووسینەکانی بە پەسەندکردنی هەمووان لە کتێبە گەورەکانی جیهانن. یەکێکیان (دانپانان *The Confessions*) و ئەویتریان (شاری خودایی – *The City of God*)ە. کارەکتەری دووەمیش لە ڕووی پێگەوە لە یەکەم کەمتر نییە" واتە تۆماس ئەکویناس (*Thomas Aquinas*) کە لە ساڵی 1225دا لە ئیتالیا لەدایکبووە و لە ساڵی 1274دا کۆچی دواییکردووە. ئەکویناس بە گشتی لە ئۆگەستین تەکنیکاڵترە و ناسراوترین بەرهەمەکانی دوو کۆمەڵەی گەورەیە بۆ شاگردان. یەکێکیان (کۆمەڵەی لەڕەتدانەوەی کافراندایە – *Summa Contra Gentiles*) کە بە ناونیشانی (ڕاستێتی مەزهەبی کاسۆلیك – *On the Truth of the Catholic Faith* تەرجومە کراوە بۆ ئینگلیزی)، ئەویتریان (کۆمەڵەی زانستی کەلام* – *Summa Theologiae* یان کورتەی کەلام –ە – *Summary of Theology*).

لە دوای مردنی ئۆگەستین و ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم قۆناغێك دەستی پێکرد کە ئەمڕۆ بە سەدەکانی تاریکی ناسراوە. لە ماوەی ئەو سەدانەدا، هێندە خوێندەوار و زانای ئەوروپای خۆرئاوا هەبوون کە پاشماوەی شارستانیەت لە ناو پێکدادانی شەپۆلە یەك لە دوای یەکەکانی دەستدرێژکاریی و داگیرکاریی هۆزە بەشدارەکاندا، بپارێزن. لەو بارودۆخ و هەلومەرجەدا، کاری زانایان زیاتر لایەنی پارێزگاری و چاودێری هەبوو، ماوەیەکی دوور و درێژ تەقریبەن هیچ بەرهەمێکی گرنگ و جێی متمانە نەهاتە ئاراوە. لە ماوەی حەوت سەد ساڵی نێوان ئۆگەستین و ئەنسیلمدا -(1033–1109) – *St. Anselm*)، تەنها یەك فەیلەسوفی پلەیەك سەریهەڵدا ئەویش (جۆن سکۆتلەندایی – *gohn the Scot*) بوو کە لە سەدەی نۆهەمی زایندا ژیاوە.

بەڵام کاتێ لە سەدەی یانزەی زایندا دەگەینە سەر ئەنسیلم، زنجیرەیەك بیریاری گرنگ دەبینین کە بەخێرایی دەبنە جێنشینی یەکتری: وەکو ئەبلار[1] لەسەدەی دوانزەهەمدا، ڕۆجەر بیکۆن[2] و تۆماس ئەکویناس لە سەدەی سیانزەهەمدا و پاشان دەنس سکۆتوس[3] و ویلیام ئەکمی[4] کە بە دەرکەوتنی ئەمانە سەدەکانی ناوەڕاست وردە وردە دەگاتە کۆتایی.

بۆ قسە و باس دەربارەی ئەم قۆناغە دوور و درێژ و نائاشنا و سەرنج راکێشە لە مێژووی فەلسەفەدا، ئەنتۆنی کێنی *Anthony Kenny* ڕاگری کۆلێجی بیلیۆل – *Ballil College* –م بانگهێشت کردووە کە نەك تەنها یەکێکە لە فەیلەسوفە هاوچەرخە دەگمەنەکان و خاوەنی

بەرهەمێکی زۆرە سەبارەت بە فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست، بەڵکو بۆ خۆشی سەروەختێ قەشەی کاسۆلیك بووە.

ماگی

## کرۆکی باسەکە

**ماگی: بەر لەوەی باس لەلایەنە دیارەکانی فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست بکەین، ئایا دەتەوێ شتێ بخەیتە سەر ئەو کلێشە گشتیەی کە من بە شێوەیەکی گشتی بۆ ئەو قۆناغەم ڕەسمکرد؟**

کێنی: منیش بە ئاماژەکەی تۆ ڕازیم کە ئەو دوو فەیلەسوفە واتە - قەشە ئۆگەستین و ئەکویناس-ت، بە مەبەستی کۆکردنەوەی دەسکەوتەکانی سەدەکانی ناوەڕاست ناوبرد. بەڵام ئەم دوانە دوو کەسی زۆر جیاواز بوون. ئۆگەستین تاکە بیریارە کە بەناوبانگترین بەرهەمی ژیاننامەکەی خۆیەتی. بنەمای دانپیانانی بیرکردنەوەی قووڵی خۆی و خوێندنەوەی تایبەتی بۆ تەورات و ئینجیل و ژیانی دەروونی خۆی. ئەکویناس جیاوازە، کەسێکی بێوێنە نییە" سوار چاکی ڕێبازێکی مەزهەبی و زانستییە. ئەکویناس ئەندامی بنەماڵەی گەورەی مەزهەبی دۆمینیکان بوو لەناو راهێبانی ئەو زنجیرەیەدا دەژیا. جگە لەوەش مامۆستای زانکۆ بوو. یەکێك لە سەرکەوتنەکانی، بریتییە لە نوسینی دوو کتێبی مەنهەجی زانکۆ. لە هەموو ئەم شتانەدا بە پێچەوانەی ئۆگەستین-ەوەیە کە زانایەکی بێوێنە بوو بە جۆرێك کە لە کۆتایی ژیانیدا ببوو بە (ئەسقەف)، جگە لەو لە هەموو شارەکەدا هیچ کەسێ تەنانەت یەك کتێبیشی نەبوو.

**ماگی: بەو پێیە، ئەم دوو کەسە نموونەی دیاری دوو جۆر فەیلەسوفن کە لە کۆنەوە هەتا ئێستا هەمیشە وجودیان هەبووە، لە لایەکەوە بیریارانی گۆشەگیر و تەنیا کە سەری خۆیان کز دەکەن، لەلایەکی ترەوە کارەکتەرانی ئەکتیڤن لە دامودەزگاکاندا کە مامۆستای زانکۆ نموونەی جۆرێکە لەوانە.**

کینی: لە تەواوی مێژوو فەلسەفەدا دەبینێت کە فەیلەسوفان وەکو تاکە کەس لە یەکێ لەم دوو گروپەدا جێگەیان دەبێتەوە. بلیمەتانی گۆشەگیر و تەنیای وەکو دیکارت و سپینۆزا کە داوی بیریان لە قوڵبوونەوە و رامانی خۆیان دەچنن، لە قاڵبی ئۆگەستیندا فۆرمەڵە بوون. لەلایەکی ترەوە مامۆستا زاناکانی زانکۆت هەیە، وەکو کانت و هیگل، کە لە فەلسەفەدا دەزگا دروست دەکەن و ئەم دەزگایانە دەگاتە شاگردانیان و نەوەکانی دواتری فەیلەسوفان و لەسەر دەستی ئەوان ڕێکوپێك دەکرێ.

**ماگی: قسەکانمان دەربارەی مامۆستایانی زانکۆ دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ئەو بیرەی کە زانکۆ یەکەمجار لە سەدەکانی ناوەڕاستدا سەریهەڵداوە دامەزراندنی کاریگەریی گەورەی هەبوو لەسەر فەلسەفە. دەکرێ سەبارەت بەم بابەتەش شتێکمان پێ بڵێی؟**

کینی: دامەزراندنی زانکۆ یەکێك بوو لە پڕ بایەخترین خزمەتەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بە فەلسەفە. مەبەستم لە زانکۆ گروپێ کەسە کە کارەکتەری یاساییان هەبێ کە بە شێوەیەکی پیشەیی و هەردەم سەرقاڵی وتنەوەی کۆمەڵێ زانستبن و ئەو زانیاریانە بگوێزنەوە بۆ شاگردەکانیان و بەرنامەی دەرس وتنەوە و میتۆدی فێرکردنی پەسەندکراویان هەبێ و پابەندی چەند بنەمایەکی پیشەیی دیاریکراوبن. زۆر جێگەی سەرنجە کە فەلسەفە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا چەند کارێکی پیشەیی وردبووە. بەر لە هەموو شتێ لە رووی قەبارەی گەورەی بەرهەمی فەیلەسوفەکانەوە،

ئـەكويناس تەنانـەت بـە پێـی كـەمترین خەمڵاندن، هەشـت ملیـون وشـە بابـەتی نووسـیووە. هەنـدێ نوسینیش هەن كە مشت و مڕیان لەسەرە سەبارەت بەوەی هی ئەون یان نا، ئەگەر ئەم بەرهەمانەشی بخەینە سەر، كۆی وشەكان دەكاتە یانزە ملیۆن. هەشـت ملیـون وشـە زۆرە. هـەموو بەرهەمـەكانی ئەرستۆ كە ئەمڕۆ لەبەر دەستماندایە، تەنها یەك ملیۆن وشەن. هەموو بەرهەمەكانی ئەفلاتون تەنها نیو ملیون دەبن. ئەكويناس بە درێژایی تەمەنێكی تاڕادەیەك كورت، هەشت ملیۆن وشە دەنووسێ و ئەم هەشت ملیۆنە، ئەم وشانە ئەوە نین هەر وا لە خۆڕا و بێهوودە ریزی كردبن، بەڵكو ئەو وشانەن كە زانایـان هـەتا ئـەمڕۆ هەوڵـدەدەن بگەنـە مانـای كۆتاییان.

قـەبارەی نووسـینەكان گەورەیـە، بـەڵام لـە وردەكاریش بێبـەش نین. تـەكنیكی بەرهەمـەكانی سەدەكانی ناوەڕاست بریتییە لە دیالۆگ و ئەمە لە نووسینەكانی ئەكويناسیشدا بەدی دەكرێ. دیالۆگ یەكێك بوو لە تەكنیكە گرنگەكانی وانە وتنەوە لەو سـەردەمەدا. مامۆسـتا یـەكێك لـە خوێنـدكارە پێشكەوتووەكانی لەلایەكەوە دادەنـاو یـەكێك یـان چـەند خوێنـدكارێكی لـە خـوارتری لـە بەرامبـەردا دادەنا. خوێنـدكارە سەركەوتووەكە دەبوو داكۆكی لـە بۆچوونێكی تایبـەتی بكـات، لـە بابـەتی ئـەوەی جیهان لە كاتدا سەرەتایەكی نییە (یان كۆنە) یان بە پێچەوانەوە جیهان لە كاتدا سەرەتایەكی هەیە (یان تازەیـە). خوێنـدكارەكانی تـر دژی ئـەو بۆچـوونە دەوەستانەوە و بۆچوونێكی تریان باس دەكرد كە دژی ئەو بۆچوونە بوو. بەڵام هەردوولا دەبوو بە پێـی ڕێسـا وردەكـانی لۆجیـك بەڵگـە بهێننـەوە. دواجار، مامۆستا كێشەكەی یەكلایی دەكردەوە و هەوڵیدەدا ڕوونیبكاتـەوە كـە چ شـتێ لـە قسـەكانی لایەكدا ڕاست بووە و چ ڕەخنەیەكی بەهێز و ڕاست لەلایەن لاكەی ترەوە گیراوە.

ئەگـەر –كۆمەڵـەی زانسـتی كـەلام–ی تۆمـاس تەماشـا بكـەیت، دەبینیـت ئەگـەر چـی هـیچ دیـالۆگێكی ڕاسـتەقینەی تێـدا نەنووسـراوە، ئاماژەكانی ئەم میتۆدە بەرچاو دەكەوێ. هەركاتێ ئـەكويناس دەیـەوێ تیـۆرێ یـان بۆچـوونێكی فەلسـەفی یـان كـەلامێكی تایبـەتی تـەرح بكـات، یەكـەمجار سـێ بەڵگـەی بـەهێز بـاس دەكـات كـە بۆ ڕەتكردنـەوەی ئـەو تیـۆر و بۆچـوونە بـە خەیاڵیـدا دێت. ئـەم میتـۆدە، دیسـپلینێكی سـەیر لـە فیكـردا دەهێنێتـە ئـاراوە و نایـەڵێ مەسـەلەكان بەڕاسـت وەربگـرێ. ناچـارت دەكـات لـە خـۆت بپرسـیت: "دەمـەوێ سـەبارەت بـە چـی قەناعـەت بـەكێ بكـەم و بـەهێزترین نـاڕەزایی كـە لایـەنی بەرامبـەر ڕەنگـە دەریببڕێ چییە؟"

كەواتــە ئــەم دوو تایبەتمەندییــە خاســیەتی فەیلەســوفانی ســەدەكانی ناوەڕاســت بــوو كــە یەكێكیان زۆری نووسینەكانیان و ئەوی تر میتۆدی وردی خسـتنە ڕووی مەسـەلەكان بـوو. سـێیەمین تازەگەریی سەدەكانی ناوەڕاست بەرنامەی خوێندن بوو. بەرنامەی خوێندن لە زانكۆ بەو مانایە بوو كە چەند مادەیەكی دیاری كراو هەبوون و هەر كەسێ دەچـووە زانكـۆ، دەبـوو فێـری ئـەو مادانـە بـبێ. كۆمەڵێ زانیاری بوون كە دەبوو خوێندكار فێریان بێت بەر لەوەی بیەوێ بەردێكی بچووك بخاتە سەر خـانووی زانسـت. میتـۆدێ بـوو كـە دەبـوو سـەرەتا لەبـەر بكـرێ و پاشـان، ئەگـەر بـوار هـەبوو، لەگـەڵ هەندێ شتی تردا بە خوێندكاران بوترێتەوە.

بەرنامـەی خوێنـدنی سـەدەكانی ناوەڕاست بـە تایبــەتی لەســەر بنــەمای بەرهەمــەكانی ئەرســتۆ ڕێكـدەخرا. بەرهەمــەكانی ئەرســتۆ لــە ســەرەتای

قۆناغی کرانەوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا تەرجومە کران بۆ لاتینی. کەسانێکی کەم لە فەیلەسوفە مەزنەکانی سەدەکانی ناوەڕاست یۆنانییان دەزانی بەڵام وەرگێڕانی باش بەلاتینی لەبەردەستدا بوو وفەیلەسوفەکان بە زۆری هەوڵیان دەدا هەر چەند دەکرێ زانیاری لە بەرهەمەکانی ئەرستۆ دەربێنن و پاشان خۆیان زیاتر پەرەی پێبدەن و دایبڕێژنەوە.

**ماگی: بەر لەوەی بگەمە گرنگترین بابەت واتە ناوەڕۆکی ئەو بەرهەمانە، دەمەوێ پرسیارێکت لێبکەم کە رەنگە کورتبینانە بێتە بەرچاو بەڵام رەنگە وەڵامێکی هەبێ کە سەرنج ڕاکێش بێ. هەر کەسێکی ئینگلیز کە دەست بکات بە خوێندنەوەی فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست، بە ناچاری سەرنجی بەلای ئەوەدا ڕادەکێشرێ کە زۆر لە سیما دیارەکانی لەو سەردەمەدا، خەڵکی بەریتانیا بوون یان بەشێکی گرنگی تەمەنیان لەوێ بەسەربردووە. ئەم حوکمە سەبارەت بە زیاتر لە نیوەی ئەو کەسانەی کە لە پێشەکی ئەم گفتوگۆیەدا ناوم هێنان ڕاستە: جۆن سکۆتلەندایی، ئەنسیلم، رۆجەر بیکۆن، دەنس سکۆتوس، ویلیام ئەکمی و هتد. ئایا ئەم مەسەلەیە تەنها رێکەوتە یان روونکردنەوەیەکی سەرنجراکێشی هەیە؟**

–کێنی: هەڵبەتە ئەم ڕاستییە زۆر مایەی سەرنجە، بەڵام ئەگەر کەسێك بڵێت فەلسەفە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا تایبەتمەندیی ئینگلیزی هەبووە، بەڕای من، ئەو ڕاستییە فریوی داوە.

**ماگی: من بە هیچ جۆرێ مەبەستم لەوە نەبوو.**

–کێنی: ڕاستە کە زۆر لە فەیلەسوفان بەشێك لە تەمەنیان لە بەریتانیا بەسەر بردووە و تەنانەت هەندێکیان لەوێش لەدایك بوون. بەڵام نابێ ئەوە فەرامۆش بکەین کە ئەنسیلم ئیتالیایی بوو و دەنس سکۆتۆس و ویلیام ئەکمی زۆربەی کاتیان لە وڵاتانی ئەوروپا بەسەر دەبرد. هەر وڵاتێکی ئەوروپای خۆرئاوا لەبەرچاو بگری، دەبینیت زۆر لە فەیلەسوفە مەزنەکان ماوەیەك لەوێ بوون. هۆکەشی ئەوەیە کە کۆمەڵگای زانکۆ لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، کۆمەڵگایەکی زۆر ئەوروپایی بوو. نەتەوەی عیسا، واتە نەتەوە مەسیحیەکان، یەك کۆمەڵگای زانکۆیان پێکدەهێنا. کەسێك کە لە زانکۆیەك بروانامەی بەدەست هێنابوو، دەچوو لە زانکۆیەکی تر دەرسی دەوتەوە. لە هەموو زانکۆکاندا بە زمانێکی هاوبەش قسە دەکرا کە هەمان زمانی لاتینی ئەهلی کڵێسا بوو و کۆچ لە نێوان زانکۆکاندا زۆر بوو. هەڵبەتە ئەمە پەیوەندیی بە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستەوە هەیە. پاشان، بە هۆی جەنگە نیشتمانیەکانەوە وەکو جەنگی سەد ساڵەی نێوان بەریتانیا و فەرەنسا — ئەم جۆرە کۆچ و سەفەرانە وەستانی تێدەکەوێ، لەلایەکی ترەوە، بەرەبەرە ئەدەب بە زمانە زیندووە نەتەوەیی وناوچەییەکان دێتە ئاراوە و دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵك تەنانەت ئەگەر وەکو رابردوو بەلاتینیش قسە بکەن، بەرە بەرە بە زمانی خۆیان، بۆ نموونە بە ئینگلیزی، بیر بکەنەوە. بەم شێوەیە جێگای بایەخە کە دەبینین دوا فەیلەسوفی بەڕاستی گەورەی سەدەکانی ناوەڕاست، جۆن ویکلیف[5]–ە کە ڕاست دوای ویلیام ئەکمی دێت و یەکێك لە هۆیەکانی ناوبانگی ئەوەیە کە بەهاندانی ئەو، تەورات و ئینجیل بۆ یەکەم جار تەرجومە دەکرێ بۆ زمانی ئینگلیزی. لەگەڵ دەرکەوتنی ویکلیفدا، تەمەنی کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی زانکۆی لاتینی زمان بەرەو کۆتایی دەچێت و ئەمەش یەکەم قۆناغی پەڕاگەندەیی بەربەری کلتورە نیشتمانییە جیاوازەکانە بە زمانە جیاجیاکان.

**ماگی: با بێینە سەر خودی فەلسەفە. یەکێك لە نارەحەتیەکان لە سەراپای سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەوەبوو**

**کە دەیانەویست تیۆری فەیلەسوفە مەزنەکانی یۆنانی کۆن لەگەڵ ڕێنماییەکانی ئاینی مەسیحدا بگونجێنن. لە سەرەتای قۆناغەکەدا، بە شێوەیەکی سەرەکی ئەفلاتون جێگەی بایەخپێدان بوو بەڵام پاشان، وەکو خۆشت ئاماژەت بۆ کرد، ئەرستۆ جێگەی بایەخ بوو. بەڵام، بەهەر بار، هەموو یان حەزیان بە هێنانە ئارای گونجاندنێکی لەو جۆرە دەکرد. دەکرێ لەم بارەیەوە ڕوونکردنەوەیەکمان بدەیتێ؟**

-کێنی: گونجاندنی تیۆرەکانی ئەرستۆ لەگەڵ مەسیحیەتدا، جێگەی بایەخپێدانی تایبەتی ئەکویناس و جێنشینانی بوو. بەڕای من ئۆگەستین، زیاتر لە ئەرستۆ بایەخی بە ئەفلاتون دەدا و لە بنەڕەتدا وەکو سەرچاوەی زانست و هوشیاری زیاتر لە تیۆری هەر فەیلەسوفێ بایەخی بە تەورات و ئینجیل دەدا. لە سەراپای سەدەکانی ناوەڕاستدا هەست بە ئامادەبوونی ئۆگەستین دەکرێ. فەیلەسوفەکانی دواتری سەدەکانی ناوەڕاست وا تەماشای ئۆگەستین یان دەکرد کە هەموو ئەو زانیارییە ئاینیانەی لە ترادیسیۆنی مەسیحیەوە هەڵقولاون کە لە ڕێگەی تەورات و ئینجیلەوە گەیشتبوون، ئەو کۆی کردوونەتەوە و تۆماری کردوون. بەڵام کاتێ لە سەدەی دوانزە و سیانزەی زایندا بەرهەمەکانی ئەرستۆ تەرجومەکران بۆ لاتینی. زانایان بینیان کە، جگە لە ترادیسیۆنی مەسیحی، کۆمەڵێ زانیاری دیکەش هەن کە باسی دنیا و مرۆڤ دەکەن و باسی ئەوەش دەکەن کە ئێمە چ جۆرە بوونەوەرێکین و چ کارێ شایستەی ئێمەیە، هەموو ئەم باس و خواسانەش لە فەلسەفەی فەیلەسوفە کۆنەکاندا و بە تایبەتی لای ئەرستۆ بەدیدەکرێ. ئەرستۆ لە زۆر لایەنەوە، یەکێك بوو لەسەرسوڕهێنەرەکانی ڕۆژگار و زۆر بوار کە پاشان بوون بە بەشی جیاوازی فەلسەفە، بە دەستی ئەو دامەزران، وەکو لۆجیك و فەلسەفەی سەرەتایی و دەروونزانی و گیاناسی و زانستی ڕووداوەکانی فەزا *Meteorology*. ئەرستۆ دامەزرێنەری ئەم زانستانە و زانستی تر بوو کە لە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستدا هێشتا بە کامڵترین شێوە تەنها لە نووسینەکانی ئەودا بەدی دەکران.

**ماگی: نازانم ئەم پرسیارەی کە دەمەوێ بیکەم بە چ وشەیەك دەربڕم کە سووك نەیەتە بەرچاو چونکە مەسەلەکە بەڕاستی جددیە. بە حسابکردن بۆ ئەوەی فەیلەسوفانی سەدەکانی ناوەڕاست لە ناخی دڵیانەوە باوەڕیان بە ئاینی مەسیح هەبوو و باوەڕیان وا بوو کە تەورات و ئینجیل لەسەرچاوەی خوداییەوە ئیلهامیان وەرگرتووە و ئەولیای کڵێسا نوێنەری خودان لەم دنیایەدا و قسەیان مشتومڕ هەڵناگرێ، کەواتە ئیدی بۆچی بایەخیان بەوە دەدا کە زانایانی کۆن چییان وتوە؟ مەگەر ڕێنماییەکانی لە هەموو بوارێکدا باڵاترین بەڵگە نەبوون؟ مەگەر ئەو ڕێنماییانە تیۆری زانایانی دێرینی ڕەت نەدەکردەوە؟**

-کێنی: فەیلەسوفانی سەدەکانی ناوەڕاست باوەڕیان وا بوو کە ئاینی مەسیح زانینی تەواوی بۆ ڕزگاربوون خستۆتە بەردەستیان تەنانەت ژنێکی جل شۆری هەژار و تەواو بێئاگاش لە زانیاری زانایانی دێرین ئەگەر ئاگای لە ڕاستیەکانی مەسیحیەت بێ، ڕەنگە بە هەمان شێوە بچێتە بەهەشت و بەشکۆمەندییەوە لە نزیك خوداوە ژیان بەسەر بەرێ وەکو کەسێکی وەکو تۆماس ئەکویناس بەو هەموو زانیارییەوە. بەم پێیە، هەڵەیە ئەگەر وا بیر بکەینەوە کە کەسانی وەکو ئەکویناس کە زەینێکی چالاك و لاپرەسەنگیان هەبوو و دەیانەویست هەتا دەتوانن دەربارەی مرۆڤ و جیهان زانیارییان زیاد بکەن، لە ژیاندا تەنها سەرنجیان لەسەر ئاین چڕ کردۆتەوە. هەڵبەتە وەکو دروستکراوی خودا حسابیان بۆ مرۆڤ و دنیا

دەكرد، بەڵام بۆچوونیان وا بوو كە خودا تەنها لە ڕێگەی كتێبی پیرۆزی وەكو تەورات و ئینجیلەوە قسەمان بۆ ناكات بەڵكو بە زمانی داهێنانیش دەربارەی جیهان قسەمان بۆ دەكات.

**ماگی: من خۆم لە سەرەتادا كە فەلسەفەی سەدەكانی ناوەڕاستم خوێندەوە، یەكێك لەو مەسەلانەی كەمایەی سەر سوڕمانم بوو ئەوە بوو كە شتەكان لە فەلسەفەی ئەو قۆناغەدا چەند پەیوەندیان بە ئایینەوە نییە. زۆر شیكردنەوەی وەكو هی ئەمڕۆ هاتە بەرچاو، لە دەستەواژەو چەمك كە تا ئەوپەڕی ڕێكو پێك بوون و زۆر كاری پڕ بە هام لە لۆجیكدا بەدیكرد — ڕەنگە لە هەمووشی سەرێتر-كاری سەرنجراكێش و هەندێ جار تازە بووبێ لە هەموو زانستەكاندا لە میكانیكەوە هەتا دەروونزانی. زۆری ئەم بەرهەمانە سەر سوڕهێنەرن و زۆر بەشیان بە شێوەیەكی سەیر لە ژێر كۆنترۆڵەكانی ئەو قۆناغەدا نین.**

—كێنی: زۆر لەو زانستانەی كە دوای ڕێنیسانس بوون بە بواری سەربەخۆ، تۆوەكەیان لە فەلسەفەی سەدەكانی ناوەڕاستدا چێنرابوو ئەگەر ئەم فەلسەفەیە بەخێزانێك تەشبیهبكەین، دەبینین هەموو ئەم زانستانە لەو سەردەمەدا منداڵی ئەو خێزانە بوون و لە قۆناغی گەشەكردندا بوون. ناونیشانی هەندێ لە مامۆستایانی زانكۆی ئەو كاتە، بە تەنها حیكایەتی ئەم بابەتەی دەگێڕایەوە. لە ئۆكسفۆرد دەبینین ناونیشانی مامۆستای فیزیك، مامۆستای فەلسەفەی سروشتییە. ئەمە ئەوە نیشان دەدات كە بواری فیزیك لە دەرسی فەلسەفەی سروشتییەوە سەرچاوەی گرتووە. بەرنامەی ئەم دەرسە لە یەكێك لە كتێبەكانی ئەرستۆوە بە ناوی فیزیك یان (سماع طبیعي)[6]ەوە ئامادەكرابوو.

نوسینەوەكانی ئەرستۆ نموونەی بەرنامەی دەرس وتنەوە بوون لە سەدەكانی ناوەڕاستدا كە لە لۆجیكەوە دەستی پێدەكرد. لۆجیك لە داهێنانەكانی ئەرستۆ بوو بەڵام لە سەدەكانی ناوەڕاستدا گەشەكردنێكی گەورەی بە خۆیەوە بینی و یەكێك بوو لەو مادە كەمانەی كە هەر كەسێ لەو ڕۆژگارەدا دەچووە زانكۆ، دەبوو فێری بێت. ئێمە لەم ساڵانەی دواییدا سەرلەنوێ زۆر مەسەلە و هونەری لۆجیكی ڕەوانمان دۆزیوەتەوە، كە لە كۆتایی سەدەكانی ناوەڕاستدا لای خوێندكاران تەواو ئاسایی بووە و پێی ئاشنابوون. لە سەردەمی ڕێنیسانس و ریفۆرمی ئایندا، گەشەی لۆجیك وەستاو تا كۆتایی سەدەی نۆزدە تەنها بەشێوەی كەموكورت و ناتەواو لە زۆربەی زانكۆكانی ئەوروپادا دەخوێندرا. لە كۆتایی سەدەی نۆزدەدا، نەوەیەكی نوێ لە زانایانی لۆجیكی بیركاری — وەكو گۆ تلوب فرگێ — *Gottlob Frege*" لە ئەڵمانیا و بێرتراندر روسیل – *Bertrand Russell* و ئەلفرێد نورس وایتهید – *Alfred North Whithead* لە بەریتانیا لە ڕێگەی بیركارییەوە چوونە سەر لۆجیك و ئامانجیان ئەوە بوو كە ڕەگ و ڕیشەكانی بیركاری لە لۆجیكدا بدۆزنەوە. لۆجیك دووبارە لە سەردەستی ئەم جۆرە كەسانەدا بوژایەوە و یەكێك لە بەرهەمەكانی كتێبی گەورەی پرنسیپی بیركاری – *Prinipia Mathematica* — بوو. وایتهید و روسیل دەیانەویست لەم كتێبەدا نیشانی بدەن كە ئەگەر بەشێوەیەكی ڕێكوپێك لە شتە لۆجیكیە ئاشكراكان بكۆڵینەوە، دەتوانین هەموو حسابە سەرەتاییەكان لەو پرنسیپە ئاشكرایانەوە هەڵبهێنجین. بوژانەوەی لۆجیك لە سەرەتای سەدەی بیستدا، بوو بە هۆی دۆزینەوەی چەند لقێكی تر لە لۆجیك لە ڕۆژانی پێش و دوای جەنگی جیهانی دووەم دا كە لە سەدەكانی ناوەڕاستەوە تا ئەو كاتە بە تەواوی لەبەر چاو ونبوون. تا پێش نەوەی خودی خۆم،

خەڵك هێشتا ئەو دوو بەشەی مێژووی لۆجیکیان بەیەك نەگەیاند بوو و نەیاندەزانی کە هەندێ لە نوێترین ئەندێشەکان لە لۆجیکدا هەمان ئەو بابەتانەیەکە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە تەواوی زانراون.

**ماگی: من بۆ خۆم کاتێ یەکەمجار فەیلەسوفانی وەکو دەنس سکۆتوس و ویلیام ئەکمی –م خوێندەوە، خوێندنەوەی چەند ساڵ پێشتری خۆمم بە یاد هاتەوە لە لۆجیکی سەدەی بیستدا. وام هەستدەکرد کە چەند نووسەرێکی دوور و نا ئاشنا و تەنانەت نامۆش دەخوێنمەوە. بەلام، بەپێچەوانەی چاوەڕوانی خۆمەوە، بینیم کە سەرۆکاریم لەگەڵ چەند کەسێکدایە کە سەرقاڵی کۆمەڵێ کار بوون کە تەواو ئاشنایە. هەتا ریتمی دەربڕینیشیان بە گوێم ئاشنا بوو. بەم پێیە ئایا دەکرێ بگوترێ کە میحوەری فەلسەفە – بەلای کەمەوە بەو شێوەیەی کە لە ئەورووپای خۆرئاوا دەخوێندراو دەخوێندرایەوە – لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لۆجیك بووە و لە حاڵی حازریشدا هەم لۆجیکە، بەلام لە بەشی زۆری ماوەی جیا کەرەوەدا، وانەبووە؟**

–کێنی: بەڵێ، دەکرێ بوترێ. هەر بۆیە کەسێك کە فەلسەفەی تازەی خوێندووە، کاتێ تێکستەکانی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست دەخوێنێتەوە، هەندێ جار هەستێکی وا سەیری ئاشنایی و قایل بوونی لا دروست دەبێت. بەلام پاش سەدەکانی ناوەڕاست، خەڵك ئەو حەز و ئارەزووەی کە بۆ لۆجیك و خوێندنەوەی فەلسەفەی زمان هەیانبوو، لە دەستیاندا. هەڵبەتە بە زۆری بایەخیان بە خوێندنەوەی زمان دەدا لە رووی هونەری حیکایەتخوانی و لە رووی ئەدەبییەوە. بەلام ئارەزووی پێشوویان سەبارەت بە پەیوەندیی زمان لەگەڵ لۆجیکدا لە دەستدا. لە دیکارت بە دواوە، بایەخی فەیلەسوفەکان بەر لە هەر شتێ لەسەر ئەپستمۆلۆجیا –*epistemology*– چڕ کرایەوە. بنچینەی ئەپستمۆلۆجیا ئەو پرسیارەیە کە ئێمە چۆن مەعریفە لەسەر ئەو شتانەی کە دەیزانین بە دەست دەهێنین؟ چۆن ئەو شتانەی کە دەیزانین، لە بنچینەدا دەتوانین بیزانین؟ ئەپستمۆلۆجیا، زمان و لۆجیکی خستە دواوە. بەلام لە ڕۆژگاری فیرگێ و ڕوسیلەوە تانەوەی ئێستا، لۆجیك و زمان، بە تایبەتی لە بەریتانیاو ئەمریکا، دووبارە لە فەلسەفەدا کەوتنە پێشەوە. پرسیاری گەورەی فەیلەسوفەکان لەم ساڵانەی دواییدا ئەوە بووە کە "مانای ئەوەی دەیڵێت چییە؟" نەك ئەوەی "چیدەزانی؟" تایبەتمەندیی فەلسەفە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەوە بوو – و ئەمڕۆش هەمان شتە – کە هەر پرسیارێ لە زانست یان لە بیرکاریدا یان لە هەر شتێکی تردا دەبێ ئاگایی ئەوەی لەگەڵدا بێ کە مانای ئەو پرسیارەی دەیکەین چییە.

**ماگی: هەروەکو لە پێشەکی ئەم دیالۆگەدا باسمکرد، باوترین تۆمەت لە دژی فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست بەشێوەیەکی گشتی ئەوە بووە و ئەوەیە کە فەیلەسووفەکان لەو سەردەمەدا، بەر لە دەستبەکاربوون، یەکەم ملکەچی کۆمەڵێ بیروباوەڕی دوور و درێژ دەبوون دەربارەی بوون بە گشتی، بەم پێیە، لە جیاتی ئەوەی بێلایەنانە دەست بە لێکۆڵینەوە بکەن، بە دوای بەڵگەی بەهێزدا دەگەڕان بۆ سەلماندنی بیرو باوەڕەکانیان. تۆ ئەگەر وەڵامی ئەم پرسیارە بدەیتەوە، چۆن وەڵامی ئەو تۆمەتە دەدەیتەوە؟**

–کێنی: ئەمە وەك پێویست تۆمەتێکی گرنگ نییە لە دژی هیچ فەیلەسوفێ کە بڵێن بۆ سەلماندنی ئەوەی پێشان باوەڕی پێی بووە، بە دوای بەڵگەی بەهێزدا دەگەڕێ. دیکارت بە نموونە دەهێنمەوە کە بە جلی فەرەحەوە لای ئاگرەوە دانیشتبوو و بۆ سەلماندنی ئەو بابەتە بە شوێن

بەڵگەی بەهێزدا دەگەڕا و دەزانیت چەند درێژەی پێدا تا دواجار ئەو بەڵگانەی دەیەویست بە دەستی هێنا. بێرتراند روسیل، ئەکویناس بەوە تاوانبار دەکات کە بەڕاستی فەیلەسوف نەبووە چونکە ویستوویەتی بە هەر حاڵ ئەوەی باوەڕی پێی هەبووە، بیسەلمێنێ. بەڵام سەیرە کە روسیل تۆمەتێکی وا بداتە پاڵ ئەکویناس کە خۆی لە (پرنسیپەکانی ماتماتیک)دا بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ دوو کەڕەت دوو دەکاتە چوار - واتە ئەو شتەی کە لە هەموو تەمەنیدا باوەڕی پێبووە - سەدان لاپەڕە دەنووسێ.

**ماگی: ئەو بابەتەی کە ئێستا فەرموت زۆر زۆر بایەخدارە بەڵام لەبەرئەوەی پێموانییە کە بۆ خەڵك بە ئاسانی قابیلی تێگەیشتن بێت. ئەو بەهایەی هەیە کە جەختی لێبکرێتەوە. هەر فەیلەسوفێکی شایەنی بایەخپێدان و گرنگ دەبێ چەند بیر و بۆچوونێکی جیاوازی لەوانی دی هەبێت، دەنا کەسێکی جێگای بایەخ و گرنگ نابێ. بە درێژایی هەزاران ساڵ، تەقریبەن هیچ جۆرە بیروبۆچوونێکی فەلسەفی نەبووە کە لە خەیاڵدا بەرجەستە و جێگیر بوو بێ و لەلایەن یەکێك لە فەیلەسوفەکانەوە پەسەند نەکرابێ. بەڵام ئەوەی کە فەیلەسوفێکی خۆشناو لە چاو فەیلەسوفێکی ناوناخۆشدا پایە بەرزتر دەکات ئەوە نییە کە یەکەمیان پابەندی کۆمەڵێ بیر و بۆچوونی "ڕاست" و بنەڕەتیە" خاڵی جیاوازییان ئەوەیە کە یەکەمیان، بە چاوپۆشی لەوەی چ بیر و باوەڕێکی هەبێ، ئامادەیە چەند بەڵگەیەك بۆ ڕاستی بیر و بۆچوونەکەی بهێنێتەوە و ئەو بەڵگانە بخاتە بەردەم قورسترین و وردترین پشکنینەوە و تەسلیمی ئەنجامی ئەو پشکنینە بێت. ئەو بیرو بۆچوون و بەڵگە و میتۆدانەی کە هەیەتی دەیخاتە بەردەم شیکردنەوەی ڕەخنەگرانەی خۆی و کەسانی ترەوە و ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان پەسەند دەکات. هەتا کاتێ ئەم کارە بە راستگۆیی فیکری تەواوەوە ئەنجام بدات، بە مانا ڕاستەقینەکەی فەیلەسوفە، بە چاوپۆشی لەوەی مەسیحی یان هندۆس یان بێدین یان هەر شتێکی دیکە بێت. میتۆدی شیکاریی ئەوەی سەلماندووە کە هەندێ بیروباوەڕ هێندە بیمارن - واتە بۆ نموونە لاواز و نەگونجاون یان پڕیانە لە ناکۆکی - کە ئەمڕۆ ئیدی بە پێچەوانەی رابردووەوە ناکرێ هیچ کەسێکی خاوەن راستگۆیی فیکری و هۆشیار بە بیروبۆچوونی لەو جۆرە قایل بێت. فەرامۆشکردنی ئەم جۆرە بیروبۆچوونانە بۆ خۆی بەشێکە لە پێشکەوتنی فیکری.**

-کێنی: راستی ئەوەیە کەس ناتوانێ فەیلەسوفێکی زۆر باشبێ و بەو پێیە، باوەڕی بە شتی زۆر سەیر و سەمەرە هەبێ. کاری سەرەکی فەیلەسوف ئەوەیە کە بەڵگەی بەهێز لە بەڵگەی لاواز جیا بکاتەوە و جیاوازی ئەم دوانە پەیوەندیی بەوەوە نییە کە لە کوێوە دەست پێدەکەیت و دەگەیتە کوێ. من و تۆ ئێستا جیاوازیمان کرد لە نێوان بیروبۆچوونی کەسێك و بەڵگەکانی ئەو کەسەی لەسەر ئەو بیرو بۆچوونانە. ئەم جیاوازییە لەگەڵ فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاستدا پەیوەندیی نزیکی هەیە و رەنگە لە بەرهەمی هیچ فەیلەسوفێکدا هێندەی تۆماس ئەکویناس ئاشکرا نەبێت. ئەکویناس مەسیحیەکی ئیماندار بوو، بەو پێیە پابەندی کۆمەڵێ بیرو باوەڕ بوو. بەڵام باوەڕی بە زۆر شتی دیکەش هەبوو لەبەر ئەوەی کتێبەکانی ئەرستۆ و بەڵگە هێنانەوەکانی خوێندبۆوە. بەو پێیە، دەیویست بە وردی جیاوازیی لە نێوان ئەو دوانەدا بکات: واتە لە نێوان بیرو باوەڕەکانی وەکو واعیزێك و بیر و بۆچوونەکانی وەکو فەیلەسوفێك. وەکو واعیزێ ئەرکی خۆی دەزانی کە ئەوەی لە گۆتەی بەسەرهاتی دنیا و رزگاری مرۆڤ و ئایندەی دنیادا لە کتێبی ئاسمانی مەسیحی و ڕێنماییەکانی کلێسادا بە وەحی ئاشکرا ببوو، راڤە بکات و

ئاراستەی بکات. وەکو فەیلەسوف، دەیویست بە پێی توانای خۆی لەوە تێبگات کە دنیا چۆن شوێنێکە و ئەو ڕاستیە پێویستانە کامانەن کە پەیوەندییان بەم دنیایەو بە بیرکردنەوەی خۆمانەوە هەیە و بە بێ پەنابردنە بەر وەحی خودایی وتەنها بە یارمەتی عەقڵ، بۆ ئێمە قابیلی زانینە.

**ماگی: یەکێك لە نموونەکانی ئەم خۆناسینە زۆر پەسەندە سەبارەت بەو جیاوازییە کە لە بیری مندا ماوەتەوە لە یەکێك لە نووسینەکانی ئەکویناسدا بەناونیشانی (سەمەدیەتی جیهان – *On the Eternity of the world*) بە دی دەکرێ. ئەکویناس دەڵێت لەسەر بنەمای تێبینی فەلسەفی ڕووت، هیچ هۆیەك نییە بۆ ئەوەی وا بیر نەکەینەوە کە جیهان هەمیشە هەبووە و هەتا هەتاشە هەر دەبێت. بەلام خودی خۆی وەکو مەسیحیەکی ئیماندار باوەڕی بە شتێکی وا نییە، بەڵکو باوەڕی وایە کە خودا دنیای لە نەبوونەوە دروست کردووە و دواجار ڕۆژێکیش کۆتایی پێدەهێنێت.**

–کێنی: بەڵێ، ئەمە نموونەیەکی زۆر باشە. هەندێ فەیلەسوفی مەسیحی لەو ڕۆژگارەدا وا بیریان دەکردەوە کە دەکرێ ئەوە بسەلمێنرێ کە جیهان سەرەتایەکی هەبووە (یان تازەیە) و لەبەرئەوە بۆچوونێکی وایان هەبوو کە باوەڕیان بە هەندێ بەشی کۆمەڵە ناکۆتاکان نەبوو. ئەکویناس خەوشی ئەم بەڵگە هێنانەوەیە نیشان دەدات و بەڵگە دەهێنێتەوە کە، بە پێچەوانەی باوەڕی ئەرستۆوە، هیچ ناکۆکیەك لەو فیکرەدا نییە کە جیهان لە کۆنی کۆنەوە هەبووە و هەتا هەتاشە بەردەوام دەبێت بە باوەڕی ئەکویناس، کەس ناتوانێ بە تەنها لەسەر بنەمای عەقڵی مرۆڤ و (بەبێ پەنابردنە بەر وەحی) بیسەلمێنێ کە جیهان سەرەتایەکی هەبووە یان نەیبووە (تازەیە یان کۆنە)، ئەرستۆ کە کارێکی وای بە مومکین زانیووە، جێگای ڕەخنەیە. ئەکویناس فەیلەسوفێکە لە ئەرستۆ زیاتر گومانی هەیە و دەڵێت هیچ کام لەم لەو دوو مەسەلەیە قابیلی سەلماندن نین. ڕەنگە بپرسیت کەواتە خۆی چۆن باوەڕی وا بوو کە جیهان سەرەتایەکی هەبووە؟ ئەگەر ئەو بیویستایە وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە پشتی بە (سفر تکوین) دەبەست لە تەوراتدا. بە دەربڕینێکی تر، وەکو مەسیحییەك و وەکو واعیزێك باوەڕی بە شتێکی وا هەبوو، نەك وەکو فەیلەسوفێك.

لە پێشەکی ئەم باسەدا، تۆ ئاماژەت بۆ کتێبی گەورەی ئەکویناس واتە "کۆمەڵەی لە ڕەتدانەوەی کافراندا و کۆمەڵەی زانستی کەلام" کرد. کۆمەڵەی لە ڕەتدانەوەی کافراندا بە مەبەستی نووسینی بەرهەمێکی فەلسەفی نووسراوە و ڕووی لە کەسانێکە کە مەسیحی نین وەکو موسوڵمانان و جولەکەکان و بێدینەکان. ئەکویناس دەیەوێ کۆمەڵێ بەڵگە بۆ ئەم جۆرە کەسانە بهێنێتەوە – کۆمەڵێ بەڵگە کە هەموو مرۆڤێ دەتوانێ بە نیاز پاکیەوە ئەوە دەستنیشان بکات کە تۆکمەن – و لە سەر ئەوە بنیات نراون کە خودا هەیە و خودی مرۆڤ نەمرە و شتی تر. کۆمەڵەی زانستی کەلام زۆر جیاوازە: ئاراستەی مەسیحیان کراوە و ئەو مەسەلانە قبوڵ دەکات کە لە تەورات و ئینجیل داهاتوون و دەیانکات بە بنەمای بەڵگە هێنانەوە، بەلام وێڕای ناونیشانەکەی کە گوزارشت لەوە دەکا کتێبەکە دەربارەی کەلامە، بڕێکی زۆریش بیری فەلسەفی لە خۆ دەگرێ.

**ماگی: بوار بدە تەرکیز بکەینە سەر مەسەلەیەکی فەلسەفی تایبەتی و مەسەلەیەك وەربگرین کە هەم بنەڕەتیە و هەم لە سەرتاپای سەدەکانی ناوەڕاستدا جێگەی بایەخی فەیلەسوفەکان بووە. با ئەو مەسەلەیە هەڵبژێرین کە ئایا دەکرێ بوونی خودا بە بەڵگەی لۆجیکی بسەلمێنرێ و**

**ئەگەر دەکرێ ئەو بەڵگەیە چییە؟ بەڵام جارێ بوار بدە بامنیش شتێ بخەمە سەر قسەکانی تۆ دەربارەی ئەو گروپەی ئەهلی کلێسا کە رووی دەمیان دەکردە کافران هەندێ لەوانە ئەو کارەیان بە ئەرکی ئاینی خۆیان دەزانی، بەڵام دەیانبینی کە لە قسە و باس لەگەڵ کافراندا، پشت بەستن بە مەرجەعیەتی کلێسا یان بەڵگەهێنانەوەکانی ئینجیل بێهوودەیە لەبەرئەوەی بەرامبەر ئەو مەرجەعیەت و بەڵگەهێنانەوەیەی قبوڵ نییە. لەبەرئەوە، ئەم گروپە تەنها پشتیان بەو بەڵگە هێنانەوانە دەبەست کە خۆی لە خۆیدا گوێی لێبگیرێ و ئەوەیان دەستنیشان دەکرد کە نابێ بێهوودە خۆیان دەربارەی توانا و سکۆمی بەڵگەکان فریو بدەن چونکە ئەگەر بەڵگە هێنانەوەکە لاواز بێت، لەبەرامبەر گومانکەرە زیرەکەکان داخۆی ناگرێ و تێکدەشکێ. بەم پێیە، دەبینین کە فەیلەسوفە مەسیحیە بالا دەستەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، تەنانەت بەڵگەکانی خۆشیان سەبارەت بە سەلماندنی بوونی خودا دەدەنە بەر رەخنەی توند، هەڵبەتە هەروەکو تۆزێ پێش ئێستا وتمان، ئەمە کارێکە کە هەر فەیلەسوفێکی مەسیحی دەبێ بیکات.**

**بەڕای من، ناسراوترین بەڵگە بۆ سەلماندنی بوونی خودا لە مێژووی فەلسەفەدا، ئەوەیە کە پێی دەوترێ "بەڵگەی بوون *On to local argument*" کە نەك تەنها چەندان جار لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەمدیو دیو کراوە و شیکراوەتەوە، بەڵکو سەر لە نوێ لەبەرهەمەکانی دیکارت و سپینۆزا و لایب نیتس و کانتدا سەرهەڵدەداتەوە و هەتا ئەمڕۆش جێگای بایەخە. ناسراوترین روخسار ئەنسیلم لە سەدەی یانزەی (زایندا) بە بەڵگەی بوون-ی بەخشیووە. دەکرێ ئەوە روون بکەیتەوە کە ئەو روخسار بەخشینە چی بووە؟**

—کێنی: بەڵێ، بەڵام بەر لەوە، دەبێ ئەوە بۆ ئەو کەسانە روون بکەمەوە کە موتابەعەی ئەم باسەی ئێمە دەکەن کە لە بنەڕەتدا بەڵگەی بوون چییە، چونکە رەنگە وشەی (بوون)، ببێتە هۆی سەر لێشێوان. لە سەدەکانی ناوەڕاست و قۆناغەکانی دواییدا، ئەو بەڵگانەی بۆ سەلماندنی بوونی خودا دەخرانەروو دوو بەش بوون. لە بەشی یەکەمدا کە دیارترین نموونەی (پێنج رێگاکە)ی تۆماس ئەکویناسی قەشەیە، یەکێك لە خاسیەتەکانی جیهان دەکەیتە سەرەتاو لە خاسیەتێکی زۆر دیارەوە دەست پێدەکەیت، لە بابەتی ئەوەی کە هەندێ شت لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر دەجوڵێن یان هەندێ شت دێنە بوون و دوایی لەناو دەچن. تۆماس ئەم جۆرە مەسەلانە لەگەڵ چەند راستیەکی گشتی فەلسەفیدا دەکاتە پرنسیپ و ئەوە دەسەلمێنێ کە شتێك لە دنیادا هەیە کە قابیلی دەستنیشانکردنە و مرۆڤ ناوی دەنێ خودا. بەم بەشەی بەڵگە دەڵێن "بەڵگەی جیهانناسی – *cosmological orgument*" چونکە لە جیهان یان لە هەمان جیهانی دەورو بەرمانەوە دەست پێدەکات. بەڵام بەڵگەی بوون لە بەشێکی ترە چونکە خودی وێناکردن یان چەمکی خودا خۆی لە خۆیدا دەکاتە پرنسیپ. بەم پێیە، لە بەڵگەی بووندا پێویست نییە بۆ ئەوەی خاڵێکی دەستپێکردن بە دەست بێنی، لە سنووری فیکر و وێناکردن بچێتە دەرێ.

قەشە ئەنسیلم، ناسراوترین روخساری بەم بەڵگەیە بەخشیووە و وادیارە خۆشی داهێنەری بووە، چونکە بەڵگەکانی تر لە راستیدا لەو ئەندێشانەوە سەرچاوە دەگرن، کە لەبەرهەمەکانی ئەرستۆدا بە دیدەکرێن. بەڵگەی ئەنسیلم زۆر داهێنەرانە و هۆشمەندانەیە و پێناسەی وشەی (خودا) دەکاتە بنەما. ئەنسیلم دەڵێت خودا شتێکە کە لەو گەورەتر قابیلی وێناکردن نییە. باشە، ئەم پێناسەیە خەوشێکی تێدا نییە و تەنانەت ئەو کەسەی کە باوەڕیشی بە خودا نییە، رەنگە لە

قبوڵکرنیدا کێشەیەك نەبینیٚ، چونکە تۆ هەرچەندە باوەڕت بە شتێکیش نەبیٚ، بە هەرحاڵ پێویستت بە پێناسەیەکی ئەو شتە دەبیٚ کە باوەڕت پیٚ نییە. کەواتە رەنگە تەنانەت کەسانی بێدینیش بەو پێناسەیە قایل بن کە دەڵیٚ خودا شتێکە کە لەو گەورەتر قابیلی وێناکردن نییە. بەڵام پاشان ئەنسیلم بە کەسی بێدین دەڵێت: "باشە، ئێستا کە وایە، وایدابنیٚ کە خودا تەنها لە زیهندا هەیە و لە دەرەوە نییە. بە هەرحاڵ ناچاریت بوونی خودا لە زیهندا قبوڵ بکەیت چونکە لەم ساتەوەختەدا دەربارەی خودا بیر دەکەیتەوە و ئەوەی کەشتیٚ لە زەیندا هەبیٚ، واتە ئەوە، بەڵام ئەگەر خودا تەنها لە زیهنی ئێمەدا هەبوایە و لە دەرەوە نەبوایە، تۆ دەتتوانی شتێکی گەورە تر لەو وێنا بکەی، واتە شتێك وێنا بکەی کتومت وەکو ئەو خودایەی کە ئێستا دەربارەی بیر دەکەیتەوە، بە کورتی هەم لە دەرەوە دەبوو هەم لە زیهنی تۆشدا دەبوو، بەم پێیە، گەورەتریش دەبوو. کەواتە، شتێکی گەورەتر لە خودا وێنا دەکرا. بەڵام ئێمە ئەوەمان قبوڵ کرد کە خودا شتێکە کە هیچ شتیٚ لەو گەورەتر وێنا ناکرێت، لە کاتێکدا کە تۆ ئێستا شتێکی گەورەتر لە خودات وێنا کرد. ئەمەش مەحاڵە. واتە شتێکە دەبێتە هۆی ناکۆکی و ئەوەی ئێمەی بەرەو ئەو ئەنجامە برد کە ناکۆکی حەتمیە، گریمانەی ئێمە بوو کە وتمان خودا تەنها لە زیهندا هەیە و لە دەرەوە نییە. کەواتە دەبیٚ ئەوەش پەسەند بکەین کە خودا لە دەرەوەش هەیە."

**ماگی: ئەم بەڵگەیە زۆر پەرێشانکەرە، لەبەرئەوەی بەلای کەمەوە لەم رۆژانەدا، هەرکەسیٚ دەیبیستیٚ، بە ناچاری هەست دەکات خەوشێکی تێدایە. بەڵام کاتیٚ دەتەویٚ پەنجە بخەیتە سەر ئەو خەوشە و بڵێیت کێشەکە چییە، دەبینیت ئەم کارە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەرانە قورسە.**

-کێنی: بە تەواوی لەگەڵ تۆدا هاوڕام. من بۆ خۆم یەکێکم لەو کەسانەی کە پێموایە ئەو بەڵگە هێنانەوەیە خەوشێکی تێدایە. بەڵام پێت وانەبیٚ رەوتێکی تازە لە فەلسەفەدا بۆتە هۆی ئەوەی کە خەڵك وا بیر بکەنەوە کە بەڵگەی بوون خەوشی هەیە. ئەم بەڵگەیە بەلای ئەکویناس-یشەوە قانیعکەر نەبوو بۆ سەلماندنی خەوشداریەکەی زۆری زەحمەت کێشا. ئەوەی لە هەمووی زیاتر مایەی سەرنجە ئەوەیە زۆر فەیلەسوفی گەورە بە درێژایی مێژوو بیریان لەوە کردۆتەوە کە ئەم بەڵگەیە خەوشێکی تێدایە، بەڵام ئەو بەڵگانەی کە سەبارەت بە هەر کامیان هێناویانەتەوە شتێکی دیکە بووە. هەتا ئەمڕۆش تەنانەت تا ئەو ڕادەیەش یەکدەنگی نییە کە خەوشی بەڵگەی بوون لە کوێدایە. تەنانەت یەکدەنگیی نییە سەبارەت بەوەی کە ئایا لە بنەڕەتدا خەوشێك هەیە یان نا. لەمدواییەدا کۆمەڵیٚ فەیلەسوفی ئاین لە ئەمریکا سەریان هەڵداوە کە بە سوود وەرگرتن لە دوا تەکنیکی لۆژیکی بیرکاریی، سەر لە نویٚ بەڵگەی بوونیان زیندوو کردۆتەوە و هەوڵیانداوە ئەم بەڵگەیە بە جۆریٚ بخەنە روو کە لە سیاقی بنەماکانی لۆژیکی هاوچەرخدا قایلکەر بێت. بەم پێیە، ئەو بەڵگەیەی کە بیست ساڵ بەر لە ئێستا وێناکراوە و حەوت کفنی ڕزاندووە، ئەمڕۆ زیندوو خۆشحاڵ لە ویلایەتی ئیندیانا و کالیفۆرنیا سەری دەرهێناوە.

**ماگی: تۆ پێشان بە چەند خاڵیٚ هاوبەشی بەرچاو قایلبوویت لە نێوان فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست و فەلسەفەی ئێمە لەم سەردەمەدا و وتت کە لە هەر دوکیاندا، بە پێچەوانەی ماوەی جیاکەرەوەوە، لۆجێك لایەنی**

**میحوەریی هەبووە و دیسان لە هەردوو قۆناغەکەدا، بە پێچەوانەی ماوەی جیاکەرەوەوە کە لای لە زمان نەدەکردەوە، میتۆدی کارکردن شیکردنەوەی زمان بووە. ئێستاش دەفەرموویت کە هەردوو قۆناغەکە بایەخیان بە بەڵگەی بوون داوە. کەواتە ئاشکرا دەبێت لێکچوونێکیش کە شایانی جەخت لێکردنەوەیە لە نێوانیاندا هەیە و ئەوەیە کە لە هەردوو قۆناغەکەدا، بایەخ بە کێشە پلە یەکەکان** *first- order problems*– **واتە کێشەکانی ژیان کە راستەوخۆ مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین دراوە و بایەخ بە کێشە پلە دووەکانیش** *second- order problems* **واتە چەمك و بەڵگە و میتۆدەکان و شتی تر – دراوە" کە لە قسە و باسی زاریدا دەربارەی کێشە پلەیەکەکان دێنە ئاراوە.**

–کێنی: ئەمە تاڕادەیەك یەکێکە لەو گۆڕانانەی ئەم دواییە لە فەلسەفەی بەریتانیا و ئەمریکادا. لە کاتێکدا کە من و تۆ تازە دەمانەویست بچینە ناو فەلسەفەی شیکارییەوە، پێیان دەوتین کاری فەیلەسوفی ئاکار ئەوە نییە بە کەسێ بڵێت ئایا درۆکردن ڕەوایە یان زیناکردن ناشیرینە یان بە کام بنەما دەبێ ئەوە هەڵبسەنگێنرێ کە فلاَن شەڕ شەڕێکی رەوایە. هەڵبەتە کەس سەبارەت بە گرنگی ئەم جۆرە مەسەلانە گومانی نەبوو" بە کورتی دەیانوت کاری فەیلەسوف بایەخدان نییە بەم مەسەلانە: کاری فەیلەسوف، پەیوەندی بە پلەی دووەمەوە هەیە، واتە شیکردنەوەی زمان و ئەو چەمکانەی کە لە حوکمکردن بە کێشە پلە یەکەکاندا بەکاردێن. لەم دەساڵەی دواییدا، دووبارە بایەخ بە مەسەلە ئاکارییە زیندووەکان دەدرێ و ئەمڕۆ باوەڕ وایە کە ئەمجۆرە مەسەلانە لە رووی فەیلەسوف بوونەوە پەیوەندیی بە فەیلەسوفانەوە هەیە نەك تەنها لە ڕووی هاوولاَتیبوون یان ئینسانبوون یان ئاکاریبوونەوە. بۆ نموونە، فەیلەسوفەکان لە بواری ئەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە ئاکاری پزیشکییەوە هەیە خزمەتێکی گەورەیان کردووە و دەربارەی مەسەلەی پاراستنی گیانی نەخۆش و ئەوەی لابردنی ئامێری دەستکردی درێژەدان بە ژیان سەبارەت بە هەندێ نەخۆش لە چ کاتێکدا ڕاستە، پرس و ڕایان پێدەکرێ. لە بەریتانیا فەیلەسوفێ سەرۆکی ئەو کۆمیسیونە بوو کە دەبوو دەربارەی ئاکاریبوونی تاقیکردنەوە لەسەر کۆرپەلە لێکۆڵینەوە بکات. لەمەش بترازێ، لەم دواییەدا بایەخێکی زۆر بە پەیوەندیی فەلسەفەی ئاکار لەگەڵ جەنگدا دەدرێ.

**ماگی: بوار بدە ئەو مەسەلەیەی دوایی وەکو نموونە هەڵبژێرێن. تۆ لەم دواییەدا کتێبێکت سەبارەت بە هێزی قەدەغەکردنی ئەتۆم نووسیووە و سەبارەت بەو بابەتە قسەت کردووە کە ئایا لە هیچ هەلومەرجێکدا دەکرێ جەنگی ئەتۆم لە رووی ئاکارەوە قابیلی ئاراستەکردن بێت؟ لەم باسەدا، تۆ هەموو ئەو باکگراوندەت خستۆتە روو کە لە سەدەکانی ناوەڕاست بە دواوە سەبارەت بە تیۆری (جەنگی رەوا) یان (جەنگی ئاراستەکراو) هەبوون و بەڕاستی ئەو خاڵەت باسکردووە کە هەموو کەسێکی عاقڵ دەبێ پەیوەستبێ بەو بەڵگانەوە کە لەو بارەیەوە خراونەتە ڕوو. دەکرێ پێمانبڵێی ئەو بەڵگانە چی بوون؟**

–کێنی: تیۆری جەنگی ڕەوا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، لە قۆناغی کۆرپەلەییدا لای ئەکویناس هەبوو، لە بەرهەمی مامۆستاکانی دوای سەدەکانی ناوەڕاستدا زیاتر خەمڵی. مەسەلەکە دوو لایەنی هەیە. لە چ هەلومەرجێکدا شەڕکردن لە ڕووی ئاکارەوە ڕاستە؟ و ئەگەر کەسێك بچێت بۆ شەڕ، لە ڕووی ئاکارەوە چ سنورێ بۆ شێوازی پرۆسەی جەنگی هەیە – بۆ نموونە ئەو شتانە چین کە دەکرێ بکرێن بە ئامانج یان دەبێ چ ڕەفتارێ لەگەڵ دیلدا بکرێ؟

تیۆری جەنگی ڕەوا، تیۆرێکی مام ناوەندییە، لە نێوان دوو جەمسەری دژبەیەکدا. لە جەمسەرێکدا، تیۆری ئاشتیخوازان هەیە کە دەڵێن لە بنچینەدا شتێك نییە بە ناوی جەنگی ڕەواوە و هەموو جەنگێ پێچەوانەی ئاکارەو شتێکی ناشیرینە، چەند ئامانج و پرنسیپیش هەبێ کە لەبەر ئەوانە جەنگ بەرپا کرابێ. لە جەمسەرەکەی تردا تیۆری ئەو کەسانە هەیە کە دەڵێن سەبارەت بەوەی جەنگ شتێکی ترسناکە قسەمان نییە" بەڵام کاتێ یەکێك دەچێتە جەنگەوە، ئیتر هیچ بنەمایەکی ئاکاریی بوونی نییە و تەنیا بنەمای ئاکاریی سەرکەوتنە لەو جەنگەدا بە کاریگەرترین وەسیلەی شیاو. گرووپی نەریتی جەنگی ڕەوا دەڵێن هیچکام لەو دوو بیرو بۆچوونە ڕاست نین. هەندێ بەها لە خودی ژیانیش بایەخیان زیاترە و شەڕکردن لە پێناوی ئەو بەهایانەدا ڕەوایە، بەڵام ڕەوایی جەنگیش سنوورێکی هەیە. دەبێ هۆیەکی مکۆم و ئاراستەکەر بۆ شەڕکردن هەبێ و دەبێ ئەو بەهایانەی شەڕیان لەسەر دەکرێ، بۆ ئەم جۆرە بەرگرییە بایەخی تەواویان هەبێ. ئەو کاتە، لە جەنگیشدا سنوورێك بۆ هەڵبژاردنی ئامانج هەیە: کەسانی بێگوناه نابێ بە دەستی ئەنقەست بکوژرێن، ئیدی مەبەست لە کەسانی بێگوناه خەڵکی مەدەنی بێت کە لە جەنگدا نین یان جەنگاوەرانی پێشوو کە بە فیعلی دیلن. چەمکی سەدەکانی ناوەڕاستی (جەنگی ڕەوا) بنەمای دوو بەرهەمی پڕ مەعنایە کە لە کاتی قسە و باسی ئەم دواییەدا سەبارەت بە چەکی ئەتۆم نووسراون. کتێبێکیان لە بەریتانیا بڵاوکرایەوە لە ژێر ناونیشانی (کڵێسا و بۆمب –ئەتۆمی – *the church and the bomb*) کڵێسای بەریتانیا بڵاوی کردەوە. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش نامەی ئەسقەفەکانی ئەمریکای کاسۆلیك دەربارەی چەکی ئەتۆم و هێزی قەدەغەکردنی ئەتۆم بڵاوکرایەوە.

**ماگی: هەندێ لەو بابەتانەی ئێستا فەرمووت لە ئەکویناسەوە سەرچاوە دەگرن. دەکرێ ئەمڕۆ ئەکویناس، وەکو فەیلەسوفی ڕەسمی کڵێسای کاسۆلیك حسابی بۆ بکرێ، وا نییە؟**

–کێنی: ڕاستی ئەوەیە کە ئەو قۆناغەی دەکرێ قسەیەکی ئاوای لە بارەیەوە بکرێ. تازە تەواو بووە. تا پێش سەدەی نۆزدە، ئەکویناس لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕێزێکی زۆری لێدەگیرا، بە هیچ جۆرێ وەکو فەیلەسوفی ڕەسمی کڵێسای کاسۆلیکی ڕۆمایی حسابی بۆ نەدەکرا. ڕەنگە فەیلەسوفی ڕەسمی بنەماڵەی دۆمینیکان بووبێ بەڵام بنەماڵەی دۆمینیکان بەشێکی بچووکە لە کڵێسای کاسۆلیك. لە سەدەی نۆزدەدا، پاپا لیڤی سیانزەهەم فەتوایەکی دەرکرد و جێگایەکی تایبەتی بۆ ئەکویناس تەرخانکرد لە وتنەوەی فەلسەفەو کەلام لە حەوزەو زانکۆکانی کاسۆلیکدا. ڕای من ئەوەیە کە لەسەردەمی دووەم ئەنجومەنی ڤاتیکانەوە، دەسەڵاتی ئەکویناس لە دەزگاکانی مەزهەبی کاسۆلیکدا کەمتر بۆتەوە و بە پێچەوانەی ئەمەشەوە لەبەرئەوەی چیتر وەکو گوتەبێژی هیچ هێڵێکی حزبی تایبەتی حسابی بۆ نەکراوە، ناوبانگ و متمانەی لە جیهانی ناکاسۆلیکدا زیادی کردووە. بایەخدان بە بەرهەمەکانی ئەکویناس بە تایبەتی لە ئەمریکا ڕوو لە زیادبوونە کە کەسانی ناکاسۆلیك و نامەسیحی لەم دواییەدا بە قورسی کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی بلیمەتی فەلسەفیی ئەوەوە.

**ماگی: بوار بدە بابەتێکی بنچینەیی تر بۆ دەربڕینی بیرو بۆچوونت بخەمە ڕوو کە ئەمڕۆش بە قەدەر سەدەکانی ناوەڕاست جێگای بایەخە. لای هەموو کەسێکی هۆشیار ئەو مەسەلەیە جێگای بایەخە کە ئازادی ئیرادە (یان ئیختیار)ی**

**ئێمە تا کوێیە. دیارە کە لە رووی پراکتیکیەوە ئەنجامی زۆر گـرنگ لەسـەر ئـەم مەسـەلەیە هەڵدەچـنرێ. یـەکێك لـە هۆیـەکانی بایـەخی تایـەتی فەیلەسـوفانی سـەدەکانی ناوەڕاست بەم مەسەلەیە، پرنسیپی فەزڵی ئیلاهـی *Divine Grace* بوو لە ئاینی مەسیحیدا کە دەیوت مـرۆڤ تـەنها بـە هەوڵی خۆی ناتوانێ رزگـار بێت و پێویسـتی بـە فـەزڵی (کۆمەکی) خودایش هەیە. بەڵام ئەگەر وابێ، ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە کە ئێمـە تـا چ رادەیـەك و لـە کـام لایـەنی بەڕاستی گرنگـەوە، لـە کارەکانمانـدا خـاوەنی ئـیرادەی خۆمانین؟**

–کـێنی: لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا دوو مەسـەلەی تێکچـڕژاو لـە ئـارادا بـوون: یـەکێکیان فەلسـەفی و ئـەویتریان کـەلامی بـوو. مەسـەلەی فەلسـەفی ئـەوە بـوو کـە چـۆن زانسـتی ئـەزەلی خوداوەنـد لەگـەڵ موخەییـەر بـوونی مرۆڤـدا بگـونجێنین. نـەك تـەنها فەیلەسـوفانی سـەدەکانی ناوەڕاسـت، بـەڵکو زۆر لـە فەیلەسـوفانی یۆنـانی و ئیسلامیش کە دەربارەی زاتی خودا قوڵتدەبوونەوە، بەو ئەنجامە گەیشتبوون کە یەکێ لەو شتانەی ئێمە دەربـارەی خـودا دەیـزانین – هەڵبەتـە ئەگـەر لـە بنەڕەتدا شتێك دەربارەی بزانین – ئەوەیە کە خودا ئاگـای لـە ئایندەیـە و دەزانێـت لـە داهـاتوودا چـیی روودەدات. باشـە، بـەڵام ئەگـەر مـن و تـۆ خـاوەنی ئیرادەی خۆمان بین، وادێتە بەرچاو کە ئەوەی ئەمڕۆ بڕیار لە ئەنجامدانی دەدەین ئەوە دیاری دەکات کە سبەینێ چۆندەبێت، لە کاتێکدا کە ئەگەر خودا لە پێشـدا بزانێـت کـە مـن و تـۆ سـبەینێ چـیدەکەین، ئاشکرا نییە چۆن ئـەمڕۆ دەکرێ لـە بڕیارەکانمانـدا ئازادبین. ئەمە مەسەلەیەکە بۆ هەرکەسێ کە باوەڕی بـە زانسـتی رەهـای خـودایی هەیـە تەرحـدەکرێ، بەچاوپۆشی لەوەی کە باوەڕی بە گۆتەکانی تەورات و ئینجیل دەربارەی خودا هەبێ یان نا.

بەڵام بەلای مەسیحیەکانەوە – بە تایبەتی ئەو مەسـیحیانەی پـەیڕەوی رێبـازی قەشـە ئۆگەسـتین دەکـەن – مەسـەلەیەکی تـریش لـە ئـارادا بـوو کـە تایبەتبوو بە خۆیان، چونکە ئۆگەستین، بە تایبـەتی لـە کۆتـایی تەمەنیـدا، زۆر جـەختی لـەو پرنسـیپە کردبـۆوە کـە هـیچ کەسـێ رزگـار نـابێ و ناچـێتە بەهەشـتەوە مەگـەر خـودا لـە ئەزەلـەوە ئـەوەی لـە چارەی نووسیبێ. کەواتە ئەمە شتێکی سەربار بـوو بۆ مەسیحیەکان.

پیاوە ئاینیەکان و فەیلەسوفەکانی سەدەکانی ناوەڕاسـت بـە پشـوو درێـژیی و حەوسـەڵەوە بـۆ یەکالاکردنـەوەی دوو چـەمکی ئـیرادە و زانسـتی ئەزەلی زەحمەتیان دەکێشا بۆ ئەوەی ئەوە نیشان بـدەن کـە دەکـرێ ئـەم دوانـە پێکـەوە بگـونجێنرێن. خـاڵی جێگـەی بایـەخ لـە رووی فەلسـەفیەوە ئەوەیـە کە تا ئەمڕۆ ئەو کەسانەی کە بە هیچ جۆرێ بایـەخ بـە خـودا نـادەن و تـەنها پەیوەسـتن بـە شـتە بڕیـار لێدراوەکان یان پەیوەستن بە (جەبری) زانستیەوە – *Scientific determinism*– هـەمان ئـەو هـەوڵ و کۆششانە وەکو خۆی دووبارە دەکەنەوە. هەنگاوی لـۆجیکی کەسـێك کـە بیـەوێ لـە سـەدەی بیسـتدا بڕیاری فیزیکی لەگەڵ هەستی ئێمەدا سەبارەت بە ئازادی ئیرادە بگونجێنێ، زۆ جار دەبێ هەمان ئەو هەناگاونـە بـێ کـە لەسـەدەی چـواردەی زاینـدا بـۆ گونجانـدنی قـەدەری خـودایی لەگـەڵ موخەییـەر بوونی مرۆڤدا هەڵدەگیران.

**ماگی: ئەگەر، بە هەمان شێوە کە من ئومێدەواربووم، باسەکەی ئێمە هەندێ خەڵك هانبـدات کـە بـۆ یەکـەمجار بەرهەمی فەلسەفیی سەدەکانی ناوەڕاسـت بخوێننـەوە. تـۆ پێشنیاز دەکەی لە کوێوە دەست پێبکەن؟**

–کێنی: ئەو بەرهەمانەی بۆ تازە کاران ئاسان بـن زۆر نـین. هۆکـەی ئەوەیـە، هـەروەکو وتم، زیـاتر

بەرهەمە فەلسەفیە گەورەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بە پێی نەریتی زانکۆ دەنووسران و کتێبی دەرس و زۆر ئەکادیمین. بەڵام دووکتێبی کورت هەن کە دەکرێ بۆ خوێندنەوە دەستنیشان بکرێن. یەکەمیان ئەو کتێبەیە کە خۆت لێیەوە دەستت پێکرد واتە (دانپیانان)ی ئۆگەستین.

**ماگی: دانپیانان بەراستی کتێبێکی بەنرخە و شایانی خوێندنەوەیە و ئێستا بە تەجلیدکراویش دەستدەکەوێ.**

–کێنی: دانپیانان یەکێکە لە ژیاننامە مەزنەکان کە تا ئێستا کەسێك لە دنیادا دەربارەی خۆی نووسیوویەتی و رەنگە یەکەم ژیاننامە بێ بە مانای ئەمڕۆی وشەکە کە خاوەنەکەی لە مەڕ خۆیەوە نووسیوویەتی. کتێبەکە پڕە لە فلاشباگی تایبەتی ئۆگەستین و یاداشتی جوان و ناسکی خێزانی و تێڕوانینی قووڵ سەبارەت بە منالّیی و گەشەکردن و پێگەیشتنی، پاشان باس لە بالاّترین بیری ئەبستراکتی فەلسەفی دەکات و دواجار دێتە سەر ماهیەتی کات کە هێشتا بە شێوەیەکی زیندوو لە باسە فەلسەفیەکاندا لە ئارادایە.

کتێبی دووەم کە پێشنیازی خوێندنەوەی دەکەم، کورتەی ئاسانکاریی *The proslogion* ئەنسیلم–ە. ئەو بەڵگە هۆشمەندانەیەی کە ئەنسیلم بۆ سەلماندنی بوونی خودا دەیخاتە ڕوو و من لە قالّبی چەند دەربڕینێکی جیاوازدا باسمکرد، لەم کتێبەدا هاتووە. بۆ کەسانی تازەکار ڕەنگە مایەی سەرنجبێ یەکەمجار کتێبەکەی ئەنسیلم بخوێننەوە کە خوێندنەوەی لە پاشنیوەڕۆیەك زیاتر ناخایەنێ، پاشان ببینن ئایا من بە ڕاستی ئەو بەڵگەیەم باسکردووە و ئایا وەکو پرنسیپ قەناعەت بە بەڵگەکەی ئەنسیلم دەکەن یان نا.

**ماگی: لە پێشەکی ئەم باسەدا وتم کەلای نەوەکانی ئەم دوایە فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست کەوتۆتە بۆتەی فەرامۆشیەوە و چۆتە ئاستێکی نزم و سووکەوە. بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم کە هەست دەکەم بارەکە سەرەنجام ڕوو لە گۆڕانە. ژمارەی ئەو فەیلەسوفە دیارانەی کە لەبەر چاوی هەمووان بایەخ بە فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست دەدەن –خۆشت یەکێکیت لەوان– ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبێ. ئایا بەڕای تۆ، نوێبوونەی بایەخدان بە رادەیەکی فراوان سەبارەت بەو فەلسەفەیە لە حاڵەتی دروستبووندایە؟**

–کێنی: هەڵبەتە تەنها لە قوتابخانەی فەلسەفی بەریتانیاو ئەمریکادا فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست دوچاری فەرامۆشی و نزمی بووە. لە وڵاتەکانی دیکەی ئەورووپا ماوەیەکی زۆرە ئەم فەلسەفەیە بابەتی خوێندنەوەی پڕ ڕەونەقە. بەلاّم لە ئەمریکاش حالّی حازر بایەخێکی نوێ نەك تەنها بەفەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست بەڵکو بە هەموو شتێ دەدرێ کە پەیوەندیی بەو قۆناغەوە هەبێ.

## پەراوێزەکان

1–*Pierre Abelard* (1079–1142) فەیلەسوف و پیاوی ئایینی فەرەنسایی، یەکێك بووە لە شاگردەکانی ئەنسیلم. (و. فارسی)

2–*Roger Bacon* (1214–1294) فەیلەسوف و زانای ئینگلیزی. (و. فارسی)

3–*Duns Scotus* (1265–1308) پیاوی ئایینی سکۆتلەندایی. (و. فارسی)

4–*William of ockham* (1300–1349) فەیلەسوفی ئینگلیزی. (و. فارسی)

5–*John wycliff* (1320–1384) پیاوی ئایینی و ریفۆرمیستی ئایینی ئینگلیز کە لە سەدەی چواردەی زایندا ڕاگری هەمان کۆلێج بوو کە ئەمڕۆ ئەنتۆنی کێنی ڕاگرێتی و دوو سەد ساڵ پێش مارتین لوسەر بە

مەبەستی چاکسازی ئایینی مەسیح و پێشگیریی لە سەرەڕۆیی قەشەکان کۆمەڵێ بیر و باوەڕی تەرح کرد کە لە زۆر لایەنەوە لە ڕاکانی مارتین لوسەر دەچوون، لەبەرئەوە کڵێسای کاسۆلیك و پاپا دوژمنایەتیان کردو سێ ساڵ دوای مردنی، لاشەکەیان لە گۆڕ دەرهێناو سووتاندیان و فڕێیان دایە چەمەوە. بۆ ئەوەی کتێبی پیرۆزی مەسیحیەکان باشتر لای خەڵك قابیلی تێگەیشتن بێت، خۆی هەر چوار جۆرەکەی ئینجیل و بەشێکی لە پەیمانی کۆن تەرجومە کرد بۆ ئینگلیزی و بوو بە هاندەری کەسانی دی بۆ ئەوەی باقی ئینجیل تەرجوومە بکەن بۆ ئینگلیزی (و. فارسی)

6-سماع طبیعي (بیستنی سروشتی): ئەم زاراوەیە بە پێی بەکارهێنانی کۆنی بەشێکە لە فەلسەفەی سروشتی کە باس لە کاروباری سروشتی و ئەوە دەکات کە هەموو تەنە سروشتیەکان تیایدا خاڵی هاوبەشیان هەیە وەکو مادە و فۆرم و جوڵە و وەستان و سروشت و شتی دیکە.

بۆیە وایان ناوناوە چونکە یەکەم بابەت بووە کە خوێندکاری فەلسەفەی سروشتی دەیبیست. هەندێك کەس ناونانی بەو شێوەیە بۆ ئەو وانانەی فەلسەفەی سروشتی دەگێڕنەوە کە ئەرستۆ بۆ شاگردانی خۆی باسدەکرد و ئەوان گوێیان دەگرت و گفتوگۆ و مشت و مڕیان لەسەر نەدەکرد.

(فرهنگ فارسی عمید 3 جلدی جلد دوم ص 1457)

(وەرگێڕی کوردی)

*دەکرا بنووسیم (قسەی خودا- یان گۆتەی خودا) بەڵام پێموایە وشەی کەلام باشتر ماناکە دەگەیەنێ. (وەرگێڕ)

## سەرچاوە

فلاسفه بزرگ، اشنایی با فلسفه غرب

نوشته بریان مگی، ترجمه عزت الله فولادوند

چاپ دوم 1377 ص 93-119

# فەلسەفەی سیاسی لە جیهانی ئەمڕۆدا

## گفتوگۆ لەگەڵ جۆرج کاتبدا

**رامین جەهانبەگلو**

**لەفارسییەوە: کارزان محەمەد**

جۆرج کاتب لە ساڵی (1933)دا لە برۆکلینی نیویۆرك لەدایکبووە. بەوتەی خۆی، لەکاتی خوێندنیدا بوو لە زانکۆی کۆڵۆمبیا کە بەهاوکاری یەکێك لە مامۆستاکانی، پتەر گیی، بووبەئارەزوومەندی زانستەسیاییەکان. لەلای کۆمەڵە مامۆستایەکی وەك فرانتس نوێمان، هێربرت مارکۆزە و چارلز فرانکڵ درێژەی بەخوێندنی بواری فەلسەفەی سیاسی دا. نامەی ماجستێرەکەی دەربارەی دوو بیرمەندی ڕادیکاڵی فەرەنسیی سەدەی هەژدە نوسیو نامەی دکتۆراکەی کە دواتر بەشێوەی کتێبێك بەناوی (یۆتۆپیا و دوژمنانی) بڵاوکرایەوە لەهەمان ئەو زانکۆیەدا پێشکەشی کرد. لە کۆلیژی (ئەمرهست) دەستی بەوانەووتنەوەکرد، ئێستاش مامۆستای تیۆرییە سیاسییەکانە لە زانکۆی پرینستۆن.

***

**رامین جەهانبەگلو: ئەیزایا بەرلین دەیوت فەلسەفەی سیاسی هەرلەخۆرسکەوە فەلسەفەی ئەخلاقە کە بەشێوەیەکی بەکارهێنراو لەبواری شوێنگە کۆمەڵایەتییەکان واتا پێکهاتە سیاسییەکان، پەیوەندییەکانی تاکەکەس لەگەڵ کۆمەڵگا، پەیوەندی دەوڵەت و کۆمەڵگاکان و پەیوەندی دەوڵەتان لەگەڵ یەکتردا" بەکاردەهێنرێت. ئایا تۆ لەگەڵ ئەم پێناسەدایت؟**

جۆرج کاتب: لەگەڵ ئەم وتەیەدام بەو ئیعتبارەی کە تیۆری سیاسی بابەتێکە کە ناوەندەکەی لەبیرکردنەوەی ئەخلاقیدایە. ئێستا ئەگەر تۆ زۆر سوربیت لەسەرئەوەی تیۆرە سیاسییەکان بۆ فەلسەفەی ئەخلاق بگۆڕیت و پاشان فەلسەفەی ئەخلاقیش لەوەدا کورت بکەیتەوە بۆ ئەوەی کە فەیلەسوفە سیاسییە ئینگلیزیو ئەمریکییەکان ئەنجامیان داوە، لەم بارەدا من ئیتر بەرگری لە پێناسەکەی بەرلین ناکەم و لەبری ئەوە پێناسەکەی خۆم دەخەمەڕوو کە بریتییە لەمەی تیۆرییە سیاسییەکان لەدیدی ئەخلاقەوە بایەخ بە مەسەلە بنچینەییەکانی سیاسەت دەدەن. زۆر سورنیم لەسەرئەوەی نییە دژی پێناسەکەی بەرلین بم، بەڵام هەست دەکەم

زۆرێك لە تیۆریستانی سیاسی ئەم پێناسەیە بەكەموكوڕ دەزانن. بەڵام گەر ئەو جەختەی كە لەم پێناسەدا هەیە لەسەرئەوەی كە تاكەكەسێك بەبێ هەبوونی بەرپرسیارێتی یاخود تەنانەت سۆزێكی ئەخلاقیی یا شەیدابوونێكی قوڵ بۆ كێشە ئەخلاقییەكان و ئەو كارەساتانەی لەژیانی سیاسیدا هەن، نابێتە تیۆریستی سیاسی، لەم بارەدا كێشەیەكی زۆرم لەگەڵ پێناسەكەی بەرلیندا نابێت. ناكرێ تیۆریستی سیاسی بێ و بێلایەن یاخود نالایەنگر یا لەدیدی ئەخلاقییەوە بێلایەن بێت. ئەگەر لەوجۆرە كەسانە بێت ڕوودەكاتە مەسەلەكانیتری وەك سۆسیۆلۆجیا، بەڵام ناكرێ تیۆریستی سیاسی بێو لەدیدی ئەخلاقییەوە بێلایەن بێت. بەرلین بەباشی پەی بەم مەسەلەیە بردبوو.

**رامین جەهانبەگلو: لەكتێبەكەی خۆتدا "تیۆری سیاسی" نوسیوتە كە تەواوی ئەو بەرهەمانەی ئەمرۆ ستراكتوری تیۆری سیاسی پێكدەهێنن، بەهۆی چوار خەسڵەتەوە جیادەكرێنەوە، كە بریتین لە ئەخلاقیبوون، لەخۆگری، فەلسەفیبوون و گشتیبوون. ئایا پێتوانییە كە دەبوایە خەسڵەتی پێنجەمیش كە بریتیبێت لە (تەمەن) بۆیان زیادبكرایە؟ پێمولیە مەك فرسۆن بوو دەیوت تیۆرە سیاسییەكان كە لەتیۆری فەلسەفیدا داواكراون، ئەو تیۆریانەن كە بەباشترین شێوە پێگەی سەردەمەكەی خۆیان ئاشكرا دەكات.**

جۆرج كاتب: لەگەڵ ئەم وتەیەدا نیم. بەگومانی من، ئەو تیۆریستە سیاسیانەی ئێمە بەرهەمەكانیان نەوە دوای نەوە دەخوێنینەوە، چ بەئینگلیزیو چ بەفەرەنسیو چ بەئەڵمانی و ئەو دێرینانەی كە بەرهەمەكانیان بە یۆنانی یاخود لاتینی نوسیوە، تیۆریستانێكن كە بۆ ڕابردووان و ئاییندەكان دەستیان بۆ پێنوس بردووە. ئەگەر ئێمە ئەوان لەسەردەمەكەی خۆیاندا نقوم بكەین، هیچ كۆمەكێكی ئێمە ناكات. كۆمەكێك ناكات ئەگەر ئاگاداری مەسەلەكانی سەردەمی خۆیان نەبووبن و هەروەها ئاگاداری ئەم مەسەلەیە نەبن كە ئەو گوێگرانەی تیۆریستێكی سیاسی مەبەستییەتی پێكهاتووە لە پێشینانی ئەو، لەو نوسەرانەی كە كۆچیدواییان كردووەو تیۆریستان گفتوگۆیان لەگەڵدا دەكەن و ئەو كەسانەی لەئاییندەدا دێنەئارا و تیۆریست هەوڵ دەدات پەیوەندییەكی تایبەتی لەگەڵ ئەواندا بەرقەرار بكات. بەتێڕوانینم مەك فرسۆن هەڵەی كردووە و هەمان هەڵە ئەمڕۆ هەلومەرجخوازانی وەك كانتن ئەسكینەریش دەیكەنو ئەو هەڵەیەش بریتییە لەسنورداركردنی تیۆرێكی سیاسی بۆ سەردەمی خۆیو وازهێنانە لەوەی بواری بیركردنەوە فراوان بكەن. ئێمە هەنوكە بەرهەمەكانی ئەفلاتون، ئەرستۆ، ماكیاڤیلی، هۆبز، لۆك، رۆسۆ، كنستان، میل و ئەوانیتر دەخوێنینەوە. بەرهەمەكانی ئەم كەسانە بەو مەبەستە نوسراون كە دوای مردنی نوسەرەكانیشیان هەر بخوێندرێنەوە. و ئەمەش بەوردییەوە ئەو شتەیە كە تیۆریستێكی مەزن جیادەكاتەوە. لەهەمانكاتدا ئەم تیۆریستانە لەگەڵ پێشینانی خۆیاندا لەپەیوەندیدان. من تیۆری سیاسی بە بابەتێكی ناوچەیی یاخود مێژوویەكی بەكاربراو نابینم. كارێكی ناشیانەیە ئەگەر تۆ بتەوێت لەگەڵ كەسانێكدا گفتوگۆ بكەیت كە لەهەمان سەردەمی تۆدا دەژین. هەم هاوسەردەمەكانت حەزدەكەن لەگەڵیاندا بەسادەیی، خێراییو پراكتیكی بدوێیت" و ئەمانەش كۆمەڵێ خەسڵەتن كە جێسەرنجی تیۆرەی سیاسی نین. تیۆرەی سیاسی زانینێكی تیۆرییەو بەگشتی زەمەنێكی نییە.

**رامین جەهانبەگلو: زۆر باشە، لێرەدا بەتێڕوانینی تۆ فەیلەسوفی سیاسی پێویستە چ پەیوەندییەكی لەگەڵ نەریتی هزری سیاسیدا بەرقەرار بكات. وادێتەبەرچاو لەم ساڵانەی دواییدا ڕووبەڕووی جۆرە زیادبوونێكی خۆهۆشیارانەی میتۆدۆلۆژیانە لەنێوان فەیلەسوفانی سیاسیدا بووینەتەوە كە**

**بۆتەمایەیئەوەی ئەوان قبوڵی بکەن پرۆژەی تیۆرییەکەشیان سنووردارتربکەن و لەئەنجامدا بەرپرسیارییەتیشیان سنوردارتر بێت.**

جۆرج کاتب: مۆڵەت بدە سود وەربگرم لەهەمان وشەی بەرپرسیارێتی کە بەکارت هێنا بۆ ڕۆشنکردنەوەی تێڕوانینم. تیۆریستی سیاسی لەوانەیە هەستی بەرپرسیارێتی هەبێتو ئەم هەستی بەرپرسیارێتییە دەکرێ لەبەرامبەر بارودۆخی ئێستا یاخود ئەو بارودۆخەدا بێت کە پێشبینی دەکرێت بەمزووانە ڕوویدات. بەڵام بەتێڕوانینی من گرنگترین بەرپرسیارێتی تیۆریستێکی سیاسی، پێشکەشکردنی ڕێنمایی پراکتیکی نییە. ئەمە بێگومان تێڕوانینی ئەمڕۆی منە و لەگەڵ ئەوەی لەکتێبی "تیۆری سیاسی"دا ئاماژەت بۆکرد“ جیاوازە. بەتێڕوانینی من ئەو کاتە تیۆریستێکی سیاسی بەباشترین شێوە بەڵێنی بەرپرسیارێتی دێنێتەدی کە حەزوئارەزوو و بەڵێننامەکەی بەڕێبازێکی بالای ئەخلاقیی پێك بهێنێت و تائەندازەیەك سەبارەت بە هەلومەرجەکە سەربەخۆ بمێنێتەوە. بەرپرسیارێتی بنچینەیی تیۆریستێکی سیاسی لەمەدایە کە شتێکی ڕاست، بەجێو ڕاشکاو بەدەست بهێنێت. ئەو بنچینە بالایە لای جۆن ستیوارت میل، ئازادی بوو“ لای جۆن رالز دادپەروەری، لای ماکیاڤیلی فەزیلەت، لای رۆسۆ یەکسانی، لای ئەفلاتون هاوسەنگی، لای ئەرستۆ بالاترین مۆدێلی نایاب بوو. ئەوانە بابەتگەلێکی رۆژانەو کاتی نین، بەڵکو مەسەلەگەلێکی هەمیشەین.

تیۆریستێکی سیاسی بەباشترین شێوە بەڵێنی بەرپرسیارێتییەکەی دێنێتەدی کاتێك کە دیدی خۆی لە کۆمەڵەمەسەلە خێرا، کاتیو رۆژانەییەکان دووردەخاتەوە.

**رامین جەهانبەگلو: ئەم لێدوانانە ئێمە بۆ مەسەلەی یۆتۆپیا دەگەڕێنێتەوە“ ئەو بابەتەی کە تۆ دوو پەرتوکت دەربارەی بەچاپ گەیاندووە. ئێمە ئیتر لەچەرخی یۆتۆپیا تەواوخوازەکاندا نین. چین و کوبا-ی دوا وڵاتی کۆمۆنیست لەساتی پێداچوونەوەدان بە فەلسەفەی مارکسیزمی خۆیان و چوونەناو ڕەوتی ئابوری و سیاسی جیهانی، لەم ڕووەوە بەدووری دەزانم ئەمڕۆ بتوانین هزری یۆتۆپیا بەهزرێکی پێشنیازکراو بژمێرین. ئایا بەتێڕوانینی تۆ تیۆرەسیاسییەکانی ئەمڕۆ سەبارەت بە سەردەمی دوای جەنگی دووەمی جیهانی کەمتر یۆتۆپیان؟**

جۆرج کاتب: بەڵێ، بەتێڕوانینی من بەهۆی ئەو کارەساتانەی لەلایەن مارکسیزم بەدەستی یەکێتی سۆڤییەت و چینی ماویست هاتەپێش، خواستە یۆتۆپییەکان لایەنیکەم لەئێستادا لاواز بوون. بەڵام ڕوونکردنەوەی ئەم لاوازییە تەنها بەهۆی ئەو کارەساتانەوە مومکین نییە. بەتێڕوانینم ئەگەر بڵێین جەنگی دووەمی جیهانی، جیهانی لەئەگەری دەرکەوتنی کارەساتیتریش وریاکردەوە، هەڵەمان نەکردووە. ئەم کارەساتانە ئیتر تەنها ڕەهەندی سیاسیان نییە، بەڵکو لەژینگە، پیسبوونی هەوا و لەناوچوونی سروشت، زیادبوونی دانیشتوان و شتیتردا بەرجەستەبووە. لەڕاستیدا کێشەیە بڵێم کە کام یەك لەم کارەساتانە لەئایندەدا دەبێتە کارەساتی کۆتایی. جیهانی ئەمڕۆ، بەدانیشتوانە بەرەو زیادبوونەکەیەوە، لەدۆخی گۆڕاندایە بۆ دنیایەکی تورە، ژەهراویو نامرۆیی. پاشان بۆچی بیر لەیۆتۆپیا بکەینەوە لەکاتێکدا کە دەتوانین بەکەمتر لەوە ڕازی ببین؟ بۆچی لەمەڕ "باشترین" بیربکەینەوە، لەکاتێکدا دەتوانین هەوڵ بدەین ئەوەی خراپترینە“ باشی بکەینەوە؟.

بەتێڕوانینی من، تیۆری سیاسی پێبەپێ لەبری ئەوەی کە ڕووبکاتە بەرنامەڕێژی بەرزەفڕانەو مەزن، پێبەپێ دەگۆڕدرێ بۆ هەوڵێکی ئاگراویو تورە بۆ خۆپارێزی لە کارەسات و دەرئەنجامە مەترسیدارەکان و ڕزگارکردنی هەموو ئەو شتانەی

بەهای ئەوەیان هەیە بۆ ئایندە بپارێزرێن و لەهەمانکاتدا بەرجەستەکەری پەیوەندییە بەڕابردووەوە.

**رامین جەهانبەگلو: ئەمڕۆ تۆ وەك یەكێك لەگرنگترین تیۆریستانی ئەوەی بە "فەردییەتی دیموكرات" ناودەبرێت" ناسراویت. ئایا بەتێڕوانینی تۆ "فەردییەتی دیموكرات" دەكرێ تەوەرەی ئامانجەكانی بیریارێكی یۆتۆپیگەرا بێت؟**

جۆرج كاتب: یۆتۆپیگەرا ڕەنگە نا، بەڵام بەهەمانشێوەی وتم "فەردییەتی دیموكرات" هەنوكە پێویستی بە ڕۆشنكردنەوەیەكی پوختەترو شیكردنەوەیەكی شایستەیە. ئەم تیۆرە كۆششێكە هاوكات بۆ پاراستنی مۆدێرنێتە (و ڕەنگە بەشێك لەڕابردووی بەرلە مۆدێرنە)و لەهەمانكاتدا هاندانی خەڵك بۆ بیركردنەوە لەبارەی خۆپارێزی لە پەیامە خراپەكان. بەمانایەكیتر، ئەم تیۆرییە لەهەمانكاتدا ئایدیالیزمێكی پۆزەتیڤە وشیاوی بەرگرییە. ئەگەر لەبارەی فەردییەتەوە بەشێوەیەكی دیموكراسیانە بیربكەینەوە بەهەمانشێوەی كە بیریارانی وەك ویتمەن و میل بیریان دەكردەوە، ئەگەر تاك وەك تاكێك بیر لەخۆی بكاتەوە، لەكاتێكیوادا ئەگەری بەدیهاتنی ئەم تیۆرییە بوونی دەبێت" بەمانایەكیتر واتا پاراستنی باشترین ڕەهەندەكانی كۆمەڵگا دیموكراسییەكان و خۆپارێزی لە نیگەتیڤترین پەیامەكانی. پێویستە دانیپیادابنێم كە ئەوەی من پێشنیازی دەكەم لەدیدی نوسەرانەوە ناپراكتیزەو خەونە. بەڵام تەنانەت ئەگەر لەڕاستیشدا بەمشێوەیە بێت، من بەدیاریكراویی، تیۆرێكیتر ناناسم كە ئەمڕۆ وێڵی پاراستنی باشترین ڕەهەندەكانی دیموكراسی و خۆپارێزی لە نیگەتیڤترین دەرهاویشتەكانیدا بێت. بەتەواوەتی سۆشیالیزم لەو پلەیەدا نییە و تیۆری دیموكراسیی ڕادیكاڵیش هەروایە. گەڕانەوە بۆ ئەرستۆكراتیەتی دواكەوتووش بەڕەهاییەوە ڕێگاچارە نییە. لەم بارەدا نازانم لەبازنەی تیۆرییەكاندا چ شتێك دەمێنێتەوە.

**رامین جەهانبەگلو: لەلای هەندێك لە سۆسیۆلۆجییە ئەورووپییەكان (بۆ نمونە میشیل مافیزۆلی) لەگەڵ كۆتایهاتنی تەمەنی ستراكتورە مەزنە ئابوری، سیاسی و ئایدۆلۆژییەكان لەرۆژئاوادا، فۆرمگەلێكی نوێ لە كۆمەڵەكان لەساتی فۆرمەڵەبووندان" ئەم كۆمەڵە نوێیانە دۆخی كۆمەڵگا خێڵەكییەكان دەبێت و لۆژیكی سیاسیی تاكگەرایی توشی ئاستەنگ دەكات، تێڕوانینی تۆ لەمبارەیەوە چییە؟**

جۆرج كاتب: بەتێڕوانینی من خێڵگەریی دوای هەموو ئەو كارەساتانەی كە قسەی لەسەركرا" خراوەتەڕوو. هۆزگەرایی زەمینەیەكی گونجاویخۆی لەجیهانێكدا بەدەست دەهێنێت كە یا لە سفرەوە دەستی پێكردبێت و یا خاوەنی هەلومەرجی داشكاوی ئابوری، سیاسی، كلتوری، مەزهەبی بێت. ئەم مۆدێلە نوێیەی هۆزگەرایی كە ئێمە ئەمڕۆ ئاگادارین لێی، هیچ پەیوەندییەكی بەجۆری ژیانی خەڵكی عەشایرو هۆز ژیارەكانەوە نییە. لەڕاستیدا ئەم هۆزگەراییە نوێیە بەدوای سادەكردنەوەی بونیادی ژیاندا هاتوونەتەئارا. هەندێ لەبیریاران لەسەر ئەو تێڕوانینەن كە ئەم سادەكردنەوەیەی بونیادی ژیان" هەنگاوێكی پۆزەتیڤە. من لەگەڵ ئەم بیروباوەڕەدا ناكۆكم. بەتێڕوانینی من هۆزگەرایی شێوازێكە كە ژیانی دوای ڕوودانی كارەساتێك لەخۆدەگرێت. بەلای منەوە هۆزگەرایی نوێ خۆیلەخۆیدا نیشانەی ڕوودانی كارەساتێكە.

**رامین جەهانبەگلو: بەمشێوەیە، جارێكی تر بۆ بابەتی دیموكراسی دەگەڕێینەوە، چۆن ڕێبازی دیموكراسی مەودای تاكەكەس زیاد دەكات؟**

جۆرج كاتب: ئەمە مەسەلەیەكە هەمیشە من دەخاتە گرفتەوە. من هەمیشە لەسەر گرنگی پەروەردەو فێركردن پێداگری دەكەم.

لەلایەکیترەوە جەخت دەکەمەوە کە هەنگاوەکانی دەوڵەت تا ئەندازەیەکی وەدیهاتوو بەشەفاف، دیموکرات و دوور لەگەندەڵی بمێنێتەوە. ئەوەی بەلای منەوە زیاتر لەهەر شتێك نیگەرانکەرترە بلاوبوونەوەی بێسنورو بەردەوامی چالاکییە دەوڵەتیو ئامادەگی زۆری دەوڵەت، کۆکردنەوەی زانیاری و هەوڵدانە بۆ کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵ. دورنمای کابوسێك کە فۆکۆ بەباشی لە کتێبی "چاودێری و سزا"دا وێنای کردووە، کابوسی منیشە. ئەم جۆرە دەسەلاتگرتنە دەکرێ نەرم و بێ کێشە بێت، بەلام ترسناکی ئەوە لەمەدایە کە مرۆڤەکان بەتەواوەتی لەژێر چاودێریدان. جولانەکانیان تۆمار دەکرێت، سەلیقەکانیان تۆمار دەکرێت و مەبەستەکانیشیان ناسراو و پێشبینیبۆکراون. ئەوەی لە نەبینین و نەناسراوییی ریشەی ئەم دەسەلاتەوە سەرچاوەدەگرێ، ئەو وێنا درۆزنەیە کە ئێمە ئازادین، لەژێر چاودێریدا نین و ئەوەی حەزمان لێیەتی ئەنجامی دەدەین و ئەوەی کە دەکرێ دەتوانین نهێنییەکانمان بپارێزین و ژیانی تایبەتیمان هەبێت. بەلام وادێتە بەرچاو کە بەهۆی کاریگەری تەکنەلۆژیای نوێو کۆکردنەوەی زانیاری، هەموو ئەوانە لەدۆخی لەناوچوون و دیارنەمان دان. لێرەدایە کە فەردییەتی دیموکرات هەوڵ دەدات بەرگری بکات. ئایا سەرکەوتوو دەبێت؟ بەدووری دەزانم.

**رامین جەهانبەگلو: تۆ بەهۆی پەرتوکەکانتانەوە لەبارەی هانا ئارێنت ناسراویت. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پێم وانییە لەگەڵ رەخنەکەی ئەودابیت لەمەر فەردییەتی دیموکرات و ستراکتوری سیاسی لەسەر بنەمای ئەوەی کە ئارێنت پەرلەمان بەپێشمەرجی دیموکراسی ناوزەد دەکات و لەوباوەرەدایە لەسەربناغەی کاریگەری ئەکادیمیو بەئامانجی گەران بەدوای خۆشبەختی تاکەکەسدا دامەزراوە؟**

جۆرج کاتب: کۆمەڵگایەکی گەورەی خاوەن دەیەها ملیۆن دانیشتوان و سیستمی دیموکرات، لەزۆربەی کاتەکاندا کاریگەروەرگرن. ئەگەر دەنگ بدەن، بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرایەتی ئەنجومەن و هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمارە. بەلام بەتێڕوانینی من ئەگەر بمانەوێت باسی دیموکراسی لەئەمریکا یاخود لەکۆمەڵگا ئەنگلۆساکسۆنەکاندا لەمەسەلەی بەشداریی خەڵك لە هەڵبژاردندا" سنوردار بکەین، ئەوا پێکهاتە راستییەکانی دیموکراسیمان لەم کۆمەڵگایەدا نەناسیوە. رەنگە ئەم باسە بۆ فەرەنساو ئەڵمانیاو ئەو ولاتانەیتر کەمتر کە دەربارەیان دەزانین" راست بێت.

مەبەستم ئەوە نییە هانا ئارێنت لەمەر جێکردەکانی دیموکراسی لەبوارەکانی وەك فێرکردن و پەروەردە بێئاگا بووبێت. شارە بچوکەکان و گوندەکانیش هەڵبژاردنی ناوچەییان هەیە. لیژنەی بەرێوەبەرێتی خوێندنگاکان هەڵبژاردەن و سیاسەتی فێرکردن و پەروەردە دەستنیشان دەکەن.

ئەم بابەتە بۆ بوارە کۆمەلایەتییەکانیتریش راستە. بەمانایەکیتر بوارەکانیتری بەدەرلەژیانی رۆژانە هەن کە هاولاتیان تیایدا کاردانەوەکانی خۆیان بەرکەنار دەکەن. هانا ئارێنت زۆر درەنگ، واتا لەچوار- پێنج ساڵی دوادوای تەمەنیدا پەی بەم فاکتەرە برد. رەنگە خەڵك نەیانەوێت وەك نوێنەر لەهەڵبژاردندا بەشداری بکەن، یاخود هەموو رۆژێك باسی سیاسەت بکەن. بەلام خەڵك لەپێکهاتە خۆجۆش و خوازراوەکاندا وەك پارتە سیاسییەکان یاخود بزووتنەوە جۆراوجۆرە ئازادیخوازەکان لەدەوری یەکتر کۆدەبنەوە. ئارێنت تەنها لەدوادوای تەمەنیدا شایەتحاڵی جەنگی ڤێتنام بوو. بەلام ئەم بزووتنەوەیە نە تاکە بزووتنەوە لەئەمریکا بوو نە یەکەمین بزووتنەوە لەمێژووی ئەم ولاتەو نە دواجاریشە. بۆ نمونە

بنۆڕە بزووتنەوەی دژبەلەناوبردنی کۆرپەلە. هەڵبەتە من لایەنگری مافی سنورداری لەناوبردنی کۆرپەلەم. بەڵام ئافەرینی ئەو وزە دیموکراسییە دەکەم کە ئەم بزووتنەوەیەی جوڵاندووە. فیمینیزم بزووتنەوەیەکی سیاسی– کۆمەڵایەتییە کە لە ڕێبازی دیموکراسیی‌هەڵبژاردنەوە ئیلهامی وەگرتووە. لەهەمان ئەو دەستەی بزووتنەوەکاذی‌ترە کە ئێمە بەخواستی گرووپە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکان دەسپێرێت. ئەم بزووتنەوانە دەرکەوتەی سیاسین کە لەرۆحیەتی گشتیانەی دیموکراسیی‌هەڵبژاردنەوە ئیلهامی وەرگرتووە. هانا ئارێنت زیاتر بایەخی بە دەرکەوتە میتافیزیکەکان دەدا تاوەکو مەسەلە ئاساییەکانی ڕۆژانە. لەکۆمەڵگا دیموکراسییەکاندا جۆرێك هەڵچوونی سروشتی هەیە. لەلایەکی‌ترەوە جۆرە چالاکییەکی سروشتیش هەیە و ئەم دوو ئینتمایە لەمشتومڕدان لەگەڵ یەکتردا. کاردانەوە هیچکات براوە نییە. هانا ئارێنت هەرگیز بەهای پێویستی بەم رۆحیە دیموکراسییە نەدا. بەهۆی هەمان هۆکارەوەیە من ڕەخنەو ناڕەزایم لە ئەو هەبووەو هەیە.

**رامین جەهانبەگلو: ئایا بەتێڕوانینی تۆ (فەردییەتی دیموکرات بەهەمانشێوەی کە تۆکۆیل لەکتێبی (دیموکراسی لەئەمریکا)دا دەڵێت" هەلومەرج بۆ تۆتالیتاریی دیموکراسی فەراهەم ناکات؟ ئەمە بەومانایەیە کە تەنانەت حکومەتە دیموکراسییەکایش دەتوانن خۆیان لە ڕێزگرتن لەمافەکان دەرباز بکەن. ئێمە نمونەگەلێکی زۆرمان لەمبارەیەوە لەئەمریکا بینیوە.**

جۆرج کاتب: تۆکۆیل لەمبارەیەوە زۆر وردبین بوو. بەڕەچاوکردنی بڵاوبوونەوەی خۆشگوزەرانی و دەستگەیشتنی خەڵك بەخزمەتگوزارییەکانی وەك ئینتەرنێت، دەکرێ پێشبینی بکرێت کە خەڵك زۆرینەی کاتەکانی خۆی لەماڵەوەدا تەرخان بکات بۆ ئەم جۆرە پەیوەندی و سەرگەرمیانە. من نیگەرانی ئەم بارودۆخەم. تازە ئەمە کەم مەترسیترین ڕەهەندی مەسەلەکانە. ئەوەی دەکرێ مەترسیدارتربێت، هەمان مەسەلەی حکومەتی لەهەموو شوێن ئامادەیە کە لەگەڕانەوەدا بۆ فۆکۆ ئاماژەم بۆکرد. بەتێڕوانینی من هەرچەند مەترسی قوڵبوونەوەی هەڵچوونی جدی بێت بەهەمان ئەندازەش ئەنبارێکی مەزنی وزەی داهێنەرانە هەیە کە دەبێتەهۆی ماندووبوونی مرۆڤە دیموکراتەکان لەچێژەکانی ژیانی هەڵچوو، هەروەها ڕزگاربوونی وزەیەکی سەرەتاییانەی دیموکراتی. ئەم وزەیە دەکرێ لایەنی جیاوازی هەبێت، بۆ نمونە بەشێوەی ئەزموونێکی تەواوانەی تاکەکەس کە تەنها خودی مرۆڤ تیایدا ڕۆڵی هەیە دەربکەوێت" وەك بەکارهێنانی ماددەسڕکەرەکان، یاخود جوانکاری جەستەو یا ئارایشتکردنی قژ و ڕووکردنە مۆد.

ڕەنگە بەشێوەی ئەزموونێکی بەکۆمەڵ دەربکەوێت" تاکەکانی دیموکرات ئازادانە و بەشێوەی خۆجۆش کۆدەبنەوە تا ئینتما نوێیەکان لەژیانی سیاسی، کلتوریو کۆمەڵایەتی بنیات بنێن. پێم وانیە ئەم جوڵانانە بەرەو ئاوابوون بچێت. ئومێدی من بۆ هەڵاتن لە تۆتالیتاریی دیموکراسی کە تۆکۆیل ئاماژەی بۆکرد" بەهۆی هەمان ئەو دەرکەوتانەوەیە.

## سەرچاوە

کتێبی (تفاوت و تساهل)، نوسینده (رامین جهانبگلو)، ص (192–201).

# لە ئەدەبی گەلانەوە

- پۆستاڵ و گوڵ

یوجەل فەیزی ئۆغلو

لە تورکییەوە: ئەحمەد محەممەد ئیسماعیل

- ئەگەر زیندوو نەبووم

ئیمیلی دیکنسۆن

لە فارسییەوە: فرزند شێرکۆ

# پۆستاڵ و گوڵ

**یوجەل فەیزی ئۆغلو**

**لە تورکییەوە: ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل**

ئەو ڕووداوەی دەمەوێ بیگێڕمەوە، ترسێکی زۆرم دەخاتە بەر، تۆ بڵێی نەبێتە مایەی درکاندنی نهێنی هەڤاڵەکانم؟.. تا ئەو ڕۆژە ئەشکەنجە و ئازارێکی زۆر دەدرام ئەی ئێستا؟.. ئاه ئەشکەنجە ئاوا؟. باسی ناکرێ و بۆم ناوترێ.. نەك تەنها من هەموومان، کەسمانی نەدەبوارد، کە باسی ناکەم، لەبەر ئەوەم نییە نامەوێ. بیڵێم، نا، بەڵکو کارێکە بەدەم باس ناکرێت و ناشمەوێ بیرم بکەوێتەوە.. کەچی دەزانی لەو کاتانەشدا، لەو ساتانەی مان و مردنمان لەگەڵ یەکتردا لە ململانێدا بوون کەچی شتە جوانەکانی ژیانمان لەبەرچاو نەدەکەوت.. بستێك ئاسمانی شین، یا باڵەفڕێی کۆترە شینکەیەك هەموومانی دەخستە ناو دنیایەکی ترەوە، ژیانی لەلا شیرین دەکردین، بزە و خەندەی دەخستە سەر لێوان، گوڕ و تینی بە بەرا دەکردین، زیندووی دەکردینەوە، ئەم حاڵەتە تەنها هەر من نا سەرجەم ئافرەتانی ناو قاوشەکەی دەگرتەوە.

جا ئەوەی ئێستا دەیگێڕمەوە، لایەنێکی جوانی ژیانە، بەلاّم ترسێکی بێ وێنەش بە ڕۆحم دەدا.

هەر دوو ڕۆژ جارێ، تا کەمێ هۆشمان بە بەرا بێتەوە، بۆ بیست دەقیقەیەك بۆ حەوشەیان دەردەکردین، کە دەریش دەچووین هیچ کوێیەکمان لێوە دیار نەبوو. پەرژینە بەرزەکە هەموو شتێکی لێ شاردبووینەوە. هەر لە ناو شاری ئەستەنبووڵدا بووین، بەلاّم وەك هەزاران کیلۆمەتر لێوەی دووربین ئاوا بوو. بەمە دەیانویست لە بێخەوە لە ژیانمان هەڵکەنن. شادەمار و شتە جوانەکانی ژیانمان لێ شاردرابووەوە، بە تاسووقەوە بۆ شتێك دەگەڕاین کەمێ بۆنی ژیانی لێ بێت، سوچێکی ژیانمان پێ پیشان بدات. لە چیمەنتۆ ڕێژ و کۆنکرێت و ژوور و قاوشی شێدار بەولاوە هیچمان نەدەدی، بۆ کوێ چاومان هەڵخستایە هەر چیمەنتۆ و کۆنکرێت و بەرد و دیوار و ژوورە تاریکەکانی زیندان و ڕێڕەوی نمدار و پۆستاڵی جەندرمەکان بوو، لە ئەستەنبووڵی جواندا هەر ئەو شتانەمان دەدی و لە

"48" سەعاتیشدا تەنها "20" دەقیقە بە دیتنی ئاسمان شاد دەبووین.. ئاه، ئاسمانی نیشتمان چەند جوانە.. شینێکی تۆخ، دنیای شینایی رەنگامە. کە ئەو جوانییەمان هەڵدەمژی، ئارامی و هێمنی پێ دەبەخشین، غەرق دەبووین لە خۆشی، ئێمەش ئەو رەنگ و خۆشی و شینایییەمان لەگەڵ خۆدا دەبردە قاوشەکانەوە، خەم و ئازارەکانمان پێ فەراموش دەکرد.. رۆژێکیان گەواڵە هەورەکان ئاسمانیان داپۆشی، تارای سپی بە خۆیدا دا، جوانتر دەرکەوت، زۆری نەبرد باران تێیکرد، بارانێکی لێزمە، وەك کونەت سەرەو خوار کردبێ وابوو.. خۆمان دایە بەر بارانەکە، پاك و خاوێنی کردینەوە، روومان گەشایەوە، زۆر نەماینەوە گەڕاینەوە قاوشەکان، چ دەبوو گەر کەمێکی تر بماینەوە؟!. بۆ دووبەیانی کە دەرچووینە حەوشە، هەمدیس لەبەر باران زۆر نەماینەوە.. بارانەکەی ئەو رۆژە هیچ ئاسەوارێکی نەمابوو. تەماشای چیمەنتۆ ڕێژەکەمان دەکرد، یەك دلۆپە ئاوی بارانەکە دیار نەبوو، بارانێکی بە خورەمی هاوینە بوو هات و رۆیی.. لەم کاتەدا یەکێ لە ئافرەتەکان هاواری لێ هەڵسا: "ئافرەتەکان ئێوە تەماشای ئێرە بکەن".

هەموومان بەسەر سەریەوە راوەستاین، چ ببینین باشە؟ لە نێوان درزێکی چیمەنتۆ ڕێژەکەوە "تۆو"ێك چووزەرەیەکی باریکی دەزووڵە ئاسا چەکەرەی کردبوو.. تومەز "تۆو"ێك بەدەم باوە، بەدەم بارانەوە خزاوەتە یەکێ لەو درزانەوە.. خۆشییەکی بێ وێنە هەموومانی گرتەوە، بەڕاست و چەپدا کەوتینە هەڵپەی مینەکردنی تۆزقاڵێ خۆڵ و ئاخ.. لە سووچ و قوژبنەکاندا هەندێکمان پەیدا کرد و لە بن چووزەرەکەمان دانا.. یەکێکی دیکەمان ئاوی هێنا و چەند دلۆپێکمان پێدا، وەك ئافرەتەکان خۆیان دووگیان بن و بە تەنگی سکەکانیانەوە بێن خەمیان لێ دەخوارد.. جموجوولێکی سەیر لە نێوانماندا پەیدا بوو، وەك مناڵێك ها ئێستا ها نەختێکی کە لە دایك دەبێ ئاوا بە پەرۆشەوە بووین.. ئەو رۆژەمان بە گران لێ بەسەر چوو، کاتی چوونە حەوشەمان لێ بوو بە ساڵێ.. هەر کە دەرگاکانیان لێ کردینەوە، هەموومان بە پرتاو خۆمان بە چووزەرەکە گەیاند.. دەزانی تۆزێ بالآی کردبوو؟!. کەمێ شینتر دەیڕوانی؟.. لە پشتی ئەو پەرژینە بەرزە، لەو زیندانەوە هەستمان بە جۆرە خۆشییەکی سەیر دەکرد، قاقامان لێدەدا، بەلآم هاوار و قاقاکانمان بە دیوارە بەرزەکاندا دەیدا و ورد و خاش دەبوون. توانای بەزینی دیوارەکانیان نەبوو، خۆشی و پێکەنینەکانمان نە دەگەیشتنە ئەودیو.. ئەمجارەیان، خۆمان باشتر بۆ ئامادەکردبوو، پڕ مشتێ ئاخمان پەیدا کرد، بە چەند دلۆپێك ئاومان دا، ئەو "20" دەقیقەیەی ئەمرۆ چ زوو تەواو بوو؟ چۆن وا زوو کۆتایی هات؟.. گەڕاینەوە قاوشەکان، لە نێوان خۆماندا هەر باسی ئەو خونچەیەمان دەکرد کە بەڕێوەیە!. هەرچەندە ئاسەوارێکی بە خونچەبوونیشی دیار نەبوو، ئێمە خۆمان وامان دانابوو. وامان دەویست، بەلآم هەر بە خونچە دەبێ.. باشە کە بووە خونچە چ رەنگێکی دەبێ؟. دەمەتەقیمان کەوتە سەر لە هەر کەللەیەکەوە ئاوازێکمان دەبیست، هەر کەسێ چ رەنگێکی خۆش بویستایە، نوقلآنەی ئەو رەنگەی بۆ لێدەدا..

دەرگا کرایەوە، بە جارێ هەموومان ئاوڕمان دایەوە، ورتەمان لە خۆ بڕی، یەکێکی دیکەیان هێنا، هەر لە دەرگاکەوە پاڵێکیان پێوەنا.. کچێکی زراقی کەڵەگەت، جوان، هەر لە تەمەنی بیست ساڵیدا بوو، بالآ ڕێك و ئەندام وردیلە، جل و بەرگێکی ڕێك و لێهاتوو، کەو ئاسا سرك و سۆڵ، چووینە لای، دەورەمان دا.

-بەخێر بێی خوشکی ئازیز.

هەموو بەیەك دەنگ ئاوامان گوت، تومەز ئەندامی یەکێ لە ڕێکخراوەکانە.. سافیناز، هەر

خۆی سافینازە، خەڵکی ئەزمیر بوو، بە زمانێکی ڕەوان دەدوا، کە دەدوا لە نێوان لێوەکانیەوە بڕێ یاقوت و مەرجان دەردەکەوتن، هەرچیان لێ پرسیبوو، هەواڵی هەر کێیەکیان لێ کردبوو بە: "نایناسم" و "نازانم" وەڵامی دابوونەوە.

بەم جۆرە بووە یەکێك لە ئێمە، بێ ئەوەی وا بکەین هەستی پێبکات خەمی ئەومان بوو: ئاخۆ چی لێ دەکەن؟! ئێمە دەمانزانی چی لێدەکەن..

"باشت کردووە کچم.. دەست خۆش"..

ئاوامان پێ گوت، بێگومان تۆ ئاگات لە هیچ نییە و کەسیش ناناسی.. ئەگەر بشتکوژن تۆ هەر بڵێ ئاگام لە هیچ نییە، ئێمە کەسمان کەس ناناسین و ئاگامان لە هیچ نییە..

ئاوا خۆمان ورەی خۆمان بەرز دەکردەوە، جارێکی کەش پەیمانمان تازەکردەوە کە هیچ نەڵێین.. سوێندی دایکایەتیمان بۆ یەك خوارد. سافیناز کە ئەمەی بینی، کەمێ بە خۆیدا هاتەوە، گوڕوتینێکی وەبەرا هاتەوە، جۆش و خرۆشێکیش لە ناخماندا سەریهەڵدا. لە تەنیشت خۆمەوە جێگام بۆ کردەوە.

هەمدیس کاتی چوونە حەوشەیە. دەرگاکان کرانەوە. دەستی سافینازم گرت، بردم چووزەرەکەی پیشان بدەم، هەمووومان هەمدیس لە دەوری کۆبووینەوە.. ئاومان دا، بە ئاشکرا دیاربوو خۆڵەکەی هەڵتۆبزانبوو و بە ئاستەم سەری دەرهێنابوو، ڕەنگی زەردباوێکی مەیلە و شین دەیڕوانی، لەناو ئەو چیمەنتۆ ڕێژەدا، تاکە جوانییەك، تاکە شینایییەك بێنە بەرچاوی خۆت.. هەریەکە و بە جۆرێ دەیلاواندەوە.. شینایییە جوانەکەم.. وەنەوشەکەم.. گوڵە کێویلەی چیایی. نازانی بە چ ئومێدێکەوە چاوەڕێی بووین.. گەورە دەبێ و گوڵ دەردەکا.. گوڵی هەمە جۆر و ڕەنگاو ڕەنگ. هەر یەکە و ڕەنگێکی بۆ دادەنا، کام ڕەنگی پێ خۆش و جوان بوو نوقڵانەی گوڵێکی ئاوەهای دەکرد. بەڵام چوزەرەکەش لە کەش و هەوای خۆیدا نەشونمای دەکرد. ئێمەش مەراقمان بوو. هەتا سافینازیش بووە خولیای. ئەویش دەیویست: گولیلکە سوورەی چیایی بێ گوڵەکەی. دەبا وا بێ.. بێگومان دەبێتە گولیلکە سوورەی چیاکان، چونکی هەورەکان لە ترۆپکی چیاکانەوە هێنابوو و گەیاندبوویە ئێرەکانە، هەر بۆ ئێمەش لێرە فڕێیدا.. تاکو ئێمەش بۆنی ڕزگاری و ئازادی ئەو چیایانە بکەین.

کە زەنگ لێدرا، بەرەو قاوشەکانیان ڕادایـن، بەڵام چاومان هەر لە دەرەوە بوو. ئەمڕۆ سافینازیان برد. خەم دایگرتین، دەبێ چی لەم جوانە بکەن؟ ساتەکان درەنگ تێدەپەڕین، درێژەی کێشا.. کێ دڵی دێنی ئازاری کچێکی وا بدا!.

—وانییە ئافرەتەکان؟

—بەڵێ..

—کەس دەستی تێ ناچێ.

—بەڵێ ێ ێ.

بەیەك دەنگ هەموومان ئاوامان گوت، بەڵام دەمانزانی وانییە!. لە ناخماندا ترسێکی بێئامان چۆن لافاوێکی لێخن هەڵیکردبوو، ئومێدەکانمانی ڕادەماڵێ. دەمانزانی، چاکمان دەزانی دەتوانن چ بکەن و چی بەسەر ئەو کچە جوانەدا بێنن..

دوای چەند سەعاتێك دەرگا کرایەوە، هەموومان هەستاین، بە پەرۆشەوە بەرەوپیری چووین، وەك جواڵێکی شل و شاو فڕێیان دایە ژوورەوە، نەیتوانی هەڵسێ، جەستەی شین هەڵگەڕابوو، هەناسەی بۆ نەدەدرا، هەڵمان گرت و لە جێگاکەیمان دانا، برینەکانیمان پاقژ کردەوە و پێچامان، بە ئاستەم پێڵووی هەڵبڕی، نە دەگریا نە ورتەیەکی لێوەهات. ئێمە دەگرین، بە خۆیەوەی نووساندم.

"هیچت نەگوت.. وانییە؟ کەسیش ناناسی"..

"بێگومان خوشکێ کەس ناناسم". لەسەرەخۆ ئاوای گوت.

ئێمـــە ئـــەم قۆنـــاغی ئەشـــکەنجەدانەمان بڕیبـوو، راهـاتبووین، خـەمی ئەوانـەمان بـوو کـە تازە دەهاتن.

"دەی زووکەن". ئاوا هاواریان کرد و دەریان کردینـە دەرەوە.. ئـەڵڵا.. جارێکی کـەش ئاسمـان.. ئاسمانی جوان.. هەتاو، تەماشاکەن چۆن تیشکی بڵاودەکاتـــەوە. گەرماییەکـــەی چـــوون گـــەرمایی باوەشی دایکە.. شنە بایەکی خۆش. بێ ئـەوەی بە خۆمـان بـزانین لـە دەوری چـوزەرەکە حەڵقـەمان دابـوو.. سـاواکەمان کـەمێکی تـر بـالآی هەڵـدابوو. دەمانویسـت هـەموومان بەخێویکـەین هـەموومان.. "ئافرەتان با ئەم کارە بە نۆبەت ئەنجامی بدەین.. هـەر جارەی یـەکێکمان خـۆڵی بـۆ پەیدا بکا و یـەك دوو دڵۆپـە ئاویشـی پـێ بـدات..". نـارەزایی بـەرز بووەوە:

"چـــەند رۆژ جـــارێ ئـــەم کـــارە بـــەر ئێمـــە دەکـەوێت؟". هـەقمان بـوو، بۆیـە رێگـا چـارەیەکی دیکەمان دۆزییەوە، "دەبا هەر یەکە و دڵۆپێ ئاوی بـۆ بـێنێ.. ئـاخ پەیداکردنیشـی، بـا لـە ئەسـتۆی یەکێکی دیکە بێ.."

بەم جۆرە هەمووومان لە بەخێوکردنیدا بەشدار دەبـین بـە هـۆی ئـەم "تـۆو"وە چـکۆلانەوە ئەوانـەی خۆیـان تـەریك دەگـرت لـە یـەك نزیـك بوونـەوە، جیاوازی لە نێوانماندا نەما، بووینە ئەندامی یەك خێزان، رەنگە هەندێ گومان لەمە بکات، بەڵام ئەوە راستیەکەیەتی.

لە دەرەوە ژیان بە هـەموو چەشـنەیی خۆیەوە، بەو هەموو تەرزەوە "تۆو"ێکی ئاوا سەرنجی کەس راناکێشـێ، بـەڵام ئـەم کـارە لـە بەندیخانەیەکـدا شـتێکی دیکەیـە، بـا دیلـی دەسـتی دوژمـن بـێ، بـا چـوار دەورت تـەنرابێ، بـە ژیانتـەوە دەبەسـتێ و مانایەکی دیکەی ژیانت پیشان دەدا.

ئەمجارەش بیست دەقیقەکە زوو کۆتایی هات، چاومان نوقان و کردەوە تەواو بوو، هەمدیس بەرەو قاوشـەکانیان بـردین، زۆری پـێ نەچـوو دیسـانەوە هـاتن و سـافینازیان بـرد.. دەورەمـان دا.. "خـۆت راگـرە.. کچـە جوانەکـە کـۆڵ نـەدەی.. بڵـێ کـەس ناناسم.. تێگەیشتی.. ناناسی.". ئاوامان بە گوێدا چـرپاند، لـە باوەشمـان گـرت، ماچـمان کـرد.. "پشووت بێ.. شەرمەزارمان نەکەی، خۆت راگرە، کەس ناناسی..".

باوەشـی پێـداکردین، نەیدەویسـت بـە جێمـان بهێڵـێ، "مـەهێڵن بمبـەن.." ئـاوای گـوت. بـە کـوڵ گریا، بەڵام بێ فرمێسك، فرمێسکی نەڕشت.. لە پڕ تەماشـاکەی گـۆڕا، هـەمان ئـەو تەماشـایە بـوو کـە یەکـەم جـار هاتـە ئێـرە، وەك تەماشـای ئاسـکێکی سـرکی بـەر قـەرەوڵ، هـاتن، هـەر یەکـە و پاڵێکیـان پێوەنـاین، بەملاوبـەولادا کـەوتین، کچەشـیان لـە دەســـتمان دەرکـــردو بردیـــان، هـــەر لـــەوێ چاویان بەستەوە. پارچە رەشەکەی سەر چاوی لەوە دەچوو چاوشارکێ بکا، دەستی بۆ پێشەوە درێـژ کرد، وەك بۆ ئێمە بگەرێ و بیەوێ بماندۆزێتەوە.. لە پڕێکا:

"ئێـوە نـازانن ئـەوەی بـەر دەسـتی ئـەم زاڵمانـە بکەوێ چی لێدەکەن.. ببوورن بەرگە ناگرم.. ئاه.."

ئافرەتـەکان وەك ئاوێکی ساردیان پێدا بکەی وایان لێهات، پەشۆکان.. ئومێد بڕ بوون، ئەم کچە خـۆی پـێ رانـاگیرێ و بەرگـە نـاگرێ.. هـەموومان ئاوامـان وت.. کچێکی ناسـك و نـازداری ئـاوا چۆن بەرگەی ئەو جەزرەبەدانە بگرێ؟..

بردیـان.. چـرکە و سـەعاتمان لـێ بـووە سـاڵ، بـووە زینـدانێکی تاریـك، زینـدان لـە نـاو زینـدانا چ کارەساتێکە. هەموومان بە پێوە راوەستاوین، کەس نقەی لێوە نایەت. سەرسام و گێژ دەڕوانین.. دەنگی کرانـەوەی دەرگاکانمـان دەبیسـت.. ئـەمجا، دەرگـای قاوشـــەکەی ئێمـــە کرایـــەوە.. پاڵێکیـــان پێوەنـــا،

هەمدیس کەوت، بە دیار سەریەوە بووین.. ئاه.. ئەوە چییە؟ دانەکانیان شکاندووە، لێوە جوانەکانی تەپەسکابووە ناو دەمیەوە، هەمدیس جەستەی شین و مۆر هەڵگەڕاوە.. بەو یەك دوو سەعاتە 20 ساڵ تەمەنی گەورەتر دیاربوو..

"ئەی زاڵمی فاشیانەی بێ بەزەیی". بە دەنگی بەرز هاوارمان کرد، جوێنماندا، لە پڕ دەرگا کرایەوە، جەندرمەکان هاتن. شەلم کوێرم دەسناپارێزم، بە قامچی کەوتنە ویژەی هەمووان. ئێمەش بە نینۆك رۆمەتیانمان رووشاند، ئەوانیش قژەکانمانیان دەسکەنە کرد.. لە هێزکەوتین.. توانای جوڵانەوەمان نەما، بەڵام رق و کینەمان زیادی کرد، قین و توڕەییمان بوونە زنجیرە شاخێکی سەخت، هەستیان پێکرد، ترس و سڵکردنەوەیان بە چاوی خۆمان بینی.. کشانەوە، دەرگاکانیان کلۆم داو رۆیشتن.

ڕۆژانێك ژیانمان بەو تەرحە بەسەر برد.. سافیناز، زامەکانی گۆشتەزینیان هێنایەوە، خەریك بوو چاك دەبووەوە. دووبارە ئەشکەنجەیان دەدا.. لەشیان ئەنجن ئەنجن دەکرد و دەیان هێنایەوە.. هەرچیان دەکرد نهێنی نەدەدرکاند.. هەموو جارێکیش کە دەچووینە حەوشە، لەگەڵ ئێمەدا چووزەرەکەی بەسەر دەکردەوە.. هەموو جارێکیش دەیگوت:

"وا خەریکە خونچە دەکات..".. ئومێدی بە چووزەرەکە، بە ساواکەمانەوە بەست.. ساواکەمان گەورە بوو.. ئاخرییەکەی گەڵای دەرکرد. دەزانی؟..

تەنها سێ گەڵای لێ پەیدا بوو، سێ گەڵای سەوزی جوان، پڕ لە ژیان، تیشکی دەدایەوە، بە ئاستەم خۆڵەکەی ترازاندبوو، بە ئاشکرا چەکەرەی کردبوو.. خرۆشاین، بە جارێ خرۆشاین، چۆن خرۆشانێك؟.

یەك شەمموان لە قاوشەکانیان دەرنەدەهێناین، باشە. ئەو دوو رۆژە چۆن بەسەربەرین؟.. کە دەردەچین چ رەنگێکی دەبێ؟.. لاڵەکەمان، نێرگزەکەمان، گوڵە نیسانەکەمان رەنگی چی دەبێ؟!، لە بارەی گوڵ و خونچەوە گەڵێ حەکایەتمان گێڕایەوە.. گۆرانیمان چڕی، بە دیارییەکی پیرۆزی چیاکانمان زانی، چیاکانیش ئێمەیان لە بیر نەکردووە.. بۆیە زۆرمان خۆشدەویست.

سافیناز هاتبووە خۆی، هەرچیمان دەست بکەوتایە، حەزمان دەکرد دەرخواردی ئەوی بدەین..

"دە ئێوەش لەگەڵما بخۆن..".

"نەخێر.. با هۆشێکت بە بەرا بێ..".

دەبا بزانین رۆژی دووشەممە چۆن گوڵێکی دەرکردووە..

کاتی دەرچوونمان هات.. سافیناز هۆشی بەبەرا هاتبوو، وەك خۆمان بۆ جەژن ئامادە بکەین، جلەکانمان گۆڕی، قژمان داهێنا، قاوشەکەمان تەنها دوو سابوونی بۆنداری لێ بوو، دەم و چاومان پێ شۆری.. دەرگا کرایەوە، بە پاڵەپەستۆ و پەلەپەل دەرچووین.. چی ببینین باشە؟! خونچەکەمان لە ژێر پۆستاڵدا پلیشابووەوە.. ترسێکی سارد دایگرتم، لە پڕ، نازانم لە کوێوە بوو، هاوارێکی ترسناك بەرز بوووەوە.. هەندێکمان مات و خامۆش، هەشبوو فرمێسکی دەرشت. ساواکەمان کاتی لە دایك بوونی بوو.. کوشتیان.. تووشی سەرسامی بووین.. واقمان وڕما، بۆ یەکەم جار هێشتا 20 دەقیقەکە تەواو نەبوو بوو گەڕاینەوە قاوشەکان..

ئەمجارەش هەمدیس هاتوون سافیناز ببەن.. بەڵام کارێکی نەکردەنییە، نەبووە و نابێ.. نایدەین.. دەستەو یەخە کەوتینە گیانی یەکتر.. جەندرمەکان چاوەڕێی ئەوە نەبوون ئاوا ببینە دەست، ئەوانە چەکدار و ئێمە بە

نینۆك و ددان، هیچیان پێنەكرا، جەندرمەی دیكە هــــــات.. ئاخرییەكـــــــەی بردیـــــــان.. زۆری نەخایاند هێنایانەوە، ئەمجارەیان، بە پێی خۆی هاتــەوە!. لــە گـولێ كاڵتریـان پـێ نـەوتبوو، لێیـان نـەدابوو، بـەڵام دەگریـا، بـە كـوڵ دەگریـا.. سەرسام بـــووین، پەشـــۆكاین.. ئـــەو ئەشـــكەنجە زۆرە فرمێسكی پـێ نەڕشت، ئێستا وا بـەبێ ئەشكەنجە خوڕان خوڕان فرمێسك دەڕێژێ. مت بوو بووین. من خۆم پێنەگیرا:

"سافیناز، خێرە؟ چ بووە؟"

بــە دەم هەنســكەوە "وتم.. هــەموو شــتێكم دركاند..".

"شێت بووی؟ كاری وا چۆن دەكەی؟!".

"كردم.. هەموو شتێ كۆتایی پێهات.."

"ئەشكەنجەیان دای؟"

"نـەخێر.. لێیـان نـەدام.. خۆشـم نـازانم چـۆن بوو، نازانم نازانم.. هەموو شتێكم وت.."

"چۆن شتی وا دەبێ؟!".

هەموو ئافرەتەكان كۆبوونەوە..

"نازانم نازانم.. نەمزانی چۆن هاتە سەر زبانم و دركانـدم.. هــەموو شــتێكم گـوت.. بمكـوژن بـا نەمێنم..".

نەماندەزانی چ بكەین، هەوڵماندا كەمێ دان بە خۆمانـا بگـرین.. منـیش كەوتمـە دڵـە راوكـێ، دڵـە ڕاوكێیەكەم تا دەهات گەورەتر دەبوو، ختوورەیەكی بەسام.. منـیش قسـە دەكـەم!!. هاوڕێكـانم بـە گـرتن دەدەم.. سەرم گڤەی دێ.. ئای خودایە.. ئەگەر وام كرد ئەی دواجار چی بكـەم؟.. هـەر لـە خۆمـەوە بیرم لــە خۆكوشــتن كـردەوە، باشــتر.. چــونكی مــردنم چەندین هاوڕێم پێی رزگار دەبێ.. بەمەیان هەستم بە ئارامی كرد، لەگەڵ خۆمدا كەوتمە پـلان دانـانی خۆ كوشتنەكەم.. دواجار هەمدیس ترسەكە سەری هەڵدایـەوە، ترسـی نـەمان.. لـەم كاتـە چـوزەرەكەم هێنایـــەوە بـــیری خـــۆم.. منداڵـــە ســـاواكەمان.. خونچـەكەم وە بـیر هاتـەوە، چـۆن چـۆنی پۆسـتاڵ فلیقاندییـــەوە.. ئەگـــەر وای لـــێ نـــەهاتبا، ئـــاخۆ گوڵەكەی چ رەنگێكی دەبوو؟.. رەنگە شینێكی تۆخ بوایـە.. لەوانـە بـوو سـووربا و بوایـە.. كـێ دەڵـێ وەنەوشـەیی نـەدەبوو.. یـا هەرچی رەنگ هەیـە لـەم دنیایەدا لـەو گوڵـەدا دەبوو.. بـەڵام كوشتیان.. هـەر سێ گەڵاكەشی نووسابوونە چیمەنتۆكەوە، خوێنی كەسـكی گـەڵاكان رژاو چـووە خانـەی نەمانـەوە.. تـۆش ئـاوا لـە چـاو تروكانێكـدا دەسـڕێیتەوە.. وا هەمـدیس گێژەڵۆكـەی تـرس دای بەسـەرما، لەگـەڵ خۆمـــدا تووشـــی بگـــرە و بـــەردە بـــووم، كەوتمـە ترانـەكردن بـە خـۆم.. ئەگـەر ئامادەنیـت گیانی خۆت ببەخشی ئەم هەرایەت لە پای چی؟.. بەمـە قـەرس بـووم، خـۆم ئامـادەكرد، بـە تـەواوی بڕیاری خۆمدا..

دەرگـــا دەكەنـــەوە و بـــانگم دەكـــەن.. ئـــای ئەشكەنجەی ئەم جەندرمانـە.. شڵەژام.. پەلكێشـم دەكـــەن.. لـــە هاوڕێكـــانم دامـــدەبڕن.. دەســـتم دەبەستنەوە، دەمبەن.. لە ڕێڕەوێكەوە بۆ ڕێڕەوێكی تـرم دەبـەن، وەختێكـی كـە باسـی ئـەو ڕێڕەوانـە دەكـەم.. ماوەیـەك رۆیشـتین، لەبـەر دەرگایـەك رایـان وەستانم.. یەكێكیان دەرگاكەی كردەوە و بردمیانە ژوورەوە.. ئەمە چ بۆنێكە لـەم ژوورەوە دێ؟.. بۆنی گۆشـتی گـەنیو بـە گـژما چـوو.. خـۆم گـرت تـا نەڕشـێمەوە.. خـەریكم دەخنكـێم، بەرگـەی بـۆنی وا ناگرم، پەڕۆكەی سەرچاومیان لادا، لە پێشدا هیچم بۆ لێك جیانەكرایەوە، دواجار بە مەزەنـدەی ئێوە چ ببینم باشە؟!. مرۆڤێك بە زنجیر هەڵواسرابوو، جێ لێدانـەكانی شمسـیان بەسـتبوو.. بـە حـاڵ نـوزەی دەهـات.. بەسەرسـامییەوە تەماشـای ئـەو جەسـتە شێواوەم كرد.. دواجار بە حاڵ چاوی تێبڕیم.. تەنها چـاوی زینـدووومابوو، زاق زاق تەماشـای دەكـرد، تەماشاكەی ئاسایی نەبوو، رەنگە هەر تەماشاكەی دوژمنی شێت و هار كردبێ، تەماشا نەبوو هاوارێك

بوو. ئا، من ئەو چاوانە دەناسم، چەندین جار یەكمان بینیوە، بەلاّم نازانم سەر بە كام گروپ و تاخمە.. گرنگ نییە، دەیناسم.. روویان لە من كرد:

"سۆزانی ئەگەر قسە نەكەی بەم دەردەت دەبەین".

وایان گوت، هەمدیس چاومیان بەستەوە و لە ژوورەكەیان دەركردم.. لە دواوە وە دەنگێكی زولاّڵ، بەرز دایچەڵەكانم، كەس بڕوا ناكات دەنگێكی ئاوا گوڕ، لە جەستەیەكی ئەنجن ئەنجن كراوەوە بێ!:

"قسە نەكەی خوشكێ! ئازاری ئەشكەنجە زوو لە بیر دەچێ، بەلاّم ئازاری ئیهانەت بە درێژایی تەمەن نابڕێتەوە..

دەنگەكە لە مێشكما بەرز و بەرزتر، گەورەتر، زولاّلتر دەبووەوە، مێشكم، جەستەمی لێ پڕ بوو.. بە هەموو زیندانەكاندا دەنگی دەدایەوە.

"قسە نەكەی، هیچ نەدركێنی، ئازاری ئەشكەنجە زوو دەڕوا و لە بیر دەچێتەوە.. دەڕڕواواوا ئیهانەت نانابڕڕێتەوە.".

هەموو شتێكم لە بیر چووەوە، هیچم لە بیرنەما هەر هیچ.. هەتا ناوی دایك و باوكم نەدەهاتە بیرم.. تەنها ئەو دەنگە لە مێشكمدا دەنگی دەدایەوە.

"قسە نەكەی..."، تەنها دەنگەكە و مەیدانێكی پان و بەرینی شینایی و هیچی تر، لەگەڵ پارچەیەكی شین شینی ئاسمان، شینابییەكە گوڵی رەنگاو رەنگی تێدابوو.. مۆر، وەنەوشەیی، پەمەیی.. گوڵ گوڵ یەك پارچە گوڵ.. جار نەجاریش تەمێكی سپی گوڵەكانی دادەپۆشی، هەندێ جاریش تەمەكە دەڕەوییەوە.. گوڵەكان شەپۆل دەدەن، بەزمێكە لە رەنگ، شنەبایەك دەیانهێنێ و دەیانبا، گوڵەكان تێكەڵ یەكتر دەبن، باوەش لەیەك دەدەن، دەنگەكەش هەر دەنگ دەداتەوە..

"قسە نەكەی..".

چ دەنگێكە ئەم دەنگە؟ لەوەتی دنیا هەیە دەنگی وا نەبیستراوە "قسە نەكەی..". لەناو گوڵەكاندا، سافیناز دەكەوێ و هەڵدەستێتەوە.. دەنگەكەش تا دێ زولاّلتر دێتە گوێم..

"قسە نەكەی.."

قسەم نەكرد.. وام لە پێشیاندا.. لە پەنجەرەكەوە تیشكی خۆر دزەی كردووە.. ژیان چەند خۆشە.. بروانە چەند جوانە

## یوجەل فەیزی ئۆغلۆ..

یەكێكە لە چیرۆكنووسە ناسراوەكانی توركیا، نزیكەی 20 ساڵێكە لە ئەڵمانیا دەژی. چیرۆكەكانی لە لایەن رەخنەگران و خوێنەرانەوە پێشوازییەكی باشی لێ دەكرێ..

چیرۆكەكانی بەرگری كردنە لە مرۆڤ، ژیانی بەندییەكانیش پانتاییەكی زۆری لە چیرۆكەكانی داگیر كردووە.

ئەم بەرهەمانەی بە چاپ گەیاندووە:

-قاچاغ، كۆمەڵە چیرۆك 1974

-گرمە، رۆمان 1983

-بێ نەوایان، كۆمەڵە چیرۆك 1985

## سەرچاوە

ئەم چیرۆكە لە كۆمەڵە چیرۆكی (*MA..*)وە كراوە بە كوردی.

# ئه‌گه‌ر زیندوو نه‌بووم

## پوخته‌یه‌ك له‌ ژیان و چه‌ند پارچه‌ شیعرێكی

**ئیمیلی دیكنسۆن**

**له‌ فارسییه‌وه‌: فرزند شێركۆ**

### شاژنی سپی پۆش [1]

ئیمیلی دیكنسۆن له‌ ساڵی 1830ز له‌ ویلایه‌تی (ماساچوست)ی ئه‌مریكا له‌ دایكبوو و له‌ ساڵی 1886ز و هه‌ر له‌ هه‌مان ماڵ و هه‌مان شارۆچكه‌ و هه‌مان ویلایه‌تدا كۆچی دوایی كرد. یه‌ك خوشك و یه‌ك برای هه‌بوو. باوكی، خه‌زنه‌داری زانكۆ و پیاوێكی وشكی پیرۆز بوو. "به‌ دڵێكی پاك و سامناكه‌وه‌". ئیمیلی به‌ ده‌گمه‌ن له‌ ماڵ ده‌چووه‌ ده‌رێ و زۆر ده‌گمه‌نتر، شاریان زێده‌كه‌ی خۆی جێده‌هێشت. هه‌رگیز شوی نه‌كرد و ژیانی خۆی به‌ چرینی شیعر و پاراستنی ماڵ و خزمه‌تكردنی باوك و دایكی، برده‌سه‌ر. دوای مه‌رگی باوك و دایكی، به‌ ته‌واوه‌تی گۆشه‌گیر و خانه‌نشین بوو و ته‌نانه‌ت له‌گه‌ڵ خزم و ئاشنایانیشدا له‌ رێگه‌ی یاداشت و نامه‌ی كورت و بچڕبچڕه‌وه‌، په‌یوه‌ندی ساز ده‌كرد.

له‌ ته‌مه‌نی سی ساڵیدا، دڵی دا به‌ پیاوێك له‌ هاوڕێیانی خێزانه‌كه‌ی به‌ نێوی "چارلز وّدزۆرس" كه‌ قازی بوو له‌ دادگادا. به‌ڵام "وّدزۆرس" یه‌ك ساڵ دواتر (له‌ ساڵی 1861ز)، ئیمیلی جێهێشت و به‌ بیانووی كاره‌وه‌ به‌ره‌و ویلایه‌تی كالیفۆرنیا دوور كه‌وته‌وه‌. ئه‌م ناكامیه‌ له‌ عه‌شقدا به‌ توندی ئیمیلی نائومێد و په‌رێشان كرد و هه‌ر له‌م ساڵانه‌دا (ساڵانی 1862-1865ز) ئیمیلی گه‌یشته‌ ترۆپكی داهێنان. ئیمیلی پاش ئه‌م كاره‌ساته‌، هه‌میشه‌ جلوبه‌رگی سپی له‌به‌رده‌كرد و له‌ ماڵ ده‌رنه‌ده‌چوو.

هه‌ندێ جار پارچه‌ شیعرێ یا نامه‌یه‌كی كورتی له‌گه‌ڵ چڵێك گوڵدا بۆ هاوڕێ یاخود ئاشنایه‌كی ده‌نارد. هاوشاریه‌كانی زیاتر ئه‌ویان وه‌ك "ژنێكی سه‌یر" ده‌ناسی وه‌ك له‌ "شاعیر"ێك و به‌ "ئه‌فسانه‌"، "ژنی سپی پۆش" و "شاژنی-گۆشه‌گیر" ناویان ده‌برد. له‌گه‌ڵ ئه‌مانه‌شدا، خه‌رواری نامه‌ به‌جێماوه‌كانی ئیمیلی ئه‌وه‌ ده‌نه‌خشێنێت كه‌ گۆشه‌گیری و ته‌نیا ژیان-ی ئیمیلی به‌ مانای دووری و بێزاری له‌ ده‌وروبه‌ر

نەبووە، چونکە نامەکانی لێو لە عەشق و سۆزێکی قوڵ و پەیوەندییەکی راستگۆیانە و بەرامبەرانەیە.

لە بەهاری ساڵی 1862ز دا نامە گۆڕینەوەی لەگەڵ "تۆماس هیگنسۆن"دا دەست پێکرد، نامە کارییەک کە تا کۆتایی تەمەنی ئیمیلی خایاند و تەنها یەکجار دیداری رووبەڕووی لە ماڵی ئیمیلیدا لێکەوتەوە.

دوای مەرگی ئیمیلی، خوشکەکەی "لاڤینیا" دەستەوارەیەک کاغەزی جیاجیا بەڵام لەگەڵ یەک دووراوی ئیمیلی دۆزیەوە کە 1700 پارچە شیعری "ئیمیلی" لە خۆ دەگرت.

یەکەمین هەڵبژاردەی شیعری ئیمیلی لە ساڵی 1890ز داو بە یاوەری و هاوکاریی "تۆماس هیگنسۆن" بلاوکرایەوە و ئیمیلی وەک شاعیری شاعیرەکان بە جیهانی وشە، هەستی، تەنهایی و دوای مەرگی، بە مەرگێکی نوێ و ژیانێکی نوێ و "خودا" ناساند.

وشە دەمرێت
گەر بێتە سەر زوبان
هەندێك وا دەڵێن.
من دەڵێم
تازە لەو ڕۆژەدا
دەژی.

جاڵجاڵۆکەیان وەك هونەرمەند
هەرگیز نەناسی،
هەرچەندە ناسك - نوێنیەکەی
لە هەموو شوێنێك شاهیدن-
قەراغ هەر گەسك و ژێر هەر پردێك -
لە هەر سەر زەمینێکی خودا دا-

ئەی وەچەی لە یادکراوی داهێنان،
من دەستت دەگوشم
میوەی قەدەغەکراو تامێکی وای هەیە
کە باخە حەڵاڵەکان دەکاتە گاڵتەچی.
چەند بەلەزەت هەڵنیشتووە لە توێکڵدا
تۆوێك کە فرمانەکەی داخراوە!

نە بە تێلاً دەتوانن دڵ بشکێنن
نە بە بەرد-
دیتوومە قامچیەکی نادیار
ئەو بوونە سیحراویە
هێندە لێیدا
کە لە بزاوتی خست
ناوی ئەو قامچیە بەڵام
بالآترە لەوەی کە بێتە سەر زوبان.
سەروەرانە وەك باڵندەیەك کە دەچڕێت
بەرەو بەردێك
کە کردوویە بە نیشانە.
شەرم پێویست ناکات
کە بەسەر زەوی ئێمەدا بە کووڕی بڕوات-
شەرم، راست بەرەوە
کە جیهان هی تۆیە.

ئەم سورە گوڵە کەس نایناسێت-
رەنگە زائیرێك بێت-
ئەوە نەبوو لە قەراغ رێگەم هەڵگرت و
بۆ تۆم هێنا-
جێگا چۆڵەکەی
تەنیا هەنگێك هەستی پێدەکات-
تەنیا پەپولەیەك-
بە پرتاو گەڕاوە لە سەفەرێکی دوور
تا لەسەر سینگی ئارام بگرێت-

تەنیا باڵدارێك حەیران دەبێت
تەنیا شنەیەك ئاھ هەڵدەكێشێت
ئاھ گوڵە بچكۆلەكە - چەند ئاسانە
بۆ وەك تۆیەك مردن!

من كەس نیم! تۆ كێیت؟
تۆیش ئایا كەس نیت؟
كەواتە ئێمە جوتێكین.
بە كەس مەڵێ!
نەوەكا رسوامان بكەن!
چ بێزاركەرە (كەسێك) بوون!
چ شەرمهێنەرە وەك بۆقەكان
لەسەرانسەری بەهاردا ناوی خۆت
بە سەرەنوێلكێكی ستایشكار بڵێیت!

قەدیسەكان لە هەر جێیەك لەنگەر بگرن
فەزای خۆیان دەڕازێننەوە.
بڕوانە كە ئەفلاكێكی گەورە
شوێن ئەستێرەیەك كەوتوون

چەند خۆشە بەردێكی بچكۆلە
كە بە تەنیا بە شەقامێكدا تل دەبێتەوە-
نەخەمی كارێكی هەیە
نە لە گرفتەكان دەترسێت.
ئەو رەگە رەنگ قاوەییەشی
جیهانێكی تێپەڕیوو لە بەریدایە-
ئازاد وەكو خۆرەتاو
لە كۆمەڵدا یان بە تەنها دەدرەوشێتەوە،
و بە پاكیەكی هەڵكەوت ئاساوە
لە ویستی رەها فەرمان دەبات

جوانیی بەسەرمندا چڕدەبێتەوە تاوەكو بمرم-
ئەی جوانی، ئیدی ئۆقرە ناگرم!
بەڵام ئەگەر هەر ئەمڕۆ بمرم،
بێڵە لە شێوەی تۆدا بم.

هەرگیز نازانین كە دەڕۆین
كاتێك بە ڕێگاوەین-
دەرگا بە گاڵتەوە دادەخەین-
چارەنووس بە شوێنماندا دێت
و كێلونی دەرگاكە دادەخات-
و ئیدی ئێمە دیدارێكی دیكەمان نییە.

لە خودایەك داوامان هەیە-
ئەوەی كە ببەخشرێین-
چونكە تاوان لای ئەو ئاشكراو
بەڵام لای ئێمە نادیارە-
شاراوە لە سەرتاپای ژیاندا-
لە زیندانێكی سیحراویدا.

لە نزیك مردووەكان خوازیارین دانیشین و
گەلێ رێزیان لێبگرین-
لە پێناو لەكیسچووەكاندا دەجەنگین
هەرچەندە ئەوانی دیكە هەموویان لێرەن-
لە ماتماتیكێكی شكاودا
سودی خۆمان تاوتوێ دەكەین-
دەڵێی هەرچیەك ونتر دەبێت
لەبەرچاوی تەنگماندا زۆرتر دەنوێنێت!

ناوبانگ خۆراكێكە بێ مایە
لە قاپێكی سوڕاو دا،
لەسەر سفرەیەك كە بۆ هەر میوانێك
تەنیا یەكجار رادەخرێت.
وردەكانی، قەلەڕەشەكان دەیگەنێ

و بە قیرە قیڕێکی گاڵتە ئامێزەوە
بەرەو تۆوەکانی جوتیار باڵدەگرن.
پیاوان لێی دەخۆن و دەمرن.
مەراسیمی رۆژی شەممە هەندێك لە کڵێسا
بەرز رایدەگرن
بەڵام من لە ماڵەوە–
سرود خوێنی من یەك پەرەسێلکە
گومەزم لە باخچە.
هەندێك بە عەباوە بەرەو پیری شەممە دەچن–
مە تەنیا باڵەکانم لەبەر دەکەم،
و لە بری ناقوسی کڵێسا
باڵندە کەمانە کە دەچڕێ.
گوتار خوێنمان خودایە –
ئەو رۆحانیە ناسراوەی
کە گوتارەکانی هەرگیز درێژ نییە–
کەواتە لە بری ئەوەی سەر ئەنجام بگەمە
بەهەشت،
من هەمیشە بەرەو ئەوێم

مەلەکوت دوورییەکە
ئەوەندەی نزیکترین ژوور،
گەر لەو ژورەدا هاوڕێیەك
چاوەڕێی خۆشبەختی یان لەناوچوون بێت.
چەند لە خۆ بردووە رۆح
کە دەتوانێت ئارامبگرێت
لە ئاست دەنگی پێیەك دا کە
دێتە پێش،
دەنگی دەرگایەك کە دەکرێتەوە!

ئەوەی کە جگە لە عەشق هیچ شتێك نییە،
تەنها شتێکە کە لە عەشقی دەزانین–
هەر ئەمە بەسە– باری کەشتی دەبێت
هێندەی فراوانی و تواناکەی بێت.

ئەگەر زیندوو نەبووم
سینگ سورەکان[2] کە هاتن
بەوەیان کە تەوقێکی سوری لە ملدایە
بە یادمەوە پارچە نانێکی بدەرێ.
گەر نەمتوانی سوپاست بکەم
لەو روەوەی کە لە خەوێکی قورسدام،
تۆ بزانە لەو هەوڵەدام
بە لێوانێکی پڕ لە بەردی تیژەوە.

## پەراوێز

1–ئەم ناونیشانە لە بری (کورتەیەك) بۆ ناساندنی ئیمیلی بەکارهێنرا. (وەرگێڕ)

2–سینگ سورەکان: باڵندەگەلێکی رەنگ قاوەیی سینگ سورن.

## سەرچاوە

گزیدەنامە هاو اشعار امیلی دیکنسون
ترجمە سعید سعید پور
انتشارات مروارید
چاپ سوم 1383

# فایلی ژمارە

# پۆستمۆدێرن و پۆستمۆدێرنیزم

- **پۆستمۆدێرنیزم چییە؟**

**چارلز چنگز**

**لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی**

- **پۆستمۆدێرنیزم، ڕێکخستنەوەی شتەکانی ناو گەردون**

**فەیاز چاگانی**

**لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد**

- **پۆستمۆدێرنیزم لە (ئەدەب و هونەر)دا**

**ڕۆبێرت ڕای**

**لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید**

- **ڕەخنەی پۆستمۆدێرن، لە ئایدیای گەردونگەرایی**

**سائر دیب**

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**

- **ئەدەبیاتی چیرۆك بێژی پۆستمۆدێرن**

**لەری مک کافێری**

**لە فارسییەوە: عادل محەمەد پور**

- **کلتوری پۆستمۆدێرن**

**لە عەرەبییەوە: سەردەم**

- **ئەفلاتۆن لەناو پۆستمۆدێرنەکاندایەو.. دژیشیانە**

**جۆزیف سپینسەر**

**لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد**

# پۆستمۆدێرنیزم چییە؟

چارلز چنگز
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

سەردەمی مۆدێرن کە سەردەمێك بوو وا دەردەکەوت بۆ هەمیشە لە رووبەری مێژودا دەمێنێتەوە، بە خێرایی بەرەو ئەوە دەڕوا ببێت بە بەشێك لە رابردوو، دەچێتە ناو لاپەڕەکانی مێژووەوە و ئەرشیف دەکرێت، چیدی لە مێژوو و رووبەریدا ئامادە نییە. پیشەسازیبوون بە خێرایی جێگەی خۆی بە سەردەمی پاش پیشەسازی دەدات، کارکردن لە کارخانەکاندا جێگەی خۆی دەدا بە کارکردن لە ماڵەوە و لە ناو بەڕێوبەرایەتییەکانەوە. لە بواری هونەردا "نەریتی نوێ" دەبێتە هۆی پێکهاتەیەك لە نەریتە بێشومارەکان. تەنانەت کەسانێکیش کە تا هەنوکە خۆیان بە هونەرمەند و بیناسازی مۆدێرن دادەنێن، تەماشای دەوروبەری خۆیان دەکەن بۆ ئەوەی بزانن بە دوای چ شێوازگەلێك و چ بەهاگەلێکدا دەبێ بڕۆن.

سەردەمی پۆستمۆدێرن سەردەمی هەڵبژاردنە بێشومار و ڕوو لە زیادەکانە. سەردەمێکە کە ناکرێ هیچ روداوێکی ئەرسۆزۆکسی بە بێ خودهوشیاری و تەنز، قبوڵبکرێت، چونکە هەموو نەریتەکان بۆ خۆیان نرخ و بەهایان هەیە. ئەمە خۆی تا رادەیەك دەرئەنجامی ئەو شتەیە کە پێی دەڵێن: سەدەمی تەقینەوەی زانیاری، دەرکەوتنی زانینی رێکخراو و پەیوەندی جیهانی و سیبرنیتیك. نەك هەر دەوڵەمەندەکان بەڵکو هەموو هاولاتیان وەك کۆکەرەوە و موسافرانی زەمەنیان لێهاتووە کە لەبەردەم فرەیی بابەتی هەڵبژاردندا. پۆلۆرالیزم رێبازی بالا دەستی سەردەمی ئێمە، هەم گەورەترین کێشە و هەم گەورەترین ئارامگایە: هەر پیاوێك دەبێ بە هاولاتیەکی گەردوونی و هەر ژنێك دەبێ بە کەسێکی ئازاد، ئاژاوە و دڵە ڕاوکێ بەسەر حاڵەتە رۆحیەکانی تاکەکاندا زاڵ دەبێت و تاوان دەبێتە شێوەی باوی کلتوری جەماوەری.

ئەمە ئەو بەهایەیە کە ئێمە بۆ سەردەمی پۆستمۆدێرن دەیدەین، بەهایەك کە هێندەی یەکڕەنگی، نەبوونی هەمەڕەنگی، دۆگماتیزم و فەقیری و نەگبەتی سەردەمی مۆدێرن، زەحمەت و گرانە. بەلام سەرەڕای ئەو هەوڵە زۆرانەی کە لە ئێران و شوێنەکانی دیدا دەدرێت، گەڕانەوە بۆ

کلتوری رابردوو، یان شێوەیەکی پیشەسازی، یان سەپاندنی مەزهەبێکی بونیادگەر یان جۆرێك رووداوی ئەرسۆزۆکسی مۆدێرنزمی (یان مۆدێرنیزمی ئەرسۆزکس) نامومکینە. سیستمی پەیوەندی جیهانی و شێوەی بەرهەمهێنانی سیبرنیتیك، لەگەڵ دەرکەوتنی خۆیاندا پێداویستی تایبەتی خۆشیان دروستکردووە، ئەمانە جگە لە جەنگی ئەتۆمی، کۆمەڵێك رووداون کە قابیلی گۆڕان و گەڕانەوە بۆ دواوە نین.

تەحەداکردن بۆ دۆزینەوەی هاملێتی پۆستمۆدێرن، رووبەڕوبونەوەی ئەو کێشە و گرفتانەی دەرئەنجامی سامانن، بریتیە لە هەڵبژاردن و تێکەڵکردنی نەریتەکان بەشێوەیەکی هەڵبژاردە و وەرگرتنی رەهەندگەلێکی رابردوو و ئێستا کە پێدەچێ بۆ ئەم مەبەستە گونجاو دەرکەون. ئەرئەنجام و بەرهەمی کار ئەگەر سەرکەوتوو بێت، تێکەڵێکی سەرنجڕاکێشەرە لە نەریتەکان، و لە کاتێکیشدا سەرنەکەوێت شتێکی تێکەڵ و پێکەڵ دەبێت. بەلەمە هەوایەکانی پۆستمۆدێرن لە هاتن و چوون لە نێوان پێکهاتەی داهێنان و لاسایکردنەوەی شێواو، بە گشتی رێگەی خۆیان گومکردووە و توشی کارەسات دەبن، بەڵام هەندێکجار مژدەی مەزنی کلتورێکی فرەخواز بە ئازادیگەلێکی بێشومار، جێبەجێدەکەن.

پستمۆدێرنیزم لە بنەڕەتدا تێکەڵەیەکی گیراوەیە لە هەر جۆر نەریتێك لەگەڵ نەریتەکانی رابردوودا: هەم بەردەوامی مۆدێرنیزمە و هەم بەرزبونەوە لێی و پەرەسەندنێتی. خەسڵەتی سەرەکی بەرهەمە پۆستمۆدێرنەکاندا دەکرێ لە کۆد و رەمز چەند رەهەندی، ئاڵۆز، تەنزئامێز، هەجوەکان، هەڵبژاردنی هەمەرەنگ و پەرشوبڵاو، و ناکۆکی و نابەردەوامی یان دابڕان لە نەریتەکاندا، بدۆزینەوە، چونکە ئەم نەگونجان و ناچونیەکیانە دەوری هەموو فەزای پلۆرالیزمی ئێمەیان داوە. شێوازی تێکەڵە و هەمەرەنگی بەشەکانی، لەبەرامبەر کورتکردنەوەی ئایدۆلۆژیای مۆدێرنی دوایی و هەموو ئەو رەقیبانەدا رادەوەستێ کە لەسەر بناغەی سەلیقە یان بنەمای دۆگمایی پاوانکراو، راوەستاون.

ئەمە لایەنیکەم هەمان ئەو شتەیە کە من بە پێی ئەو، پۆستمۆدێرنیزم بە بزوتنەوەیەکی کلتوری و قۆناغێك یان سەردەمێکی مێژووی دەزانم. بەڵام مانای ئەم زاراوەیە لەم پەنجا ساڵەی دوایدا گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە و تەنها لە دەیەکانی 1990دا مانایەکی روونی پەیدا کرد. هەندێك بەڕووداوێکی پێشکەوتوخواز و هەندێك بە رووداوێکی کۆنەپەرستانەی دەزانن کە شایەنی رەدکردنەوەیە. هەندێك لەبەر واقعیبوونی کۆمەڵایەتی و تەکنەلۆژیەکەی، بەرگری و پشتگیری لێدەکەن، و هەندێکیش وەك رووداوێکی کۆنەپەرستانە، و دژی فەلسەفە و ئاراستەکەر، مەحکومیدەکەن. تەنانەت لە زۆرێك شوێندا کە لەبەر رەهەندە شیزۆفرینیەکەی تاوانباری دەکەن، زۆرێك لەوانەی بەرگری لێدەکەن ئەم کەموکوڕیە بە بەهای پۆزەتیڤی دادەنێن. هەندێك نوسەر هەڵسەنگاندنێکی نێگەتیڤیان بۆی هەیە و پێناسی ناخۆشی بۆ دەکەن و جەخت لە رەهەندی ئاوسا و پەرەسەندنی کۆنترۆڵنەکراوی دەکەن کە خەسڵەتی ئابووری چەند لایەنە و فەرەخوازە. بەڵام لێکۆڵینەوەی ئابووری و وردی بەڵگە هەبوەکان پیشانیدەدەن کە بەرهەمهێنانی سەرسوڕهێنەر و مەسرەڤ شێتئاسایانە، هەموو بوارەکانی ژیانی هاوچەرخی خستۆتە چنگی خۆیەوە و تایبەت نین بە بزوتنەوەیەکی تایبەتی.

یەکەم جار کە پێشگری "پاش" (*Post*) بە مانایەکی پۆزەتیڤ بەکارهێنرا بە هۆی لزلی فیدلەر لەساڵی 1965دا بوو کە وەك وتەیەکی سیحراوی و ئەفسوناوی بەکاریدەهێنا و دەیبەستەوە بەو رووداوە رادیکالانەی کە بە دژی کلتور دەژمێرێن: پاش ئۆمانیستی، پاش نێرینە، پاش سپی-، پاش قارەمان- پاش یەهود. ئەم رووداوە ئەنارشیستی و داهێنەرانە بە مەبەستی جیابوونەوە لە رووداوە ئەرسۆزکسیەکان، ئەم هێرشە تواندانە بۆ سەر دەستەبژێرخوازی مارکسیزمی، ئەکادمیزم و سەرکوتی پیوریتانی، لە راستیدا وەك ئەندریاس هۆیسن لە 1984دا پیشانیدا، بە ئاشکراکەری یەکەم بزوتنەوە وروژێنەرەکانی پۆستمۆدێرن دەژمێرێن. پێدەچێ فیدلەر و ئەوانی دی لە ساڵی 1960دا هەرگیز بە نیازی ئەوە نەبوون ئەم باسانە بەمشێوەیە بکەن و ئەم نەریتە لەمجۆرە قاڵبەدا چەمکرێژی بکەن. بەدیهاتنی ئەم مەسەلەیە پێویستی بە کات بوو وە تا ساڵەکانی دەیەی 1970 و دەرکەوتنی نوسین و بەرهەمەکانی ئیهاب حەسەن دەبوو رابوەستین، واتە کاتێك کە ئەو بزوتنەوە رادیکالانەی سەردەمێك فیدلەر لە دەیەی 1960دا ستایشی کردبوو، کۆن بێت و مردنیان راگەیەنرا بێت.

ئیهاب حەسەن لە ناوەڕاستەکانی دەیەی 1970دا خۆی بە قسەکەری پۆستمۆدێرن راگەیاند. ئیهاب ئەم ناونیشانەی بەستەوە بە بۆچوون و بیروڕای ئەزمونگەری لە هونەر و فراتکنۆلۆژی لە بیناسازیدا: ویلیلم باروز و باکمینستەر فولەر، ئەنارشیزم، کۆنبوون/ بێدەنگی.. داماڵینی داهێنان/ تەفکیکیەت.." و بەیەك وشە روداوگەلێك کە من و کەسانی دی دواتر بە خەسڵەتەکانی "مۆدێرنەی دوایی"مان ناونا. لە ئەدەبیات و پاشتر لە فەلسەفەدا دوا بە دوای دەرکەوتن و نوسینەکانی لیوتار و ئارەزوو بۆ جێگرتنەوەی پۆستمۆدێرن لەبری بونیاشکێنی، ئەم زاراوەیە بەگشتی پەیوەندی نزیکی خۆی بەو شتەوە کە ئیهاب حەسەن ناوینا "نا بەردەوامی، دیارینەکردن، دەروون خودی، دەرون بونی" پاراست. کتێبەکەیش مارك. س. تایلۆر بە ناونیشانی سەرسوڕهێنەری "هەڵسەنگاندنی نادروست، یەك پۆستمۆدێرن/ یەك ئیلاهیات" بە بەرهەمە دیارەکانی ئەم ژانرە دەژمێرێت کە ئیلهامی لە بیروڕاکانی دێریدا و بونیادشێکنیەوە وەرگرتووە.

هەروەها ئاراستەیەك لە فەلسەفەدا هەیە کە هەموو بیریارانی پۆست پۆزەتڤیزم بە پۆستمۆدێرن دادەنێت، ئەگەر چی تەنها خاڵی هاوبەشیان بریتی بێت لە نەفیکردنی پۆزەتڤیزمی لۆژیکی مۆدێرن. بەمشێوەیە دوو مانای تەواو جیاواز بۆ ئەم وشەیە و تێکەڵکردنێکی گشتی هەیە کە تەنها تایبەت نییە بە خەڵکی ئاسایی. ئەم رووداوانە و هەروەها پێشزەمینەکانی کۆنفرانسە جۆراو جۆرەکانی ئەم دواییە لە بارەی ئەم بابەتەوە، بووە هۆی نوسینی ئەم وتارە بچوکەی "پۆستمۆدێرنیزم چییە؟". ئەمە پرسیار و لە هەمانکاتدا وەڵامێکە کە من پێشکەشیدەکەم. لە ئەنجامی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی قوڵتر کە دەکرێت سەرنج لەوە بدەین گەشەکردن و پەرەسەندنی بەردەوام و جوڵەی هەمیشەیی ئەم دیاردەی خۆ بە خۆ ئەوە دەسەلمێنێ کە پێشکەشکردنی وەڵامێکی بڕاوە و روون بۆ ئەم پرسیارە نییە, لایەنیکەم تا ئەو کاتەی کە پەرەسەندن و گەشەکردنی رانەوەستا بێت، ئەم کارە عەمەلی و مومکین نییە.

کلتوری پۆستمۆدێرن لە سەرەتای منداڵی خۆیدا لە ساڵەکانی دەیەی 1960دا بەراوردێکی

رادیکـــال و رەخنەگرانـــە دەژمێـــرا، هەڵوێســـتێکی کەمایەتی بوو کە بۆ نمونە لەلایەن هونەرمەندانی پۆپ و تیورەی پۆپ دژی دیدگای کورتکەرانەوەی هونـەری مـۆدێرن و سـتاتیکای بالأدەسـت بەسـەر دەزگاگـەلێکی وەك مـۆزەی هونـەرە مۆدێرنەکانـدا وەرگیرا. لـە بیناسـازیدا تیپـی تـێن، جـین یـاکۆبز، رابـرت و نتـۆری و.. هێرشـەکانی خۆیـان دژی بیناسـازی مـۆدێرنی ئۆرسـێزێکس لەبـەر دەسـتەبژێریەکەی، و لـە نـاوبردنی شـارەکان و بیرۆکراسیەکەی و زمانە سادەکەی، دەستپێکرد. بە دەسـتپێکردنی دەیـەکانی 1970 هاوکـات لەگـەڵ گەشـەکردن و پەرەسـەندنی ئـەم نەریتانـە و بەهێزبوونیان و رودانی گۆڕان تیایاندا، و داهێنانی وشەی پۆستمۆدێرنیزم وەك دەربڕینێك بۆ ناونان لە چەندان رووداو، هێـواش هێـواش ئـەم بزوتنەوەیـە رەهەنـدە رادیکـال و رەخنەگرانەکـەی سـەردەمی منـاڵی خـۆی لـە دەسـتدا و بـەرەو پارێزگـاری زیـاتر رۆیشت و لە ئەنجامدا بوو بە رووداوێکی عەقڵانی و ئەکادیمی. زۆرێك لـە لایـەنگرانی دەیـەکانی 1960 وەك ئەنـدی وارهـۆڵ بـە راکێشـان بـەرەو بـازاڕی هونـەری و روکردنـە کـاری پروپاگەنـدە و پـڕ دەرامەت، پەیامی رەخنەگرانەی خۆیان لـە دەسـتدا. دواجار پۆستمۆدێرنیزم لە کار و پیشـەی جیـاواز و ناوەنـدی زانسـتی و ئـەکادیمی و هـەروەها لـە ئاسـتێکی بـەربلاوتر لـە کـۆی کۆمـەڵگادا، قبـوڵکرا، وەك باوکی خۆی واتـە مۆدێرنیزم و بـرا رەقیبەکـەی واتـە مۆدێرنیزمی دوایـی، بـوو بـە بەشـێك لـە دەزگا بالأدەسـتە هـەبووەکان، لـە رەخنـەی ئەدەبیشـدا لـە رووی ماناییەوە لە مانای خۆی لە نەریتە بیناسازی و هونەریەکان نزیکتر بۆوە.

جان بـارت و ئیمبرتـۆ ئیکـۆ لـە پـاڵ نوسـەرانی تردا، پۆستمۆدێنیزم بە جۆرێك نوسین دەزانن کە بۆ باسـکردنی ناوەڕۆکـە هەمیشـەیی و سـەقامگیرەکان، سود لە شێوەکانی نەریت بە شێوەیەکی تـەنز ئامێز و خـوازەیی یـان بـە شـێوەی جیـاواز وەردەگـرێ. ئەمجۆرە نوسینە هاوکات لەگەڵ جەختکردن لەسـەر مـۆدێرنیزم - گـۆڕانکاریـەك لـە جیهانبینیـدا کـە بـە هـۆی نیتچـە ئەنیشـتاین، فرۆیـد و کەسـانی دیـەوە ئەنجامدرا- بە هـەمان شـێوە کـە جـان بـارت دەڵێـت هیوادارە کە لە هۆکار و گوێگرانی سنوردارەکان کـە بـە خەسـڵەتی رۆمانـە مۆدێرنیسـتەکان دەژمێرێـت، زیاتر بڕوات:

"نوسـەری پۆستمۆدێرنیستی ئایدیال و جێی مەبەسـتی مـن، باوکـانی مۆدێرنیسـتی سـەدەی بیسـتەم یـان بـاوانی پێشمۆدێرنیسـتی سـەدەی نۆزدەهـەمی خۆیـان نـە بەشـێوەیەکی دروسـت نەفیدەکـەن و نـە بەشـێوەیەکی دروسـت لاسـاییان دەکەنـەوە. نوسـەری پۆسـتمۆدێرن، نیـوەی یەکـەمی سـەدەی ئێمـەی لـە ژێـر پێدایـە، نـەك لـە پشـتی خۆیـەوە. نوسـەری پۆسـتمۆدێرن بـێ خـزان بـەرەو دامـێنی سـاوێلکەی ئـەخلاقی یـان هونـەری، یـان کەوتنـە نـاو داوی نوسـەری پڕوپوچـەوە، یـان بوونـە کۆیلـەی پارەپەرسـتن و بـەرتیل وەرگـرتن بـەو شێوەیەی لـە شـەقامی مۆدێرنیزمـەکراودا بـاوە، یـان توشی سادەگی و خاوی درۆزنانە یـان واقیعیبـوون، خوازیـاری چـیرۆکێکە کـە چـەندانجار زیـاتر لـە بەرهەمە سـەر سوڕهێنەرە مۆدێرنیسـتەکانی دوایـی (دیارە بە پێیهەڵسەنگاندنی من) وەك "چیرۆکگەل و دەقگەلێك بۆ هیچ"ی ساموئیل بیکیت، یـان "ئاگری کـەمڕەنگ"ی نابـاکۆف، خـاوەن هێـزی راکێشـانی دیموکراتیانە بێت.

ئـەو نـاتوانێ هیـوادار بێـت بگـات بـە پێـی موریدانی شەیدای جیمز جویز و ئیرۆینگ ڤالاس و پـێ بەپێی ئەوان بجوڵێت - پێویست ناکات باسی

خەڵکە رەشورووتە نەخوێندەوارەکە بکەین کە دەزگاکانی راگەیاندن مێشکیانی شتۆتەوە. بەلاّم ئەو دەبێت هیوادار و خۆشحاڵ بێت کە بە بەرزتر لە موریدانی پسپۆری هونەری بالاّ و پێشکەوتوو.. رۆمانی داواکراو و ئایدیالی پۆستمۆدێرنیستی بە جۆرێك سەروتر لە ململانێی نێوان ریالیزم و دژی ریالیزم، فۆرمالیزم و ناوەرۆکخوازی، ئەدەبیاتی روت و ئەدەبیاتی بەر پرسیار، چیرۆکەکانی ناوەندە ئەدەبییەکان و چیرۆکە پروپوچەکان.. سەردەردێنێ. وێنەی جێی مەبەستی من جازی باش یان مۆسیقای کلاسیکیە: فەرد لە ئەنجامی گوێگرتنی لە داوی یەك و بەردەوام، یان بە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی وردی پارچەیەکی مۆسیقا سەرنجی بۆ چەندان شتی زیادە دەچێت کە جاری یەکەم سەرنجی لێیان نەداوە، بەلاّم جاری یەکەم دەتوانێت ئەوەندە هەڵخەڵەتێنەر بێت و تاکە کەس - نەك هەر تەنیا پسپۆرەکان - ئەوەندە هەستیار دەکات کە تاکە کەس لە دووبارەکردنەوەی توشی سۆزێکی زۆر دەبێت".

ئەم هەوڵدان و گەرانە بۆ دۆزینەوەی گوێگرانی بەربلاّوتر لە مەسیحە سەرتاییەکان، بیناسازان و هونەرمەندانی پۆستمۆدێرنزمی دەکاتە هاوتای مۆدێرنە دواییەکان و لە دڵەراوکێ سیحراوی و شەیداکەرانەی کە ئیهاب حەسەن لە دەیەکانی 1970دا وەسفی کردبوو، جیادەکاتەوە. دیارە گەلێك ئامانجی دیاریکراو تایبەتی تر هەیە کە ئاراستەیەکی تایبەتی بە پۆستمۆدێرنیزم دەدەن.

بەلاّم لەو روەوە کە مانا و نەریتی پۆستمۆدێرنیزم بەردەوام لە گۆرانکاریدایە، لەبەرئەوە نەك هەر دەبێت ئەم چەمکە پێناسبکرێت، بەڵکو پێویستە مێژووە زەمەنی و بوارە شوێنیەکانی دیاری بکرێت. بۆ ئەم مەسەلەیە من پۆستمۆدێرنیزم بە جۆرێك دوا لیزمی ناکۆك یان رەمزدانانی دوالیزمی دەزانم کە لەناو یان ناونیشانی دوولایەنە و ناکۆکیدا شاراوەیە: بەردەوامی مۆدێرنە و بڵندبونەوە لێی. گونجاو لەگەڵ ئەم لۆژیکەدا "پۆستمۆدێرن"ی جێی سەرنجی حەسەن بە شێوەیەکی سەرەکی مۆدێرنی دواییە، واتە بەردەوامی مۆدێرنەیە لە شکڵە توندرەو و زیادەرەوەکەیدا. هەندێك لە نوسەرانی وەك بارس و ئیکو لەگەڵ ئەم پێناسەیەدا دەبن، وەك چۆن هەندێك نوسەر و رەخنەگری وەك حەسەن و لیوتار، قبوڵی ناکەن و رەدی دەکەنەوە. لەم جۆرە رێکەوتن و رێنەکەوتنان، تێگەیشتن و لێکتێنەگەیشتنانەدا جۆرێك دیالەکتیکی مارئاسا هەیە کە بزوتنەوەی ناوبراو بەردەوام پیشانیداوە، جێگەی گومانە بەر لە کۆتایی ئەم بزوتنەوەیە پێچ و پەنای گەلێك زۆر لەم هەڵقەیەدا بدۆزینەوە. بەلاّم دەتوانین لەیەك شت دڵنیابین راگەیاندنی مردن، تا ئەو کاتەی مۆدێرنیزمەکانی تر لەناو نەچوون، هەنگاوێکی پەلە و خێرایە.

## سەرچاوە

پست مدرنیته و پست مدرنیسم: ترجمه و تدوین: حسینعلی نوژری، تهران - نقش جهان 1379 - ص 98.

# پۆستمۆدێرنیزم
# ڕێکخستنەوەی شتەکانی ناو گەردون

فەیاز چاگانی
لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

لەم دواییانەدا، هەمووان باسی پۆستمۆدێرنیزم دەکەن. زۆرێك لەوانەی بانگەشەی بۆ دەکەن، دەڵێن پۆستمۆدێرنیزم هێزێکی ئازادکەرە لەناو ئەکادیمیادا. ئەمان پێشبینی دەکەن پۆستمۆدێرنیزم قوتارمان بکات لە عەقلانییەت و لۆجیکگەرایی و ئەوروپاگەرایی و هەر شتێکی تر کە پێش ئەو هاتبێت. وەلێ دنیایەك نەیاریشی هەیە. دژەکانی وەك کۆرپەیەکی لاساری نەریتی هزریی ئەوروپا بۆی دەڕوانن. پێیان وایە وێرانکەرە، ڕێژەییە، نیهلیستییە، لە هەمووشی خراپتر مۆدەیەکەو بەسەر دەچێت. مەبەستی من لێرەدا ئەوەیە پوختەیەکی کورت و بێلایەنانەی پۆستمۆدێرنیزم بخەمە ڕوو. وەلێ دەستبۆبردنەکەم لە بەشێکیدا هاوسۆزانەیە، چونکە من لەگەڵ زۆرێك لە مشتومڕەکانی پۆستمۆدێرنەدام، هەروەها چونکە پێشموایە کە گەلێك لە نەیارەکانی پەلەیان کردووە لە تووڕدانیدا.

**کەواتە، پۆستمۆدێرنیزم چییە؟**

یانی، ئەمە پرسیارێکی هەتا بڵێیت قورس و گرانە. چونکە لە زۆر ڕووەوە زاراوەی پۆستمۆدێرنیزم خۆی زاراوەیەکی نادروستە. زۆرێك لەو بیرمەندانەی مۆرکی پۆستمۆدێرنەیان پێوە لکێنراوە، ڕەتیان کردۆتەوە کە وابن. تەنانەت لە نێوانی ئەوانەشدا کە پەسەندیان کردووە ناکۆکی و ناتەباییەکی زۆر هەیە. بۆیە، پێموایە لانیکەم دوو ڕێگا هەیە بۆ نزیکبوونەوە لە پرسیاری ئەوەی پۆستمۆدێرنیزم چیە؟ یەکەمیان ڕێگایەکی زۆر ئەنتی پۆستمۆدێرنیزمانەیە و بەشوێنی پەرەسەندنی مێژووییانەی چەمکەکەدا عەوداڵە. ئەوەی تریان بریتیە لە گەڕان بۆ تاڵە داوێکی فەلسەفییانە (یان دژە فەلسەفییانە)، لە نێوانی ئەو بیریارانەدا کە بە پۆستمۆدێرن ناسراون. من هەوڵ دەدەم هەردوو ڕێگاکە بگرمە بەر.

## جینیالۆجیای پۆستمۆدێرنیزم

لەبەر ئەوەی زۆرێک لە بیریارە پۆستمۆدێرنەکان فەرەنسین، بۆیە هەندێك بەشوێن رەگ و ریشەی ئەم چەمکەدا لە رووداوی وەك شەڕی سەربەخۆیی جەزائیر[1] یان ناڕەزاییەکانی خوێندکاران لە مایسی 1968 دا لە پاریس کە بووە هۆی سووکە شۆڕشێك لە سەراپای وڵاتەکەدا. گەرچی ئەم رووداوانە لای هەندێك لە پۆستمۆدێرنەکان گرنگن، بەڵام من پێموایە ئەمە بەناو یەکداچوون و ئاڵۆسکانێکی زۆری لەگەڵ مۆدێرنەدا هەیە (هەروەها تاوانبارکردنی هزر، عەقڵانییەت، زانستگەرایی، بابەتێتی و پێشکەوتن) کە رەگ و ریشەیان لە مێژووی خۆراواییدا بۆ زۆر زووتر دەگەڕێتەوەو لەگەڵ کارەکانی فردریك نیچەدا[2] سەرهەڵدەدەن.

لە بری دەمەتەقێکردن لەمەڕ کارەکانی نیچە کە هەم سەختیشەو هەم کاتیش دەکوژێت، بڕیارم دا بڕگەیەك لە "زەردەشت ئاوای گوت" بخوازمەوە کە پێموایە بەرامەی ئەنتی مۆدێرنەی لێ هەڵدەستێت:

" تۆی داناترین پیاو، ئەوەی هەراسانت دەکات و دەتهێنێتە جۆش، ناوی نانێیت "ئیرادەی حەقیقەت"؟ ئیرادەی شیاوێتی هەموو بوون: ئەمەیە کە من ناوی دەنێم ئیرادەی تۆ! تۆ یەکەم شت دەتەوێت هەموو بوون وا لێبکەیت شیاو بێت: بۆیە، بە بەدگومانییەکی تەندروستانەوە، گومانت هەیە لەوەی ئایا دەشێت لە راستیدا شیاو بێت. بەڵام پێویستە ئەو خۆی بچەمێنێتەوەو لەگەڵ تۆدا رابێت! ئەمەیە ئەو ئیرادەیەی تۆ هەتە. پێویستە ساز ببێت و ببێت بە بابەتی هزر وەك ئاوێنەو پەرچکەرەوەی هزر. ئەمەیە هەموو ئیرادەی تۆ، تۆی داناترین پیاو، ئەمە ئیرادەی هێزە، ئەمەش زۆر جار دووبارە دەبێتەوە کە باسی چاك و خراپ دەکەیت، هەروەها باسی هەڵسەنگاندنی بەهاکان دەکەیت. تۆ دەتەوێت ئەو جیهانە بخوڵقێنیت کە دەتوانیت لەبەردەمیدا بەچۆکدا بێیت: ئەمەیە ئەوپەڕی هیوا سەرمەستی تۆ".

دووهەمین تاکی گرنگ لەم زریزە بێسەرەوبەرەیەی جینیالۆجیای پۆستمۆدێرنیزمدا مارتن هایدگەرە[3]. کاری ئەو بریتیە لە تەواوکردنی هێرشەکەی نیچە بۆ سەر دڵنیایی مۆدێرنیزم[4]: "تەنها ئەو کاتە بیرکردنەوە دەستپێدەکات کە دەگەینە ئەوەی بزانین ئەو عەقڵەی بۆ ماوەی چەند سەدەیەك شکۆداریی بەدەستهێناوە، هەر خۆی سەرسەختترین نەیاری بیرکردنەوە بووە".

پاشان نۆرەی میشیل فۆکۆ[5] دێت. دیسانەوە بڕگەیەکی خەماویی لێ دەخوازمەوەو گفتوگۆی درێژ لەسەر کارەکەی ناکەم: "پێویستە ببینین سروتەکانمان بۆ چین: بە تەواویی شتی بێسەرەو بەرەن، ماندوو لە گەمەو بزێویی و سەرسوڕمان، پیس و پۆخڵ و ردێنهاتوو، کوڕ بێت درێژی هەبێت بۆ ئەوەی لە کچ بچێت (پێچەوانەکەشی بە پێچەوانەوە). پێویستە بڕگەی "لە نمایشکردندا" لە خۆدەرخستندا، لە پێچەوانەکردنەوەی ئەو سیستمانەدا کە بە بێدەنگی بەڕیوەمان دەبەن. ئەوەندەی من بەلامەوە گرنگ بێت، ئەمە ئەوەیە کە هەوڵ دەدەم لە کاری خۆمدا بیکەم".

رەنگە کەسی دواتر بەرەنجامی بەرجەستەبوونی پۆستمۆدێرنە بێت. ئەویش جاك دێریدایە[6]. زۆربەی نوسینەکانی زۆر بە ناڕەحەتی دەخوێندرێنەوەو بە مەبەستیش وا گرانی کردوون. چونکە مەبەستی ئەو بریتیە لە خستنەرووی دینامیزم و گەمەی لەبن نەهاتووەی مانا لە زماندا.

خۆشبەختانە ئەم برگەیەی خوارەوە تا رادەیەك ئاسانترە:

"میتافیزیا –میتۆلۆجیای سپی کە رەنگدانەوەی کەلتوری خۆراوایەو بیناشی دەکاتەوە: پیاوە سپییەکە میتۆلۆجیاکەی خۆی هەڵدەگرێت, میتۆلۆجیای هیندۆ ئەورووپی, دروشمەکانی خۆی, کە بریتین لە ئەفسانەی ئیدۆمی خۆی, لەو شتەوە کە هێشتاش هەر پێی خۆشە ناوی بنێت عەقڵ, بەرەو گەردونی دەبات".

دێریدا پێشی وتراوە پۆستبونیادگەرا. گەرچی هەندێك پۆستمۆدێرنیزم و پۆستبونیادگەرایی بە هاومانا دادەنێن, بەلام من پێموایە یەك جیاوازیی حاشاهەڵنەگر لە نێوانیاندا هەیە. پۆستمۆدێرنیزم بریتیە لە کاردانەوە دژی عەقلانییەت, زانستگەرایی, بابەتگەرایی مۆدێرنیزم. لە لایەکی تریشەوە پۆستمۆدێرنیزم بریتیە لەکاردانەوە دژی بونیادگەرایی کە بانگەشەی ئەوە دەکات کە چەند بونیادێکی گەردونی بۆ زمان هەیەو ئەو بونیادانە خۆیان فاکتەری کۆتایی ژیان و بیرکردنەوەن. لای دێریدا, ئەم دوو جولانەوەیە دەگەنە ئەوەی نکولی لە بەشێکی زۆری ترادیسیۆنی هزریی خۆراوا بکەن.

لە بۆچوونی مندا, ئەم "چوار پەیامبەرەی ئەوپەڕگری" بە بەکارهێنانی دەستەواژەکەی ئالان مێگیل, سەرکردایەتی هێرشی سەر مۆدێرنیزمیان کردووەو سروشبەخشی گەلێك لە پۆستمۆدێرنیزمەکانی ئێستان. رەنگە ئەم جینیالۆجیایە مانایەکی پێبەخشیبین دەربارەی رەگ و ریشەی پۆستمۆدێرنیزم, بەلام دەربارەی پۆستمۆدێرنیزم خۆی شتێکی ئەوتۆمان پێ ناڵێت. بۆ ئەمە دەبێت بڕوانینە ئەو داوەی کاری پۆستمۆدێرنەکان پێکەوە گرێ دەدات.

### داوی نێوانیان

لە بۆچوونی مندا, تاڵە داوی هاوبەش لە نێوانی ئەوانەدا کە بەشێوەیەکی هەڕەمەیی مۆرکی پۆستمۆدێرنیزمیان پێوە لکێنراوە, لە نیچەوە تا دەگاتە دێریداو پۆستمۆدێرنەکانی ئێستاش دەگرێتەوە وەك جان بۆدریلار[7], جان فرانسوا لیوتار[8], گاڤاتری سپیڤاك[9] و جولیا کریستیڤا[10], بریتیە لە دژایەتیکردنێکی زۆر رادیکالانەی جەوهەرگەرایی یان ریشەگەرایی. مەبەستم لەمە ئەوەیە ئەوان نکوڵی لە جەوهەر, سروشت و هەروەها شتە بنەڕەتییەکانی دیکە دەکەن کە مانایەکی دیار و بەردەوام دەبەخشن بە بوون. بۆیە لە گۆشەنیگای پۆستمودرێنیزمەوە هیچ شتێکی بالا, ژوورمێژوویی یان ژوور کەلتوریی نیە بۆ لێکدانەوە.

نەیاریی پۆستمۆدێرنیزم لەگەڵ جەوهەرگەراییدا دەیانبات بۆ رەخنەگرتن لە چەمکەکان و سڕینەوەی ئەو جیاکارییانەی مۆدێرنیستەکان پێیان خۆشحاڵن.

یەکەمین چەمك کە دوابەدوای دژایەتیکردنی جەوهەرگەرایی دێت بریتیە لە ئایدیای سروشتی مرۆڤ, یاخود ئەوەی هەندێك لە پۆستمۆدێرنیزمەکان دەیگەڕێننەوە بۆ بابەتێکی بالا. بۆ نمونە, لە رەوتی مێژوودا, ئێمە گریمانە دەکەین کە مرۆڤەکان لە هەندێك رووەوە هەمان ئەوەن کە لە رابردووشدا هەبوون. هەروەها خەڵکی ناو کەلتورە جیاجیاکان هاوشێوەی خەڵکی ناو کەلتورەکەی ئێمەن. ئەم گریمانەیە رێگەمان پێدەدات کە بە باوەڕێکی وەهاوە لە مێژوو بکۆڵینەوە کە بانگەشەکانمان دەربارەی پاڵنەرەکان و کردەوەکانی خەڵك لە رابردوودا دروست بوون.

لەگەڵ ئەوەشدا، پۆستمۆدێرنیزم ئارگیومێنت لەسەر ئەوە دەکات کە هیچ شتێك لە ئارادا نیە کە بە زەرورەت جەوهەریی بێت دەربارەی مرۆڤ. گریمانەکردنی ئەمە ئەویترێتییە، لە جیاوازبوون و تاقانەیی تاکەکانە. بە نیسبەتی پۆستمۆدێرنیزمەوە، دەبێت جیهان بەشێوەیەکی زۆر رادیکاڵانە فرەچەشن و جیاجیا بێت، رابردوو زۆر رادیکاڵانە لە ئێستا جیاواز بێت، هەموو کەلتورەکانیش زۆر لە یەکتریی جیاوازن.

پاشان، پۆستمۆدێرنیزم جیاکاریی نێوانی راستی و ئەندێشە رەشدەکاتەوە، لای ئەوان هیچ پەیوەندییەکی گرنگ لە نێوانی وشەکان و شتەکاندا نیە، نیشانەو نیشانە بۆکراو، بابەت و بکەر. ئەم گوتارە کە رادەگەیەنێت ئەو وەسفی واقیعی پێیە، نەك کۆپییە باش و خراپەکان. ئەمەیە بناغەی ئەو بانگەشەیەی خوارەوەی میشیل فۆکۆ: "من باش دەزانم کە من هەرگیز هیچم نەنوسیوە، خەیاڵ نەبێت. من مەبەستم لەوە نیە ئەوەندە دوور برۆم کە بڵێم ئەندێشە لە پشتی حەقیقەتەوەیە. من وای دەبینم کە دەشێت وا لە ئەندێشە بکەین لەناو حەقیقەتدا کاربکات".

پێموایە، کاتیگۆرییەکی بنەڕەتی لە مێژوودا بریتیە لە چەمکی روداو. کە دەشێت کە بەشێوەیەکی تایبەتی بچێتەوە بۆ سەر دەرکەوتنی مێژوویی. هەرچۆنێك بێت پۆستمۆدێرنیزم ئارگیومێنت دەکات کە بەکارهێنانی زاراوەی رووداو دەبێتە هۆی ئەوەی ناوازەیی رووداوە راستەقینەکان دابەزێنێت بۆ ئاستێکی گشتی. مادام هیچ شتێکی بنەڕەتیش دەربارەی ئەو روداوانە نیە کە پێکیانەوە ببەستێنەوە، بۆیە بیرۆکەی روداوە چەمکێکی بێ بایەخە. فۆکۆ دەگەڕێتەوە بۆ چەمکی روداو و بە وەهم دایدەنێت، کە باڵی بەسەر تێکەڵەیەکی ناسازی دەرکەوتنەکاندا کێشاوە، ئەمە مانای رووداوە کە لەگەڵ هیچ شتێکی روداوی راستەقینەدا یەك ناگرێتەوە.

گەلێك چەمکی تریش هەن کە لە سایەی شیکردنەوە دژە جەوهەرییەکانی پۆستمۆدێرنیزمدا دەتوێنەوە. هەرچۆنێك بێت مەسەلەکە ئەوەیە کە پۆستمۆدێرنیزم گومانگەرایە لە جەوهەر.

### دەرەنجام

زۆرکەس نارەواییان دەربڕیوە لەوەی پۆستمۆدێرنیزم دەخزێتە ناو نیهلیزمەوە — هەموو بانگەشە فەلسەفییەکان (مێژووییەکانیش) وا لێدەکات بەرلەوەی دەربڕدرێن، بێمانا بن. هەندێکی تر سکاڵا دەکەن لەوەی پۆستمۆدێرنیزم بنەما ئەپستمۆلۆژی و ئێتیکییەکان لەناو دەبات. بەڵام بە بۆچوونی من، ئەم رەخنانە دوورن لە راستییەوە. ئەوەندەی من بزانم، پۆستمۆدێرنیزم نایەوێت بڵێت مەسەلە ئەپستمۆلۆژی و ئێتیکییەکان بیبەهان یان هەڵەن. پۆستمۆدێرنەکان دەڵێت چیتر پێویستیمان بە بناغەو هەڵبژاردنی هەڵوێستێك بەسەر یەکێکی تردا نەماوە، ئازادییمان بۆ دەهێڵێتەوە تا خۆمان هەڵوێستەکانی خۆمان دیاری بکەین. وەلیّ رەنگە قورسایی ئازادی شتێك بێت کە هەر هەموومان حەزنەکەین بچینە ژێری.

### حەزدەکەم لە فۆکۆوە کۆتایی پێی بهێنم:

" ئەو جوڵەیەی کە بەهۆیەوە، (نەك بێئەرك و دردۆنگانە و خەون و وەهم) خۆی جیادەکاتەوە لەوەی کە پەسەندەو دروستە، تا بەدوای رێسای دیکەدا بگەڕێت — فەلسەفەیە. وەلانان و وەرچەرخاندنی چوارچێوەکانی بیرکردنەوە، گۆڕینی ئەو بەهایانەی بۆمان هاتوون لەگەڵ هەموو

ئەوکارەدا کەکراوە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی تر بیربکەینەوە, تا شتێکی تر بکەین , بۆ ئەوەی ببین بە شتێکی تری جیا لەوەی هەین –ئەمەش دیسان فەلسەفەیە.. ئەوە شتێکی هەرسکراوە کە پێویستە خەڵێکێك هەبێت شیوەن بۆ ئەم بۆشاییەی ئێستا بکات و لەبری ئەمە سۆزی بجوڵێت بۆ جیهانی ئایدیاکان, دوای ئەوەی کەمێك شاهایەتییان بەسەرەوە کردین. بەڵام ئەوانەی بۆ یەك جار لە ژیانیاندا تۆنێکی نوێیان دۆزیوەتەوە, ڕێگایەکی تازەی تێڕوانین, ڕێگایەکی نوێی کردن, ئەو کەسانە, بە بڕوای من, هەرگیز هەست ناکەن بە پێویستییان بە شیوەنکردن بێت لەوەی جیهان هەڵەیە, لەوەی مێژوو پڕکراوە لەو خەڵکانەی کە هیچ دەرەنجامێکیان نیە, ئەمە کاتی ئەوانیترە تا بێدەنگ بن بۆ ئەوەی دواهەمین دەنگی ناڕەزایی بەرامبەریان ببیستریت".

## پەراوێزەکانی وەرگێڕ

1. شەڕی سەربەخۆیی جەزائیر *Algerian War of Independence* خەباتێکی چەکدارانەی جەزائیرییەکانە دژی فەرەنسا, ماوەی هەشت ساڵی خایاندووە 1954–1962, سەرەنجامەکەی بە سەربەخۆبوونی جەزائیر لە فەرمانڕەوایی کۆلۆنیاڵیزمی فەرەنسی کۆتایی هات لە تەموزی 1962 دا. شەڕی جەزائیر درێژترین جەنگێکە رووبەڕووی دەسەڵاتێکی ئەوروپایی بووبێتەوە. لە گەرمەی شەڕەکەدا کار گەیشتە رادەیەك کە فەرەنسا خۆشی کەوتە مەترسییەوە. خەباتگێڕە جەزائیرییەکان هەردوو شێوازی شەڕی گۆریلایی شار و گوندیشیان بەکاردەهێناو بەرەی رۆگاریی نیشتمانی رابەرایەتی دەکردن.

2. **نیچە, فریدریش** *Nietzsche, Friedrich Wilhelm (1844-1900)* فەیلەسوفێکی ئەڵمانییە, شاعیر و فیلۆلۆجیستێکی کلاسیکە, یەکێکە لە کاریگەرترین بیریارانی سەدەی نۆزدە. لە ناوچەی ڕۆوکێنی پروسیا لە دایك بووە, باوکی قەشەیەکی لۆسەریی بووە هەر لە منداڵیی نیچەدا مردووە, دایکی لە کەش و هەوایەکی ژنانەی ئاینییدا پەروەردەی کردووە, کە دایکی و نەنکی و دوو پوری و خوشکێکی دەگرێتەوە. لە هەردوو زانکۆی بۆن و لایپزین فیلۆلۆجیای کلاسیکی خوێندووەو لە تەمەنی 24 ساڵیدا بە پرۆفیسۆری فیلۆلۆجی لە زانکۆی باسێل دامەزراوە. تەندروستیی خراپ (هەموو ژیانی سەری ئێشاوەو چاوی باش نەیبینیوە) ناچاری کردووە لە ساڵی 1879 دا خۆی خانەنشین بکات. ساڵی دواتر باری عەقڵیی تێکچووەو هەرگیز چاك نەبۆتەوە. لە ساڵی 1900 دا لە ڤایمار مردووە. لەپاڵ کاریگەریی فەلسەفەی یۆنانی دێریندا, بە تایبەتی ئەفلاتون و ئەرەستۆ, لەژێر کاریگەریی فەیلەسوفی ئەڵمانی شۆپینهاوەر و تیوریی پەرەسەندندا بووەو هاوڕێیەتییکی بەتینی لەگەڵ ریچارد ڤاگنەری مۆزیکزاندا هەبووە. یەکەمین کتێبی بریتیە لە "لەدایکبوونی تراجیدیا ـ 1872. ساڵانی 1880 کان ماوەی بەپیتی ئەو بووە. لەو ماوەیەدا کتێبی زەردەشت وای وت دەنوسێت (بەشی یەکەم و دووەم و سێیەم لە ساڵی 1883–1884, بەشی چوارەم 1885), پاشان ئەودیوی چاکەو خراپە ـ 1886, جینیالۆجیای ئاکار ـ 1887, دژە مەسیح ـ 1888, مرۆڤ و سێبەرەکەی (ساڵی 1888 تەواو کراو ساڵی 1908 چاپکرا). دوایین کاری "ئیرادەی هێز" دوای مردنی لە ساڵی 1901 دا چاپکراوە.

3. هایدگەر, مارتن *Heidegger, Martin (1889-1976)* فەیلەسوفێکی ئەڵمانییە, رابەری فینۆمینۆلۆجیای بوونگەراییە, بە یەکێك لە هەرە کاریگەرترین فەیلەسوفەکانی سەدەی بیستەم لەقەڵەم دەدرێت. لە مێسکیرخی بادن لەدایك بووە, سەرەتا تیۆلۆجیای رۆمان

کاسۆلیکی خوێندووەو پاشان لە زانکۆی فرایبورگ فەلسەفەی خوێندووە، لەوێ بوو بە یاریدەدەری ئەندموند هۆسرێلی دامەزرێنەری فینۆمینۆلۆجیا. لە ساڵی 1915 بە دواوە دەستی کردووە بە وانە وتنەوە لە زانکۆی فرایبورگ. لە ماوەی نێوان ساڵانی 1923-1928 یشدا لە زانکۆی ماربورگ وانەی وتۆتەوەو پاشان گەڕاوەتەوە بۆ فرایبورگ و پۆستەکەی هۆسرێلی وەرگرتووە. لە ساڵی 1945 دا چالاکی لێ قەدەغەکراوە، چونکە لە ساڵی 1933-1934 دا پشتیوانی لە هیتلەر کردبوو، وەلێ هەتا ساڵی 1959 لە زانکۆ مایەوەو پاشان خانەنشین بوو. هایدگەریش وەك هۆسرێلی مامۆستای لەژێر کاریگەریی فەیلەسوفەکانی پێش سۆکرات و سورین کیرکگۆری دانیمارکی و نیچەی ئەڵمانیدا بووە. هایدگەر دەسبەرداری نەریتە فەلسەفییەکان بووەو لە نوسینەکانیدا پێڕەوی لە شێوازێکی تایبەتی خۆی کردووە، مانای تایبەتی خۆی دەبەخشی بە وشەکان و سەدان وشەی ئاڵۆز و ناڕەحەتیشی داهێناوە. دیارترین کاری هایدگەر بریتیە لە بوون و کات – 1927، لەم کتێبەیدا بایەخی داوە بە سەرەکیترین و جەوهەریترین پرسیاری فەلسەفی: هەبوون چیە؟ ئەمەش کێشی کرد بەرەو پرسیاری ئەوەی مرۆڤ خاوەنی چ جۆرە بوونێکە. هایدگەر دەڵێت مرۆڤ فڕێ دراوەتە ناو جیهانێکەوە کە خۆی دروستی نەکردووە، بەڵام کۆمەڵێك شتی تێدایە کە قابیلی بەکارهێنانن، وەك بابەتە کەلتوری سروشتییەکان. لەبەر ئەوەی ئەم بابەتانە لە رابردووەوە هاتوونەتە بەردەستی مرۆڤ و لەئێستاشدا بەکاردەهێنرێن بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی ئایندەیی. بۆیە هایدگەر پەیوەندییەکی بنەڕەتی لەنێوانی دروستکەرانی بابەتە هەبووەکان و مرۆڤایەتی و بونیادی کاتدا دەبینێتەوە. لە دوای ساڵی 1930 یەوە سەرقاڵی کتێبی "پێشەکییەك بۆ میتافیزیك" بوو، لە ساڵی 1953 دا بە چاپی گەیاند، لەو کتێبەدا سەرقاڵی لێکدانەوەی چەمککارییەکانی فەلسەفەی خۆراواییە لەمەڕ بوون، هەروەها کۆمەڵگای تەکنەلۆجیی مۆدێرنیش هەڵوێستێکی نیهلیستییانەی لە لا دروست کردووە، پێی وابوو مرۆڤایەتی مانا قووڵەکەی بوونی فەرامۆش کردووە، ئەوەی فەیلەسوفەکانی یۆنان بایەخیان پێداوە، چیتر مرۆڤایەتی توانای تێگەیشتنی چەمکی بوونی نەماوەو ئەمەش ناتەواوییەکە پێویستە چارەسەر بکرێت، دەنا کارەساتی گەورەی لێ دەکەوێتەوە. هایدگەر زۆر بە وردی سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی چەمکگەلی وەك کۆتابوونی مرۆڤ، مەرگ، هیچێتی، دروستی، بەجۆرێك گەلێك کەس لەپاڵ بوونگەراکاندا پۆلێنیان کردووە. هایدگەر کاریگەرییەکی زۆری لەسەر فەیلەسوفی بونگەرای فەرەنسی سارتەر هەبووە. دواتر هایدگەر ئەوەی رەتکردەوە کە کارەکانی پەیوەندییان بە بوونگەراییەوە هەبێت. هەزری هایدگەر کاریگەرییەکی زۆری لەسەر میشیل فۆکۆ و جاك دێریدای فەرەنسی و یورگین هابرمازی ئەڵمانی هەبووە. لە شەستەکانی سەدەی رابردوو بەدواوە کاریگەریی هایدگەر کیشوەری ئەوروپای بەزاندووەو بە سەراپای جیهاندا بڵاو بۆتەوە.

4. مۆدێرنیزم *Modernism* بریتییە لەهەوڵێك کە لەلایەنی گرووپێك لێکۆڵەر لە تیۆلۆجیاو فەلسەفەدا، بۆ سەرلەنوێ پێناساندنەوەی پێڕەوی مەسیحیی بەبیری زانستییانەی سەدەی نۆزدە. گەرچی هەموو هەوڵەکان بەسەریەکەوە لەیەك دانە سیستەم و یەك بواردا کۆناکرێنەوە، بەڵام لەساڵی 1907دا، لە لایەنی پاپا پیۆسی دەیەمەوە، ئەم ناوەی لێنرا. دواجار مۆدرێنیزم هەموو بوارەکانی تری بیرکردنەوەو ئەدەب و هونەرو بیناسازیی و نیگارکێشان و سیاسەت و هتدیشی گرتەوەو مانای نوێکردنەوەو بەهاوچەرخکردنی وەرگرت.

5. **فۆکۆ, میشیل** *Foucault, Michel (1926-1984)*
فەیلەسوفێکی فەرەنسیە, لە پۆیاتێ لەدایك بووە, لە پەیمانگای باڵای مامۆستایانی پاریس فەلسەفەو سایکۆلۆجیای خوێندووە. لە ماوەی 1960 ەکاندا مامۆستای فەلسەفە بووە لە زانکۆی کلێرمۆنت فیران و ڤانسان. لە ساڵی 1970 دا چۆتە کۆلیج دۆفرانس و بووە بە پرۆفیسۆری مێژووی سیستمەکانی هزر. ئیتر شۆرەتی پەیداکردووەو لە جیهاندا ناسراوە. فۆکۆ هەوڵیداوە دەری بخات کە ئەو ئایدیا بنەڕەتییانەی کە خەڵك بەشێوەیەکی گشتی بە راستەقینەی هەمیشەیی لەقەڵەمی دەدەن دەربارەی سروشتی مرۆڤ و کۆمەڵگا, لە رەوتی مێژوودا گۆڕانیان بەسەردا دێت. کارەکانی فۆکۆ ململانێیەکی راشکاوانەی هەریەکە لە کارل مارکسی فەیلەسوفی سیاسی و سیگمۆند فرۆیدی دەرونشیکاریست بوو. چەند چەمکێکی نوێی پیشکەشکردووە کە کێبڕکێی چەمکە باوەکان دەکەن لەمەڕ زیندان, پۆلیس, ئینشورانس, بایەخدان بە نەخۆشییە عەقڵییەکان, مافی هۆمۆکان, خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتی. فۆکۆ زۆر لە ژێر کاریگەری هایدگەر و نیچەدا بووە, دیارترینی کارەکانی بریتین لە شێتی و شارستانێتی – 1960, وشەکان و شتەکان – 1966, مێژووی سێکسانێتی لە سێ بەرگدا و دوا بەرگی پاش مردنی بڵاو کراوەتەوە.

6. **دێریدا, جاك** *Derrida, Jacques (1930-2004 ),*
فەیلەسوفێکی فەرەنسییە, قوتابخانەی هەڵوەشاندنەوەی *deconstruction,* دامەزراندووە, کە بریتییە لە ستراتیجێکی شیکردنەوە بەسەر ئەدەب, زمانەوانی, فەلسەفە, یاسا, بیناسازییدا, پیادە دەکرێت. لەساڵی 1967دا, دێریدا سێ کتێبی بڵاوکردەوە: ئاخاوتن و دیاردە, گراماتۆلۆجیا, لەگەڵ نوسین و جیاوازییدا.. کە تیایاندا باسی پێڕەوی هەڵوەشاندنەوەی دەکرد لەخوێندنەوەی تێکستەکاندا. دێریدا هەردەم دژی ئەوەبووە کە لە خانەیەکدا بپۆڵێنرێت, کارەکانی دواتری سەرلەنوێ بیری ئەویان پێناسە دەکردەوە.

7. **بۆدریلار, جان** *Baudrillard, Jean (1929- )*
بیریارێکی فەرەنسییە و لە خێزانێکی جوتیاردا هاتۆتە دونیاوە, یەکەمین کەسی خێزانەکەی خۆی بووە کە بایەخی دابێت بە فیکر, بۆ بەدەستهێنانی لیسانس خۆی ماندوو کرد, بەڵام سەرنەکەوت. دیارترین کتێبەکانی سیستمی شتەکان 1968. لە گۆڤارەکەی سارتەردا " کاتە نوێیەکان" زنجیرەیەك وتاری دەربارەی کالفینۆ بڵاو کردۆتەوە, هەندێك نوسینی پرۆستی وەرگێڕاوە, بڕوای بە بونیادگەریی نەبووە. لە ساڵی 1970دا کتێبی کۆمەڵگای سەرفکاری بڵاوکردەوە, هەروەها ئابوریی سیاسیی ئاماژەشی لە ساڵی 1972دا بڵاو کردۆتەوە.

8. **لیوتار, جان فرانسوا** *Jean Francios Lyotard* (1924 ــ ) فەیلەسوفێکی فەرەنسییە, دیارترین کتێبەکانی بریتین لە"گوتارو شکڵ ـ 1973", "ئابوریی شەبەقی ــ 1974", "داینەمۆکانی دۆشان ــ 1977", "داب و دەستورە وەسەنییەکان ــ 1977", "مەرجی پۆست مۆدێرنیزم ــ 1979".. هەروەها چەندان لێکۆڵینەوەشی لە بوارەکانی هونەر و وێنەکێشاندا هەیە, بە بڕوای ئەو هونەر شێوازێکە لە شێوازەکانی وێرانکاریی, هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئیستاتیکا لە لای لیوتار لەسەر بنەمای ئابورییەکی شەبەقیانە دامەزراوە. لە ساڵی 1954 بە دواوە بووە بە مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی پاریسی هەشتەم. لە نێوان ساڵانی 1950 ـ 1960 بەشێوازێکی مارکسییانە بیری دەکردەوەو پێوەست بوو بە پارتی کۆمۆنیستەوە, بەڵام لە ساڵی 1980 بەدواوە باوەڕی بە مارکسیزم نامێنێت و بە بیرکردنەوەیەکی تۆتالیتارییانە لە قەڵەمی دەدات.

9. سپیڤاك, گاڤاتری Gayatri Spivak (1942 - )

نوسەرو بیریارێکی ئەمریکی بە رەچەڵەك هیندییە, لەژێر کاریگەری وتەکەی کانتدا کاری کردووە کە وتوویەتی "رۆشنگەریی شوێنی ئازادی دەکەوێت". چەندین لێکۆڵینەوەی لەسەر رەوشی ناوچەگوندنشینەکانی بەنگلادیش هەیە.

10. کریستیڤا, جولیا Kristeva, Julia (1941– )

فیمینیست و دەرونشیکارو تیوریستێکی ئەدەبی فەرەنسی بە رەچەڵەك بولگارییە, لە ساڵی 1965 دا هاتۆتە پاریس و بووە بە ئەندامێکی دەرکەوتووی گرووپی تێل کوێل کە گروپێکی تیوریستە چەپرەوەکان بوو, بەڵام ئەم زیاتر سەر بەهێڵی دەرونشیکاریی فرۆید و زمانەوانە بونیادگەراکان بوو, پەیوەندی نێوانی زمان, کۆمەڵگا, خود شی دەکاتەوە. لە کتێبی سیمۆتیکدا – 1969, باس لەوە دەکات کە خود بوونێکی ئۆتۆنۆمی سەقامگیر نیە, بەڵکو بەرهەمی زمانە. لە ساڵی 1974 بە دواوە پرۆفیسۆری زمانەوانی بووە لە زانکۆی پاریس و دەرونشیکارێکی پراکتیکیش بووە, هەر لەو ساڵەدا کتێبی "شۆڕش لە زمانی شیعریدا"ی بڵاو کردۆتەوە و تێیدا دەڵێت شیعر لە بنەڕەتدا بریتیە لە گوزارشتکردن لە ناعەقڵانییەت, لەو رەگەزە سەرکوتکراوانەی لە نەستەوە دەگەڕێنەوە. شیعر کێڕکێی نیزام و عەقڵانییەت دەکات و لە کۆنترۆڵ دەرباز دەبێت. پاشان لەهەمان ساڵدا 1974 دا دەربارەی ئافرەتە چینییەکانی بڵاو کردۆتەوە کە لێکۆڵینەوەیەکی فیمینیستانەیە دەربارەی شۆڕشی کەلتوریی, ئینجا پۆلیلۆگ – 1977 و دواتریش لە ساڵی 1983 دا چیرۆکەکانی خۆشەویستی بڵاوکردۆتەوە, کە تێیدا باس لە پەیوەندیی نێوانی زمان و جەستەو سنورەکانی شوناسی شەخسی دەکات. شیکردنەوەکانی بۆ سێکسانێتی و مێیەتی, بوون بە بەشێکی گرنگ لە مشتو مڕەکانی فیمینیستەکان. لە ساڵی 1991 دا سامورایسی بڵاوکردەوە کە رۆمانێکە پۆرترێتی چەند کەسێکی کێشاوە کە لەم دواییانەدا هەژمونیان لەسەر ژیانی رۆشنبیریی فەرەنسا هەبووە. کریستیڤا و ئیریگاری و کیکسۆس کریستیڤا بە دەرکەوتووترین و کاریگەرترین فیمینیستی فەرەنسا لە قەڵەم دەدرێن.

## سەرچاوە

*Postmodernism*

*Rearranging the furniture of the universe*

*By: Fayaz Chagani*

# پۆستمۆدێرنیزم
# (له ئەدەب و هونەردا)

رۆبێرت رای
له عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید

وشـه "مـۆدێرن" *modern* لـه ساناترین مانـادا واته "هاوچەرخ" *contemporary*، هـەر بۆیـه زاراوەی "پۆست مۆدێرن - پاش تازەگەری" *postmodernism* سـەرەتا وەك جۆرێـك لـه وتـەكانی خـەياڵی زانسـتی *scienc fiction* دەردەكـەوێ. چـۆنکه چـۆن دەكـرێ بڵـێین شـتێك لـه یـەك كاتـدا هەیـه و بـەڵام هێشـتا نەگەیشــتووە؟. ئـــەو مانایـــەی كـــه وشـــەكە لـــه خۆیـــدەگرێ وەك جۆرێـــك لـــه پێشـــبینیكردنی پاشـەڕۆژ، وەك نەبرەیـەكی نكوڵیكردنی هیچگەری، هــــەڵقولاوی كۆكردنــــەوەی نێــــوان دژەكانــــە، كۆكردنەوەیەك كه واتای مـەحاڵ دەگەیـەنێ، چـونكه ئــەو كاتــەی تــۆ دەڵێــی "مــن ســەر بــە پۆســت مۆدێرنیزمم" لای زۆر كـەس وەك ئەوەیـه بڵێـی "مـن ئێستا نوستووم!".. ڕەنگه قسەكە بشێ بەڵام مانای چییە؟ به هـەر حاڵ ئەم كۆدژییە دەڕەوێتـەوە كـاتێ وشەی "مۆدێرن" *modern* دەگۆڕین به "مۆدێرنیزم" *modernism*، چــــونكه مــــۆدێرنیزم دەلالــــەت لــــه ماوەیـەكی مێـژوویی دیـاریكراو ناكـا بـەڵكو زیـاتر واتــای بڕاوتێكــی دیــاریكراوی ئــەدەب و هونــەر دەگەیـــەنێ. ســـەرباری ئـــەم وردەكارییـــە، لـــە دیــاریكردنی مانــای وشــەكاندا هــەردوو وشــەی "پۆســـت مـــۆدێرن" *post modern* و "پۆســـت مـۆدێرنیزم" *post modernism* برێـك لـه نامۆییـان تێدایـه كـه ڕەنگـه هـەڵگری دابڕانێكـی ڕیشـەیی بـن لەگـەڵ ئـەو كەلـەپورەی كـه هەڵوێسـتی مـۆدێرن هەیـەتی. هـەر بۆیـه بـه مەبەسـتی خۆڕاهێنـان لەگـەڵ وشەی "پۆست مۆدێرنیزم"دا پێویسته لەگەڵ واتا پەنهانەكانیدا ئاشنایەتی پەیدا بكەین.

ســاڵی 1924، پــاش تێپــەڕبوونی دوو ســاڵ بەسەر "ساڵی شته سەیرەكان"دا كه (یولیسیس) و (وێرانه خاك)ی تێدا دەرچوون، ڤرجینا وۆڵف وتـی: مـۆدێرنیزم یـان جیهـانی مـۆدێرن لـه دیسـەمبەری ساڵی 1910 بەدواوە یـان دەوروبـەری ئەو مێژووە دەسـتپێكردووە.. كـاتێ كەسـایەتی مـرۆڤ گـۆڕانی

بەسەرهات.. (*wolf, 1950, p.96*). ساڵی 1977 چارلس جێنکس بە ڕاستیەکی گاڵتە ئامێزەوە – کە ئەوەش خۆی لە خۆیدا پێداویستیەکی پۆست مۆدێرنیزم بوو – وتی: مۆدێرنیزم لە سەعات 3:32ی پاشنیوەڕۆی 15 یۆلیۆی 1972 کۆتایی پێهات.. (*Jencks, 1984, p.9*)، ئەو ساتەوەختە لای ئەو، ڕەمزی ڕووداوێکی تەلارسازی دیاریکراو بوو، ڕووداوی ڕاماڵینی پرۆژەی نیشتەجێبوونی *Pruitt- Igoe*، کە تەلارسازی مۆدێرنیست مینۆرۆ یاماساکی *Minouro Ymasaki* نەخشەکەی کێشابوو، بەڵام ئەندازیارەکانی نەخشەسازی لە شاری سانت لویس *St. Luise*ی ئەمریکی فەرمانی بێکەڵکی ئەو پرۆژەیەیان دەرکرد. لە ڕاستیدا زاراوەی "پۆست مۆدێرنیزم" سەرەتا لە بواری تەلارسازیدا بڵاوبۆوە، بەڵام هێندەی نەبرد چووە بوارەکانی تریش بە جۆرێك خەریك بوو ببێتە دروشمێکی تایبەت بە شێوازێکی ئیستاتیکی، دۆخێکی ڕۆشنبیری، ڕەفتارێکی ڕەخنەیی، هەلومەرجێکی ئابوری و هەڵوێستێکی سیاسی. دەستپێکردنەکانی ئەو دۆخە جیاواز بوون بە گوێرەی مەبەستی مرۆڤەکان لە وشەی "پۆست *post*" هەر بۆیە جێی خۆیەتی بپرسین ئەو قۆناغە لە چ مێژوویەك لەم مێژووانە دەستی پێکردووە:

–ساڵی 1984، کاتێ دادگای باڵای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕیاریدا کە مافەکانی نوسین و بڵاوکردنەوە، تۆمارکردنی ڤیدیۆی ماڵان بۆ پەخشی هەوایی ڕاستەوخۆ قەدەغە ناکا؟

–ساڵی 1971، کاتێ کتێبەکەی باری کۆمێنێر *Barry commener* (بازنەی داخراو *The Colosing Circle*) یەکەمین یاسای ژینگە ناسی *Ecology* داڕشت: "هەموو شتێك پەیوەندیی بە شتێکی ترەوە هەیە" و "هەموو شتێك دەچێتەوە سەر شوێنێکی دیاریکراو"؟

–ساڵی 1968، کاتێ خۆپیشاندانەکانی خوێندکاران لە ئەمریکاو ئەوروپا دژی جەنگەهەڵگیرسا و بزاوتەکانی بەرگریکردن لە مافی ژنان و کەمینەکان پەرەی سەند؟

–ساڵی 1962، کاتێ هونەرمەند ئاندی وارهۆڵ *Andy Warhol* لەسەر داوای هاوڕێکانی بڕیاریدا سنورێك دابنێ بۆ بەرهەمە گوزارشتکارییە پەتیەکانی و یەکەمین تابلۆی خۆی دەربارەی "قوتوەکانی سوپی کامپل *Compbell Soup Cans*" بەرهەم بێنێ؟

–ساڵی 1954، کاتێ پەخشی تەلەفزیون بۆ یەکەمین جار گەیشتە نیوەی ماڵەکانی ئەمریکا؟

–ساڵی 1952، کاتێ ڕێکخراوی *Lettrist International* بڕیاریدا بەشداری نەکا لەو کۆنفرانسە ڕۆژنامەییەدا کە شارلی شاپلن لە ئوتێلی ریتز *Ritz* سازیدا بوو، هەروەها بانگەشەی بۆ ئەوە کرد کە "نمونەیی ترین گوزارشت لە ئازادی تەنها لە ڕێگای تێکشکاندنی بتەکانەوە دێتە گۆڕێ، بە تایبەتی ئەو بتانەی خۆیان بە پارێزەری ئازادی دەزانن".. (مارکۆس *Marcus, 1982, p. 15*)؟

–ساڵی 1946، کاتێ ئارنۆڵد تۆینبی ئاماژەی کرد بۆ چاخی مێژویی "پۆست مۆدێرن" (*Toynbee, 1905*)، هەروەها ڕاندڵ جاریل[1] *Randall Jarrell* و ڕۆبێرت لویل[2] *Robert Lowell*ی وەك دوو کەسی پۆست مۆدێرن یان نا مۆدێرن لە قەڵەمدا (*Calinescu, 1987, p. 267*)؟

–ساڵی 1913، کاتێ مارسیل دوو چامپ[3] *Marcel Duchamp* پایسکیلێکی هەڵگەڕاوەی لەسەر کورسیەکی وەرچەرخاو دانا، بەوەش پەیکەرێکی ئامادەی دروستکرد *Ready made* (ئەو گوزارشتەی

دوو چاپ بەکاریهێنا بۆ هەر شتێکی ئاسایی کە هەڵگری ناونیشانێک، یان ئیمزای هونەرمەندێک بێو وەک جۆرێک لە "هونەر *art*" نمایشبکرێ؟

-ساڵی 1855، کاتێ پێشانگای جیهانی لە پاریس بووە یەکەمین پێشانگا کە هۆڵێکی تایبەتی بۆ نمایشکردنی وێنەی فۆتۆگراف *Photography* لە خۆگرت؟

-ساڵی 1852، کاتێ (بۆن مارچێ *Bon Marche*) یەکەمین نوسینگەی خۆی بە هەموو بەشەکانیەوە لە پاریس کردەوە، پاش کردنەوەی تەلاری کریستاڵ *Crystal Palace* لە لەندەن بە ساڵێک و پێش کردنەوەی مۆزەخانەی لۆڤەر بە سێ ساڵ (ویلیامز *Williams, 1982, p.66*)؟

-ساڵی 1850، کاتێ فلۆبێر *Flaubert* دەستیدایە دانانی فەرهەنگی بیرۆکە باوەکان *Dictionary of Received Ideas* کە تیایدا لە دیاردەکانی ژیانی ڕۆژانە دەکۆڵێتەوە؟

-ساڵی 1836، کاتێ ڕۆژنامەی لاپرێس *La presse* ی پاریسی بووە یەکەمین ڕۆژنامەی بازرگانی، بەوەش وەک دەڵێن بووە "یەکەمین شمەکی ئیستهلاکی، کە چاپدەکرا بۆ ئەوەی بمرێ و دەکڕدرا بۆ ئەوەی فڕێ درێ" (تیردمان *Terdiman, (1985, p. 120*؟

دەکرێ خەسڵەتەکانی پۆست مۆدێرنیزم لەوەدا کورتبکەینەوە کە هەر یەکێك لەم مێژووانەی سەرەوە (رستێك مێژووی دیکەش) دەکرێ ببێتە خاڵی دەستپێکردن" چونکە پۆست مۆدێرنیزم بە پێچەوانەی ئیمپریشنیزم *Impressionism* و سێجاگەری *cubism* و گوزارشتگەری *expressinism* و تەنانەت بە پێچەوانەی تازەگەرییەوە *modernism* ناتوانین بە سانایی وەک بزاوتێکی دیکەی کاروانی هونەر تەماشای بکەین. هەروەها ڕێ و شوێنە باوەکانی ڕەخنەی ئەدەبی ڕۆڵی خۆیان بە چاکی ناگێڕن لە جیاکردنەوەی پۆست مۆدێرنیزم لە بزاوتە کۆنەکان. بۆ نمونە بە گوێرەی ئەو ڕێو شوێنە ڕەخنەییانەی پۆست مۆدێرنیزم پێڕەویان دەکا بۆ پۆلێنکردنی چەند ئەدیبێکی وەک بیکێت *bechett* و نابۆکۆڤ *Nabocov* (کە پێشتر وەك مۆدێرنیست لە قەڵەم دراون) ئەو ئەدیبانە گەورەترین نوسەری پۆست مۆدێرنیستن، هەر بۆیە دەکرێ هەڵەیەك لە ئارادا بێت. لێرەوە شەش کۆششی جیاواز باسدەکەین بۆ شیکردنەوەی ئەو دۆخەی وەسفی پۆست مۆدێرنی بەسەردا دەچەسپێ.

## وەرگرتنەوە یان گۆڕینەوە Redemption

"پۆست مۆدێرن.. زاراوەیەکە بەم دواییانە ڕەونەقی لە دەستداوە" (توماس کرۆ *Thomas Crow* فۆستەر *Foster*، 1987، ل 1) . "واتە هەموو کەسێك، هەموو شتێك، پەیوەندییەك و مانایەکی تری هەیە" (واڵتەر بنیامین *Walter Benjamin* (1928) 1977، ل 175).

باشترین ڕێگا بۆ تێگەیشتن لە پۆست مۆدێرنیزم بریتیە لە وردبوونەوە لە کاروانی ژیانی دۆگلاس سیرك *Douglas*، کە هونەرمەندێکە ڕەچەڵەکێکی دانمارکی هەیە، لە ئەڵمانیا گیرساوەتەوە و لە بواری شانۆدا کاریکردووە، ساڵی 1934 بۆ گەورەترین ستۆدیۆکانی ئەڵمانیا *UFA* فیلمی بەرهەمهێناوە. پاش سێ ساڵ وازی لەو کارە هێناوە دوای ئەوەی دیدو بۆچوونە چەپڕەوەکانی هەندێ سەر ئێشەی بۆ دروستکردووە" ئەڵمانیای بەجێهێشتووە و دواجار ساڵی 1939 لە ئەمریکا نیشتەجێ بووە، لەوێ بە گیانێکی ساردەوە کاری لە ستۆدیۆکانی کۆمپانیای یۆنیڤێرساڵ *Universal*

کردووە، چەند فیلمێکی دەرهێناوە کە ناوبانگی بۆ پەیدا کرد وەك: خولیایەکی مەزن ***Magnificent Dbsession*** (1952)، ئەوەی ئاسمان دەیرەخسێنێ ***All that Heaven Allows*** (1955)، نوسراوی سەر "با" ***Written on the wind*** (1956)، فریشتە گوناهبارەکان ***Tarnished Angels*** (1957) و لاساییکردنەوەی ژیان ***Imitation of Life*** (1959).

ئەم کارانە میلۆ درامای ئەوتۆ بوون کە بودجەی زۆر گەورەیان بۆ تەرخانکرا، لە ڕووی بازرگانیشەوە سەرکەوتنیان بە دەستهێنا (جگە لە فریشتە گوناهبارەکان)، لەو فیلمانەدا جگە لە (لاساییکردنەوەی ژیان) ڕۆك هەدسۆن ***Rock Hudson*** ڕۆڵی پاڵەوانیەتی دەگێڕا. کاتێ نمایشکران ڕەخنەگران ئاوڕیان لێنەدایەوە؟ بەو پێیەی وەك کارەکانی هۆڵیود بە مەبەستی کاربەسەربردن بەرهەمهاتوون و قازانجی مادی بەدەستدێنن و پاشان بۆ تاهەتایە لەبیری خەڵك دەچنەوە.

لە کۆتایی شەستەکاندا (سیرك) وازی لە کاری سینەمایی هێناو لە سویسرا نیشتەجێ بوو، زنجیرەیەك لێکچەری پێشکەشی سینەما ناسان کرد. لەو وانانەدا ئەوەی دووبارە دەکردەوە کە فیلمەکانی (کە کەمتر لە دەساڵ یان پانزە ساڵیان بەسەردا تێپەڕیبوو) ڕوخێنەر بوون و ڕەخنە ئامێز بوون و گاڵتەیان بە "بەها بۆرجوازیەکان"ی ئەمریکا و ئارەزووی هۆڵیود بۆ بەرهەمهێنانی میلۆ دراما دەکرد. (سیرك) مەبەستی بوویێ یان نا کاتێکی چاکی هەڵبژارد بۆ ئاراستەکردنی ڕەخنەکانی، نێوەندە ئەکادیمیەکانی سینەمای ئینگلیز و ئەمریکا بە حەماسەتێکی زۆرەوە لەسەر دوو ئاستی دژبەیەك ئەو ڕەخنانەیان وەرگرت: ئاستی دەرهێنان ***auteurism*** (کە بایەخی زۆری بە ئامادەکردنی دەرهێنەر فیلم دەدا)، ئاستی ئایدیۆلۆجیای چەپیش. (سیرك) پردی نێوان ئەو دوو ئاستە بوو: بەو پێیەی پاڵەوانێکی دەرهێنانی سینەمایی بوو کە خەباتێکی ڕەخنەیی گاڵتە ئامێزی دژی سیستمی داپڵۆسینی ستۆدیۆکانی هۆڵیود و بەها بۆرجوازیەکان پێڕەو دەکرد. ئەو کاتە کەسێك نەبوو باس لە بەرپرسیاریێتی دەرهێنەر بکا لە بانگەشەکردن بۆ ئەو بەهایانە، (سیرك) سەرە داوی هەموو گەمەکەی لە دەستیدا کۆکردبۆوە، لە ڕێگای کۆدژیی نێوان ئەو شتەی داوای دەکات و ئەو شتەی لە ڕاستیدا ئەنجامی دەدا. بەهەرحاڵ ڕۆشنایی خرایە سەر دید و بۆچوونەکانی (سیرك)، فیلمەکانی بوونە مایەی مشت و مڕو شیکردنەوە لە کۆنگرەکاندا و لەسەر لاپەڕەی گۆڤارەکان ساڵی 1987 سینەما -ناسان بە متمانەیەکی زۆرەوە باسیان لە "دەقی پەنهانی گاڵتە ئامێز" ***Ironic sabtext*** دەکرد کە هەڵگری ئەو کۆدژییە گاڵتە ئامێزە بوو کە (سیرك)ی پێناسرا.

ئەم نموونەیە چیمان پێدەڵێ و چیمان بۆ ئاشکرا دەکا کاتێ ئێمە باس لە پاش تازەگەری ***Postmodernism*** دەکەین؟ سەرەتا لێکچەرەکانی (سیرك) وەك زیندوکردنەوەیەکی دروستکراو وابوو ***remoivataion*** "واتە ژیاندنەوەی فیلمەکانی خۆی": ئەو مانای ئەو فیلمانە و دەلالەتەکانیانی لە ڕێگای هەڵسەنگاندنەکانی دواتریەوە گۆڕی، واتە سەر لەنوێ دراوێکی بەکارهێنایەوە کە بەهای نەمابوو. هەرچەندە ئەو دروستکردنەوەیە کاتی خۆی شتێکی نائاشنا بوو، بەڵام بووە خەسڵەتێکی پێویستی کاری ڕۆشنبیریی لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا. ئەم ئاراستە ڕەخنەییە لە بواری ڕۆشنبیریی بەرزدا سەرەتا لە تابلۆ و پەیکەرە "ئامادەکان"ی دوو چامپ-ەوە دەستی پێکرد،

پاشان ئاماژه رەمزییەکانی مۆسیقای ئیڤیز ***Ives***[4]
و تابلۆ کۆلاجەکانی کوبیزم[5]، هەروەها شیعری بێ
پەردەی سوریالی و لە کۆتاییشدا تەزویر کردنی
چەند دیمەنێکی تابلۆکانی ئیدوارد ویستۆن
***Weston*** و ئیکۆن شیل ***Egon Schiele*** و جۆن میرۆ
***Joan Miro*** لە لایەن وێنەگری فۆتۆگراف خاتوو
"شێری لیڤین ***Sherrie Levine***"ەوە. لێرەوە
دەگەڕێینەوە بۆ تەفسیرەکانی (سیرك) بۆ فیلمەکانی
خۆی وەك ئەوەی درێژبوونەوەی کارە "ئامادە"کانی
دوو چامپ بووبن کە دیدی خۆی بەرامبەر کارە
رەسەنەکان دەخاتە ڕوو بەبێ هیچ هەموارکردن و
راستکردنەوەیەك تەنها لەو شوێنەدا نەبێ کە خۆی
مەبەستیەتی، وەك دەستکاریکردنی تابلۆ
بەناوبانگەکەی مۆنالیزا کاتێ بەسەر تاشراوی
***Shaved*** نمایشی کرد.

ئەم جۆرە کارانە (ژیاندنەوەی دروستکراوی
کارە پێشوەختەکان یان ئامادەکان) لە کلتوری
جەماوەریدا ***Mass culture*** برەویان پەیدا کرد و
ناوی "گەڕانەوەی تەندروستی ***recuperation***"ی
لێنرا. ئەوانەی ئەم وشەیە بەکاردێنن مەبەستیانە
ئەو کارە هونەریانەی تەکنیکێکی وردیان هەیە سەر
لەنوێ بۆ کاری بازرگانی بەکاربێننەوە بە جۆرێك لە
ئاستیان دابەزێنن، هەروەك چۆن ریکلامی شمەکە
بازرگانیەکان ئەو تەکنیکە کۆدژەی بەکاردەهێنا کە
کارە هونەرییە سوریالیەکان بەکاریاندەهێنا. زۆر
جار ئەم رەفتارە کولتوریانە بە ئاراستەیەکی دژدا
پەلیاندەهاویشت: بۆ نموونە بڕوانە "چابوونەوە —
گەڕانەوەی تەندروستی" بەو مانا جوانەی کە لە
بواری پزیشکیدا بەکاردێ، بەلام لە بواری
رۆشنبیریدا و لەسەر دەستی رەخنەگرە
چەپڕەوەکان بووە رەفتارێکی نزم و نەشیاو. دیك
هێبدیج ***Dich Hebdige*** (1979) سەرنجی ئەوەی
داوە کە رۆشنبیریی لاوانی بەریتانیا لە
رووبەڕووبوونەوەی بەها باوەکاندا، بەر لە هەر
شتێك هەوڵی تێکشکاندنی نەریتە باوەکانی بواری
جلوبەرگی داوە، بۆ نموونە بینیمان کە چۆن
"نیشانەی تەقلیدی جیهانی پیاوانی کار و
بازرگانی: چاکەت و پانتۆڵ و بۆینباخ و قژی
کورت.. هتد، لە دەلالەتە رەسەنەکانی خۆیان
بەتاڵکرانەوە کە پەیوەندییان بە لێهاتوویی و هەوڵ
و کۆشش و دەسەلاتخوازییەوە هەبوو" (ل 104-
105).

بەر لەوەی ئەو دیاردە کولتوریانەی پۆست
مۆدێرنیزم سەرهەڵبدەن، میتۆدە رەخنەییە
شێوەگەرەکانی مۆدێرنیزم، کە جەختیان لە
سەربەخۆیی هونەر و بەرزڕاگرتنی وشەی دەق
دەکردەوە، گەیشتبوونە دۆخی شیکردنەوە و پاساو
هێنانەوە" پاشان هەوڵەکەی (سیرك) وەك خاڵی
وەرچەرخانی پۆست مۆدێرنیزم وا بوو سەبارەت بە
دەقخوازی ***textuality*** لە بری کارە هونەریەکە.
هەرچەندە پۆست مۆدێرنیزم هەمان دیدی
شێوەگەرەکان (فۆرمالیستەکان)ی هەبوو سەبارەت
بە کاری هونەری بەوپێیەی مەبەست و غایەتە، بەلام
لە هەمان کاتدا پێی وابوو کاری هونەری پێگە ***Site***
و خاڵی بەیەکگەیشتنی ڕێگاکانیشە، کە یەکتر
دەبڕن و بەیەکدا تێدەپەڕن و تۆڕی ڕێگا خێراکان
دەخەنەوە کە بەندن بە یەکدییەوە، وەك ئەو
هەلومەرجە دەرەکییەی چواردەوری دەقیان داوە،
وەك دۆخی جەماوەری و بانگەشەکردن. چونکە
هیچ هەوڵێکی رەخنەیی سەرناکەوێ گەر تەنها
تەماشای دەق بکا و ئەو هەلومەرجە لەبەرچاو
نەگرێ. لێرەوە ئایا دەکرێ خەسڵەتی ئەو کارە
هونەریانە بژمێرین کە شێوازەکانی (سیرك)ی بۆ
دەشێ پاش سەرلەنوێ ژیاندنەوەیان؟ سوزان

سـوونتاج *Susan Sontag* وەلامـی ئـەم پرسـیارە دەداتەوە بەوەی بەڵێ دەکرێ "ئەگەر خوێندنەوەی نوێ پەسەند بکەین و بە پەرگیر لە قەڵەمی نەدەین" چونکە ناکرێ سووربین لەسەر ئەوەی کە تەنها داهێنەری (بنەڕەتی) هەموو نهێنیەکانی جوانی لا دەستدەکەوێ" (1966، ل 277). بەلام ئەوەش هەڵەی هونەریی تێدایە، ئەگەر نا داخۆ دەبێ شێواندن و مەسخکردنی تابلۆی مۆنالیزا لەلایەن (دو چامپ)ەوە ناوبنێین چی؟ ئایا ناوی بنێین هونەرێکی بالا *High art*؟ یان داخۆ گاڵتەکردنی (میل بروک *Mel Brook*)ی دەرهێنەری سینەمایی بە نازیزم لە فیلمی دەرهێنەرەکاندا *Producers* ناوبنێین چی؟ ناوی بنێین کارەساتێکی مێژویی واقعی؟

هەرچەندە (سیرك) خۆی پێی وایە کە دیدێکی رەخنەیی تایبەتی بۆ مۆدێرنیزم هەیە، بەلام دیاردەی ئالوگۆڕکردنی شوناسی هونەریی کە لەلایەن ئەوەوە پێڕەو کرا ئەو هەڵوێستە رەخنەییە بەرجەستە دەکا کە لە رووی زاراوەییەوە ناونرا پۆست مۆدێرنیزم: هەڵوێستێکە پشت ئەستوورە بە شێواندنی هێما و نیشانەکان و قابلیەتی پەرشبوونیان *Volatility* و بەشداریکردن لە ئەنجامدانی تاوانی تێکشکاندن. چونکە (سیرك) سەرەتا دەرفەتی شێواندنی هێما و نیشانەکانی خۆی و هەروەها جێگریی ئەو نیشانانەی خۆی قۆستەوە و فیلمەکانی بە جۆرێك نیشاندایەوە کە مانای تریان دەگەیاند" پاشان تێزێکی ئایدیۆلۆجی خستە سەریان –گەر بکرێ ناوبنرێ تێز– و چەند قاڵبێکی ئالودە بە ئایدیۆلۆجیا – وەك میلۆدراما–ی بڕی بەبەریان، هەروەها بنیاتی گێڕانەوەی کلاسیکی، پشتبەستن بە ئەستێرەی سینەمایی بەناوبانگ، سینەمای بازرگانی و ڕقبوونەوە لە ژن *Misogymy*. بە کورتی ئەو وانەیەی کە پۆست مۆدێرنیزم پێماندەڵێ ئەوەیە کە ئەگەر مۆدێرنیزم پابەند بووبێ بە پیرۆزی هونەرەوە و سیاسەتی بەرەنگاریی راستەوخۆی پێڕەو کردبێ، ئەوا پۆست مۆدێرنیزم ئەو دۆخەی تێپەڕاندووە و گەیشتۆتە ئەو خاڵەی کە بریخت (1966) ناویدەنێ "سەرلەنوێ بەگەڕخستنەوە *refunctioning* یان خۆ بە دەستەوە نەدان *Cunning*، بەو مانایەی کەلەپوور سەر لەنوێ بژێنرێتەوە لە ڕێگای سەر لەنوێ نوسینەوەی، واتە پۆست مۆدێرنیزم شەڕی خۆی لە خاکێکدا دەکا کە دوژمن حسابی بۆ ناکا.

بۆچی ژیاندنەوەی دروستکراو *remoivation* یان بەگەڕخستنەوە *Refunctioning* بووەتە رەفتاری بەربلاوی کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم؟ ئەو هۆکارانە چی بوون ئەو دۆخەیان هێنایە کایەوە؟ بەر لە پەنجا ساڵ و لە وتارێکدا کە بناغە بۆ بزاوتی پۆست مۆدێرنیزم دادەمەزرێنێ (والتەر بنیامین *Walter Benjamin*)[6] ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە لە پاریس بە قۆناغێکی مێژویی یەکلاکەرەوە لە قەڵەم دەدا، چونکە لەو دەمەدا چەند فۆرمێکی نوێ دەرکەوتن وەك وێنەگرتن و کتێبی کەم بەهاو چاپەمەنی بەردین، کە دیاردەی کولتووری جەماوەرییان لێکەوتەوەو بە شێوازێکی میکانیکی بەرهەمدەهاتنەوە *Mechanical reproduction* و بەفراوانی بلاو دەبوونەوە، ئەو هونەرە جەماوەرییە تەحەدای کاری هونەری و ئیستاتیکی تەقلیدی دەکرد. ئێستا چەند ئەنجامێکی سەر سوڕهێنەر بەدیدەکرێن سەبارەت بەو ژمارە زۆرەی هێما و نیشانە کە رەنگە لە سیاقەکانی خۆیان بترازێن و بەبێ هیچ قەید و مەرجێك دووبارە ببنەوە وێنەگرتن خۆی لە خۆیدا نمونەیەکی پڕ واتای بەشداریکردنی ئامێرە لە بواری نیگارکێشانی کۆلاجیدا *Collage* وەك ئۆلمەر *Ulmer* (1985) دەڵێ، چونکە وێنەگر

چەمد دیمەنێکی پچڕ پچڕ لە جیهان وەردەگرێ و دەرفەت داداتە هەر کەسێك بخوازێ وێنەی لێبگرێتەوە بە جۆرێك لە ژماردن نەیەت. من کە ئێستا دەنوسم لاپەڕەیەکی گۆڤاری هەفتانەی تێنیس-م لە بەردەمدایە Tennis Week وێنەی بەرگی ژمارەی پێشووی گۆڤاری نیوزویك-ی گرتۆتەوە News week، کە وێنەی خێزانێکی ئەمریکی ئاوارەی لە خۆ گرتووە، گۆڤاری تێنیس لە ژێر وێنەکەدا نوسیویەتی:

"هەرچەندە گۆڤاری TW خوازیار بوو وێنەگری ئەستێران مێلکۆیەر دیاکۆمۆ Melchoir Diacomo ئەندامێك بوایە لە تیمی وێنەگرەکانی، بەڵام دەبێ دانبەوەدا بنێین کە هەندێ جار ڕێگەی خۆی وندەکا بۆ نێوەندی باڵاتر. ئەمەی سەرەوە وێنەی بەرگی دەرەوەی ژمارە 2-ی پەنابەری گۆڤاری نیوزویك-ە کە لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ لە خۆ دەگرێ سەبارەت بە ئاوارەکانی وڵات. پیرۆزباییمان!".

یەکێك لە نوسەرەکان باس لەم شێوازی وێنەگرتنەوەیە reproduction یان (بەگەڕخستنەوە)یە دەکا و پێیوایە ئەوە جۆرێکە لە ڕفاندن Hijacking (بۆڵ Ball، 1987، ل 34)، هەروەها جۆرە ئاماژەیەکە بۆ ئەو لەیەکچوونەی لە نێوان کاری کولتوری ژیانی ڕۆژانەی ئاساییدا هەیە لە جیهانی پۆست مۆدێرنیزمدا. هەروەك چۆن هۆکانی گواستنەوەی نوێ، سەرنشینان دەخەنە بەر مەترسی ڕفاندن و وەرچەرخانی ئاڕاستەی سەفەر، بە هەمان شێوە وێنەگرتنەوەی میکانیکی نیشانە و هێماکان دەشێوێنێ و لە دەلالەتە ڕەسەنەکانیان دایاندەبڕی و ماناکانیان وەردەچەرخێنێ. هونەرمەندان لە سەردەمی دوو چاپ-ەوە ئەم حاڵەتەیان ئاشکرا کردووە، لە شەستەکاندا بە

گەریانخستووە بە مەبەستی پێڕەوکردنی سیاسەتێك بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵات و گاڵتەکردن بە دەزگا باوەکان. جاك درێدا ئەم دۆخە مێژووییە لە وتەزایەکی بەناوبانگدا بەزادەی سەردەمێك وەسفدەکا کە هۆکانی ڕاگەیاندن تیایدا باڵا دەستن:

"ئەگەرێك کە سوورم لەسەری.. هەموو هێما و نیشانەیەك، زمانەوانی بێت یان نا، نوسراو بێ یان وتراو.. لە یەکەیەکی بچوکدا بێت یان گەورە، دەکرێ دەربهێنرێ be cited و بخرێتە نێوان دوو کەوانە: بەمەش دەشێ لە سیاقی خۆی دەربچێت و بێکۆتا سیاق بەرهەمبێنێ، بەشێوەیەکی ڕەها و بێ هیچ سنورێك. ئەمە مانای ئەوە نیە کە دەشێ نیشانە لە دەرەوەی سیاق بوونی هەبێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە واتە دەشێ چەندین سیاق هەبن بەبێ بوونی چەقێك یان خاڵێکی جێگیر".

(1977، ل 185-186)

وێنەگرتنەوەی میکانیکی کاریگەریی تریشی هەیە. چونکە کاردەکا بۆ پاراستن و بانگەشەکردن بۆ بێکەڵکترین و نزمترین بەرهەمی کولتوری (بڕوانە کە چۆن تەلەفزیۆن هەموو شتێك بەرهەمدێنێتەوە، بەمەش پێوەرێکی ئیستاتیکی لە ژینگە وەردەگرێ. هەروەك چۆن ئاندی وارهۆڵ Andy Warhal پێوەرەکانی جوانی و ژینگە ecology پێکەوە گرێدەدا و دەڵێ:

"من هەمیشە حەزدەکەم کارەکانم لە پاشماوەکان وەربگرم، لەو شتانە بەرهەم بسازێنم کە خەڵکی فڕێیانداوە و هیچ سوودێکیان لێنەبینیوە.. گەر تۆ بتوانی شتێکی باش یان بەلانی کەمەوە شتێکی سەرنجڕاکێشی لێ دروست بکەیت، ئەوا ڕەنجەکەت بە زیادە ناچێ وەك ئەوەی لە دروستکردنی شتی نوێدا ڕەنج بە بادەوەی. تۆ بە

رهەمەکە و خەڵکانی تر دەخەیتە بازنەی دووبارەبوونەوە و کارەکەت لە کاری خەڵکانی ترەوە سەرچاوە دەگرێ، لەو شمەکانە بەرهەمدەسازێنی کە سەرفکراون، ئەمەش کارێکی زۆر ئابوورییە لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا".

(1975، ل 93)

زاراوەی "دووبارە سوڕانەوە *recycling*" وەك زاراوەیەکی مەجازی کە لە زانستی زیندەوەرناسی وەرگیراوە، زۆر بە وردی ئەو سیاسەتە ئابوورییە وەسفدەکا کە کولتوری هاوچەرخ پێڕەویدەکا، چونکە جیاوازی لە نێوان دەق *text* و دەقی پەراوێزیدا *paratext* (لە نێوان رەخنە و ئەو نوسینانەی کە لەسەر بەرگی کتێبەکان بڵاو دەبنەوە) جیاوازییەکی یەکلاکەرەوە نییە. هەندێ لە پەیمانگاکانی فێر کردن و هونەر و ریکلام کار بۆ ئەو سیاسەتە ئابوورییە دەکەن و وەك پێویستیەکی بازاڕی شمەکی کولتوریەکان هاتوونەتە ئاراوە. ئەو دەزگایانە ریکلام بۆ بەرهەمە کولتوریەکانی خۆیان دەکەن و دابەشکردنی ئەو بەرهەمانە دەکەن، هەندێ جار لە رێگای فریودان و هەندێ جاریش لە رێگای پروپاگەندەی چڕوپڕەوە، هەندێ جاریش لە رێگای گۆڕانکاری بەردەوام لە تۆڕی دەلالەتەکانی بەرهەم (دەق)دا و شێوازەکانی گوتاردا. ستۆدیۆکانی هۆلیوۆد — بەو پێیەی نمونەیەکی ئاشکرایە لەمبارەیەوە— پەنادەبەن بۆ دزە پێکردنی هەواڵی بەرهەمی نوێ بۆ رۆژنامەکان، هەڵمەتێکی ریکلام و پۆستەر بڵاوکردنەوە دەستپێدەکەن، هەواڵی پەیوەندیەکانی ئەستێرانی سینەما و شێوازی ژیانیان بڵاو دەکەنەوە، دیداری رۆژنامەوانی و خەڵاتەکانی ئۆسکار رێکدەخا و چەندین جۆری دیکەی پروپاگەندە بەگەڕ دەخەن بۆ رووناکی خستنەسەر فیلمی بەرهەمهێنراو، پاشان خۆیان لای خۆیانەوە ئاڕاستەی خوێندنەوەی فیلمەکە دیاریدەکەن. خوێندنەوەی شێواندنی کارەکان — وەك ئەوەی (سیرك) ئەنجامیدا— توانا دەبەخشێ بە تاکی خوێنەر و کەمینەکان (وەك رەخنەگرەکانی بزاوتی فێمینیزم بۆ نمونە) تا ئەوانیش هەمان گەمە بکەن و ئەو شتانە بخوێننەوە کە ئامادەییان نییە، هەروەها لە دووبارە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی هۆلیود دەسکەوتی سیاسی دەستبخەن. پۆست مۆدێرنیزم هوشیارە بەوەی کە دەلالەتی کار بەنێو دەزگایەکی ئاڵۆزی پرۆسەکانی بەرهەمهێنان، بڵاوکردنەوە و سەرفکردندا تێدەپەڕێ.. ئەوانە هەموو هۆکاری کاریگەرن، هەموو ئەو شتانەی لە "دەق" ئاڵاون (وەك دیداری رۆژنامەوانی، هەواڵی کۆمەڵایەتی دەربارەی ئەستێرەکان و هونەرمەندان و کارەکانیان.. هتد) کار لە دەقەکە دەکەن و ئاراستەکەی بەردەوامن (بێنێت *Bennett*، 1982). لە دۆخێکی ئاوهاشدا هەموو دەلالەتەکان دەبنە فۆرمێك لە فۆرمەکانی پڕوپاگەندە *Propaganda*.

لێرەوە دەتوانین بڵێین کە دیاردەی (سیرك) بەر لەوەی پشتببەستێ بە فیلمەکانی زیاتر پشتئەستوور بوو بەو دۆخە کولتورییەی کە نێوەندە ئەکادیمییە پەشێوەکانی ئەوروپای والێکردبوون شوێن پێی گروپێك لە رۆشنبیران هەڵگرن و لە ژێر چەتری ئەوان و لەبەر تیشکی دید و تێزەکانیاندا بن. ئەو دۆخە زادەی قۆناغێکی نوێ بوو کە دەزگاکانی زانیاری گەیاندن لەوپەڕی نەوسنیدا بوون، پرۆسەکانی وێنەگرتنەوەی میکانیکی سەرقاڵی ئەو کارانە بوون بە شێوەیەکی پەلەپرووزکێ، تا ساڵی 1986 ئەو پرۆسانە گەیشتنە خاڵێك کە چیدی پۆست مۆدێرنیزم ببوە تارماییەکی کاڵ و مۆدێلێکی کۆن. مۆدێرنیستەکان هەر لە سەرەتاوە لەو دۆخە دەترسان کە هەڕەشەی

ئەوەی لە هونەرمەندان دەکرد کۆنترۆڵ بەسەر کارەکانی خۆیاندا لە دەست بدەن و کارەکانیان بە جۆرێك بەگەڕبخرێ کە لە سەریان بکەوێ. گەر هونەرمەندی مۆدێرنیست توانیبێتی بەسەر ئەو دۆخەدا زاڵ ببێ بەوەی لە دیمەنی گشتی بکشێتەوە و چەندین ڕێگەی سەخت بگرێتە بەر بە مەبەستی پاراستنی کارەکانی لە شێواندن و بەکارهێنان لە ئاستێکی بەرفراواندا (لەمبارەیەوە بڕوانە مالارمێ *Mallarme*)، ئەوا هونەرمەندی پۆست مۆدێرنیست بە ڕوویەکی قایمەوە لە ناوجەرگەی دیمەنی گشتیدا *In a dead-pan* وەستاوە، هونەرمەندێکە ئەزموونەکانی خۆی لە ڕێگەی وێنەگرتنەوەی میکانیکییەوە بەسەر کارەکانیدا ئەنجامدەدا، بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەنجامە هونەریەکان، بەڵکو زیاتر گوێ دەداتە بایەخە ڕەخنەییەکان و قازانجی ئابوری بە کەمترین ماندوو بوون (بڕوانە: وارهۆڵ *Warhol*، 1975) بەم فێڵە (سیرك) حەقیقەتی پۆست مۆدێرنیزمی بەرجەستەکرد کە کورتدەبێتەوە لە: ئەگەرە بێکۆتاکانی خوێندنەوەی کارەکان بە شێوازی جیاواز و گۆڕدراو *reading differently*، "جەنگی باندەکانی هێما و نیشانەکان" وەك ئیکۆ دەڵی (*Eco*، 1972، ل 121) دژی ئەو کارە هونەریانەی کە مۆدێرنیزم پێی وا بوو لە قەڵایەکی قایمدان.

تەلەفزیۆن *Television*

هەموو شتێك لە جیهاندا دەستپێدەکا تا لە کتێبێکدا کۆتایی دێت.

(مالارمێ *Mallarm* (1862)، 1968)

ئایا ئەدەب چی بوو؟

(لیزلی فیلدێر *Leslie Fielder*، 1982)

هەموو شتێك هەوڵدەدا بۆ ئەوەی بچێتەوە سەر شێوەی تەلەفزیۆن.

(گیریگۆری ئەڵمەر *Ulmer*، 1989)

شیاوترین ڕێگا بۆ تێگەیشتنی پۆست مۆدێرنیزم *postmodernism* بریتییە لە وردبوونەوە لەو واتا پۆشراوەی کە لە وشەی فەرەنسی *Poste*دا هەیە، کە مانای "ئامێری تەلەفزیۆن دەگەیەنێ" (ئەڵمەر *Ulmer*، 1985). لە ڕاستیدا پۆست مۆدێرنیزم واتایەکی تر دەگەیەنێ *modernism poste* واتە مۆدێرنیزمێك کە تەلەفزیۆن دەیگەیەنێ. ئامارەکان چەندین حەقیقەتی سەرسوڕهێنەریان دەرخستووە: 99٪ ماڵەکان لە ئەمریکا ئامێری تەلەفزیۆنیان هەیە (زۆر زیاتر لەوانەی کە سەلاجەیان هەیە یان بۆری ئاویان بۆ ڕاکێشراوە). لەو ماڵانەدا لە ڕۆژێکدا تەلەفزیون هەشت سەعات کاردەکات (زیاتر لە وادەی کارکردن یان نوستنی زۆربەی دانیشتوان). ئێستا تەلەفزیۆن و فیلم جێگای ئامڕازەکانی گێڕانەوەی تەقلیدییان گرتۆتەوە کە لە چوارچێوەی ئەدەبدا بوون، ئێستا تەلەفزیۆن –وەك یەکێك لە نوسەران سەرنجی دابوو– تەنها بەشێك نییە لە ژیانی تازە بەڵکو بووەتە خودی ژیانی تازە (ستێنبرگ، 1980، ل 141). ئێستا وەك جۆرج ستێنەر *Steiner* لە ساڵی 1952دا ووتی "کتێب *Book* کە پێشتر ناسیومانە خەریکە دەبێتە دیاردەیەکی دەگمەن کە تەنها لە چەند ناوچە و کولتورێکدا ڕێکەوتی دەکەین و تەنها لە قۆناغێکی کورتی مێژودا هەبووە" (1972، ل 187) ئەگەر قسەکەی مالارمێ کە لەسەرەوە هاتووە واتای ئەوە بگەیەنێ کە مۆدێرنیزم لووتکەی درەوشانەوەی کتێبە، ئەوا پۆست مۆدێرنیزم قۆناغێکی پاشترە. بە مانایەکی تر پۆست

مـــــۆدێرنیزم ســـــەرەتای شـــــتێکە *beginning*, وەرچـــەرخانی یەکلاکـــەرەوەی دووەمـــە لەمێـــژووی مرۆڤایەتیـدا, وەرچـەرخانێك کـە شـوێن پەنجـەی بەســـەر شـــێوازی خـــەزنکردنی زانیاریـــەکان و دەسـتکەوتن و گەیاندنیانــەوە بەجێـدێڵێ, پۆسـت مـۆدێرنیزم ئـەو چـرکە سـاتەیە ئـەلفوبێی نوسـراو پـاش ئـەوەی لـەدوای قۆنـاغی زارەکـی دەسـەڵاتی گرتبـوە دەسـت-ڕێگــە خۆشــدەکا بــۆ ئــامرازە ئەلەکترۆنیـــەکان, چـــونکە ئێســـتا تەلـــەفزیۆن و کۆمپیوتەرو ئامێرەکانی تۆمارکردن ڕۆڵی نوسین و کتێـب و کتێبخانـەکان دەبیـنن. تـا ئێسـتا نـازانین داخـۆ عاقیبـەتی ئـەم وەرچـارخانە چیە؟ بـەڵام زۆر لەوە دڵنیاین کە وەرچەرخانی یەکەم لـە زارەکییـەوە بۆ نوسین یادەوەری و بیرکردنـەوەو خـەیاڵی مرۆڤی لەبنـــەوە گـــۆڕی. چـــونکە تەنانـــەت لـــەکولتوری ئەبجەدیەتی نوسراویشدا نەخوێندەوار بەشێوەیەك بیردەکاتـەوە کـە نائاشـنایە بەشارسـتانیەتی زارەکـی تەواو.

واڵتـەر ئـۆنگ *walter ong* (1982) پێـی وایـە ڕەنگــە چــاخی ئــەلیکترۆنی هاوتــای "قۆنــاغێکی باڵاتری زارەکی" بێت, قۆناغێك کە پشت نابەستێ بـەوێناکردن (تصـوید) و تێگەیشـتنی ئەبسـتراکتی نوسـین بـەڵکو زیـاتر پشـت ئەسـتوورە بـەحیکاتی گێـــڕدراوەو وێنـــەی روونکـــاری و سەرکێشـــی پاڵەوانـەکان, چـونکە ئـامێرە بیسـتراو و بینراوەکـان کاردەکەنـە سـەر نـاخی وەرگـرو توانـای سـەرنجدانی زەیـــنی لێوەردەگرنـــەوە. لەئەنجامیشـــدا ئێمـــە کەلـەپورێکی ڕۆشـنبیری بـاو بـەفێرپوو نـادەین وەك رەخنەگران لەتەلەفزیۆن دەڵێن, بەڵکو دەقە پەنهان و لێئاڵاوەکان *intertext* جێگەی دەگرنەوە کە لەهـەموو جیهاندا بڵاوبوونەتەوە. کێ لە ئێمە-بەلانی کەمـەوە لەخۆرئاوا- میکی ماوس, ئەلفیس بریسلی, زنجیرە فیلمـەکانی جـەنگی ئەسـتێران *Star wars* و تیپـی *Beatles*.. ناناســـێ؟!. لەگەرمـــەی ئـــەم هەڵمەتـــە ڕۆشنبیرییە نوێیەدا هونەر چەندین هەوڵی ئەزمونی خســـــتۆتەگەڕ بـــــۆ بـــــەکارهێنانی بەرهەمـــــە ئەلەکترۆنیـەکان بـەجۆرێك لەگـەڵ دۆخـی فیکریـی نوێی چاخی تەلەفزیۆندا بگونجێ.

لەکاتێکـدا ڕۆمـانی پۆسـت مـۆدێرن پشـت ئەســـتوورە بـــە دەرهاویشـــتەکانی کولتـــوری جەماوەری, پەنای بردووە بۆ تەکنیکی وەرچەرخانە کتوپڕەکـان *abrupt transitions*, ئـەو کەسـایەتیانە تـــەوزیف دەکـــا کـــە لەکتێبـــە تـــەنزئامێزەکان وەرگـیردراون *comic book characters*, هـەروەها بنیـاتی چـنینی میلـۆدرامی *melodramtic plotting* وەك لەهەردوو ڕۆمانی پینچۆن (*V: pynchon*) و (*the crying of lot, 49*) بەدیدەکرێ. گرفتێك کە دێتەگۆڕی ئەوەیـە: ئایـا ئـەم نمونـە مەعریفییـە ئەلەکترۆنیانـە وەرچـــەرخانێکی تـــرن لـــە ئـــەدەبی خـــوێنراوە و نوسـراوە و بـۆ قۆنـاغێکی زارەکـی کـە تەلـەفزیۆن تیایدا باڵادەستە، قۆناغێك کە پانتایی نێوان وەرگر و پەیامەکـــە دەســـڕێتەوە؟ (جیمســـۆن *Jameson*، 1984). ئێسـتا نـاتوانین وەڵامـی ئـەم پرسـیارە بدەینەوە" چونکە وەسفکردنی (ئۆنگ) بۆ ئەم چاخە بەوەی چاخێکی ئەلەکترۆنییە تا ئێستا نوێیە" بەڵام لەگـــەڵ ئەوەشـــدا تێبـــینی دەکـــرێ کـــە شـــێوازی بیرکردنــەوەمان بــەم وەرچــەرخانە نوێیــە گــۆڕانی بەسەر هاتووە هـەر وەك چۆن گۆڕان بەسـەر مرۆڤدا هـات کـاتێ لـەقۆناغی زارەکییـەوە وەرچـەرخا بـۆ قۆناغی نوسین. ڕەنگە پێویست بکا سەرلەنوێ لەو مانـا پۆشـراوە وردببینــەوە کــە لەســەرەتای ئــەم بەشەدا باسمان کرد (وتەی *poste* لەفەرەنسیدا واتە ئامێری تەلەفزیۆن بەرامبەر "پاش" *post*) تا لەسـەر ڕەهەنـدەکانی پۆسـت مـۆدێرنیزم بوەسـتین و بـزانین

تەڵەفزیۆن چۆن پەیوەندی دەسازێنێ لەنێوان ئەزموون و کایە مەعریفیە جیاوازەکاندا کە جاران لەیەکتر دووربوون" هەروەها تا دەرفەتی ئەوەمان هەبێ شێوازی بیرکردنەوەی نوێ لەچاخی ئەلەکترۆنیدا تەفسیر بکەین, کە شێوازێکە پشت ئەستوور نییە بە سۆراخکاری (الاستقراء ***induction***) و (ئەنجامخوازی ***deduction***), بەڵکو لەسەر گەیاندن ***Conduetion*** دامەزراوە (ئەڵمەر ***Ulmer***, 1984).

**گەڕانەوە *The Return***

"لەژیاندا وارهاتووین کە بەرهەمهێنانی هونەرێکی بەرز کارێکی گران و زەحمەتە, بەڵام چێژ وەرگرتن لەو هونەرە لەسایەی مۆدێرنیزمدا بووەتە کارێکی سەختتر لەبەرهەمهێنان, مرۆڤ خوازیاری ئەوە بووە ئەو چێژو خۆشییەی پێبگا کە باشترین کاری هونەری مۆدێرن دەیبەخشێ, بەڵام ئەو کارانە هەمیشە لەئاست ناخ و دەروونی مرۆڤەکاندا سەرچاوەی ئاڵۆزی بوون. هونەری مۆدێرن هەر دوژمنی پێوەرەکانی جوانسازی بووەو هەرواش دەمێنێتەوە".

(کلیمنت گرینبرگ ***Clement Greenbrg***, 1980, ل14).

"-پرسیار: ئایا مانای هونەری پۆپ ***pop art*** ئەوەیە؟

=وەڵام: بەڵێ, واتە چێژ لەهەموو شتێك ببینی."

(ئاندی وارهۆڵ ***Warhol*** لە ***Swenson***, 1963).

یەکێك لەرێگا باشەکان بۆ تێگەیشتن لەپۆست مۆدێرنیزم بریتیە لەبیرکردنەوە لەچێژ ***pleasure***, مۆدێرنیزم لەسەردەمی مانێ-وە ***Manet*** بۆ سەردەمی ڕۆمانی نوێ ***nouvean roman*** دروشمی سکهەهڵگوشین-ی بەرزکردۆتەوە, ئەم دروشمە لەچەند پێوەرێکدا دەرکەوتن وەك: مەبەستێکی عەمەلی دوور لەرازاندنەوەو جوانکردن, گوزارشتێك کە زیادەڕۆیی نەکا لەسۆزو عاتیفەدا ***sentimentality***. لەبواری پراکتیکیشدا ئەم هەڵوێستە تەرجەمەکرا بۆ وردە وردە کشانەوە لەوێنەکێشانی تابلۆی رەمزی و دانانی ئاوازی لێکدراو و ئەو رۆمانەی کە پشت ئەستوورە بەگێڕانەوەو حیکایەت و شیعری لیریکی کە هەڵقوڵاوی ناخی هونەرمەندن, ئەو رێ و شوێنانە کانگاکانی چێژو لەزەتی وشك کردو کۆتایی بەجوانییە دەگمەنەکان هێنا هەر وەك شنایدەر ***sShneider*** (1971, ل104) دەڵێ. بەڵام ئەو مۆدێرنیزمەی کە مۆرکێکی ئایدۆلۆجی چەپی هەبوو هەمیشە گومانی لەپێکەوە کۆکردنەوەی چێژو ئایدۆلۆجیا دەکرد, پاشان-هەر وەك پیشەی هەمیشەیی فلۆبیر کە لەباوکە پزیشکەکەیەوە دەربڕینێکی مەجازیی وەرگرتبوو-ئەو مۆدێرنیزمە بانگەوازی دەکرد بۆ قرتاندنی ئەو بەش و توخمانەی کە زەوقلی بوون و چێژیان دەبەخشی. لەسەر ئاستی جیاوازی سیاسەتیش لقێکی تر لەلقەکانی مۆدێرنیزم پێی وابوو زەوقی جەماوەر زەوقێکی کاڵ و کرچ و نزمە بۆیە داوای خۆداخستن و خۆئاڵۆزکردنی کرد تا بەئاسانی هونەر چنگ نەخرێ. ئاشکراترین وتەزا کە گوزارشت لەم هەڵوێستە دەکا قسەکەی مالارمێ-یە:

"ئێستا دۆخەکە ترسناکە: خەڵکی دەخوێنن و فێردەبن, رێچکەو فەلسەفەکان خەریکن بڵاودەبنەوە. کەواتە ئەی شاعیران! وریابن نەبادا پروپووچی لە ئەخلاقەوە بگوازرێتەوە بۆ هونەر, کۆششەکانتان بەو ئاراستەیەدا نەبەن کە

کەسایەتیتان مەسخ ببیٚ و بچیٚتە سەر شیٚوەی شاعیری چینی کریٚکاران.

ریٚگە بدەن خەڵکی ئەو کارانە بخویٚننەوە کە گوزارشت لەئەخلاق دەکەن, بەڵاٚم سویٚندتان دەدەم بەئاسمان ریٚگەیان مەدەن شیعرەکانمان گەندەڵ بکەن.

هەر وەك چۆن پیٚشتر سەربەرزبوون, ئیٚستا سەربەرزتر بن و نەفستان بەرزبیٚ.".

(*1968, (1862) P. 202*).

بەڵاٚم سەرەڕای ئەم دۆخە تا ئیٚستا چیٚژ لەدەوری هەندیٚ لەسەختترین کاری مۆدیٚرنیست ئاڵاٚوەو-وەك هەموو ئەو زاراوانەی کە مشت و مڕی زۆر هەڵدەگرن- بەپیٚوەریٚکی دوو ڕوو مامەڵەیان لەگەڵدا دەکریٚ. وەك ئەوەی ئەو کارانە لەلایەکەوە جۆریٚك لەئاڵۆزی بەکاربیٚنن کە لەسەرو زەوقی خەڵکەوە بیٚت, لەلایەکی تریشەوە موغازەلەی پیٚوەرە ئیستاتیکیەکانی کلاسیکیەت بکەن. بەمانایەکی تر لەیەك کاتدا داوای سکهەڵگوشین و چیٚژیش دەکەن. بریٚخت نمونەیەکی دیاری ئەو هەڵویٚستە کۆدژەیە, ساڵی 1926 دوای ئەوەی دیدە بەناوبانگەکەی خۆی سەبارەت بەنامۆ بوون لەشانۆدا *alienation effect* خستەڕوو نوسیویەتی: "ئامانجی من کارکردنە بەشیٚوازیٚکی تەقلیدی, ساردو زیرەکانە بۆ مەبەستیٚك کە لەنمایشەکەدا هەیە" هەروەها بۆ ئەو دیکتاتۆرانە دەنوسم کە حەز دەکەن ختوکەی هەست و سۆزیان بدەی". بریٚخت لیٚرەدا هەڵویٚستیٚکی مۆدیٚرنی روون و ئاشکرا وەردەگریٚ" بەڵاٚم پاش بیست و دوو ساڵ, دیدی خۆی دەگۆڕیٚ و دەڵیٚ: "هەر لەسەرەتاوە ئەرکی شانۆ وەك هەموو هونەرەکانی تر ئەوە بوو زەوقی خەڵك ببزویٚنیٚ.. لەبەر ئەم هۆیە دەبوو شانۆ کیبریائی خۆی بپاریٚزیٚ, (بەڵاٚم) شانۆ پیٚویستی بەهیچ مۆڵەتیٚك نییە جگە لە زەوق بزاواندن, کە پیٚویستە کۆششی بۆ بکا".

(*Brecht*, چ *1964*, ل *14*, *180*).

بەهەرحاڵ مەبەستی بریٚخت ئەوە بوو کە نامۆبوونی شانۆیی پیٚڕەوبکا, بەڵاٚم خۆبەدوورگرتنی مۆدیٚرنیزم لەهەر چیٚژو لەزەت بەئەندازەیەك پەرەی سەند کە لەویژدانی جەماوەردا جیٚگیر بوو. واتە ئەو خەڵکەی کە لەبنەڕەتدا دژی ئەو جۆرە کارە پیٚشەنگە بوون, ئەوانیش راهاتن بەجۆریٚك- هەر وەك یەکیٚك لەهونەرمەندەکان دەڵیٚ- خەڵکی وای لیٚهاتبوو لەناسکی و جوانی دەترسا (ئینۆ *Eno*, 1981, ل 52) لەم سەرووبەندە سواوەی مۆدیٚرنیزمدا, پۆست مۆدیٚرنیزم گرنگترین شیٚوازی هونەریی خۆی بەرهەمهیٚنا: تابلۆی نیگاری بەرجەستە, حیکایەتی ئاشکراو بیٚ پەردە, ئاوازی مۆزیکی سانا. هەروەها جۆریٚك لەسۆزو عاتیفەی بەکارهیٚنا *sentimentality* لەکاتیٚکدا مۆدیٚرنیزم- هەر وەك رۆلان بارت دەڵیٚ: ئەو جۆرە بەکارهیٚنانەی بەریسوایی دەزانی.

وەرچەرخانی هونەری و ئەدەبی پۆست مۆدیٚرنیزم وەرچەرخانیٚکە لەگوزارشتگەری ئەبستراکتەوە (التعبيرية المجردة) بۆ هونەری پۆپ, لەرۆمانەکانی رۆب گریٚ-وە *Robbe Grillet* بۆ نوسینەکانی ئەدیبی ئەرجەنتینی لویس بۆرخیس *borges*, لەمۆزیکی جازەوە بۆ "رۆك ئاند رۆڵ", واتە گەڕانەوە بۆ ئەو شتانەی کە قوتدانیان ئاسانە. بەڵاٚم ئەڵبەتە جۆریٚکە لەساویلکەیی گەر لەم گۆڕانەدا بەدوای ئەو هۆکارانەدا بگەڕیٚین کە پرنسیپ بۆ چیٚژی رۆشنبیریی یان یاسای لەزەتی هونەری دەسەپیٚنن" بەڵکو-فرۆید وتەنی-بریتییە لەگەرانەوە بۆ دیوە چەپیٚنراوەکەی تری مۆدیٚرنیزم, گەڕانەوە بۆ کولتوری جەماوەری و زەوق بزواندن

لەڕێگای فیلمی کارتۆن، چیرۆکی پۆلیسی، ڕۆمانی زانستی، گۆرانیو ئاوازی خێراو ئامادەکردنی قوتوی شلەمەنی (موعەلەب) بەجۆرێکی هونەری. گەر مۆدێرنیزم ئەو دیاردانەی داپڵۆسیبێ کە ختوکەی هەستو سۆز دەدەن و چێژ بەخشن، هەروەها بەگوێرەی چەند بنەمایەکی ئیستاتیکی ئەو دیاردانەی رەتکردبێتەوە، ئەوا پۆست مۆدێرنیزم بوون و چێژی خۆی لەوانەدا دۆزییەوە، وەك ئامرازێك بۆ یاخیبوون لەقەیدو مەرجەکانی نوخبەی مۆدێرنیستو نزیکبوونەوە لەکانگای لەزەت و تێکشکاندنی یاساغە کولتوریەکان.

(کار یان دەق)ی دوو ڕەگ ***The Hybrid***

"لەرابردوودا هەمیشە ڕۆمان ***novels*** بوونی نەبووە، پێویستیش ناکا لەئەمڕۆدا هەر هەبێ" تراجیدیا ***tragedies*** و داستانی مەزن ***great epics*** هەمیشە بوونیان نەبووە، فۆرمەکانی شیکردنەوەو تەرجەمە نەبوون، تەنانەت گەمەکانی ساختەکردن لەپەراوێزی ئەدەبدا بوونی نەبوو" بەڵام ئەم شتانە هەموویان پێگەیەکیان بە بەرهەمی فەلسەفیو ئەدەبی نوسراوی عەرەبو چیندا هەبوو. زانستەکانی ڕەوانبێژی هەمیشە دەست کورت نەبوو، بەڵکو شوێن پەنجەی زۆریان بەسەر کەرتەکانی کەلەپووری ئەدەبی کۆنەوە بەجێهێشتووە. لێرەوە دەبێ خۆمان رابێنین لەسەر ئەوەی کە ئێمە لەئاست پرۆسەیەکی بەرفراوانی بەرهەمهێنانەوەی فۆرمە ئەدەبیەکاندایین، هەروەها تواندنەوەیان لەبۆتەیەکدا کە توخمی زۆربەیان لەبەین دەباو سنوری جیاکەرەوەی نێوانیان دەسڕێتەوە، ئەو سنورەی کە زۆرجار بیرکردنەوەمانی جڵەوکردووە".

(واڵتەر بنیامین ***Benjamin*** (1934)، 1979، ل 224)

"ئاشکرایە بارتو درێدا ئەدیبن، نەك رەخنەگر، کاتێ خوێندکاران دەیان خوێننەوە".

(ڕۆزالیند کراوس ***Rosalind Krauss***، 1981، ل40).

رێگایەکی باش بۆ خوێندنەوەی پۆست مۆدێرنیزم تێرامانە لەرۆمانی جۆلیان بارنز ***Julian Barnes*** "توتی فلۆبێر" ***Flauberts Parrot*** ، کە لەبنەرەتدا ڕۆمانێکە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست نەهێناوە. ڕۆمانی "توتی فلۆبێر" چیرۆکێکی خەیاڵییە پاڵەوانەکەی جیفری بریسویت-ی چیرۆکبێژە کە فلۆبێر جڵەوی مێشكو خەیاڵی کردووە. بەڵام تەوەری ڕۆمانەکە لەبابەتێکی ساکارەوە دەچێتە سەر چەند وردە بابەتێکی خێراو بەهێز کە خۆیان نادەن بەدەستەوەو تێکەڵی گێرانەوەو بیۆگرافیاو ڕەخنە دەبن، لەچەند وێنەیەکی تێکەڵدا بەرجەستە دەبن: هەندێ جار چەند مێژوویەك پێشکەش دەکەن بۆ چەندرووداوێکی جیاواز کە ژیانی فلۆبێر وەردەگرێ سەبارەت بە جیهانی ئاژەڵان (بە تایبەتی ورچ)، هەندێ جاریش باس لە یازدە پەیوەندی دەکا کە فلۆبێر دەیبەستێتەوە بە شەمەندەفەرەوە (چونکە ئەو ڕقی لە شەمەندەفەر بوو، هەرچەندە پێویستی پێبوو بۆ جێبەجێکردنی کارەکانی و پەیوەندییەکانی بە ئافرەتانەوە)، هەروەها هەندێ جار پشتدەبەستێ بە فەرهەنگی بیرۆکە بەربڵاوەکان دەربارەی فلۆبێر (ڕقی لە مرۆڤ بوو)، هەندێ جاری تریش قسە لە تاقیکردنەوەیەکی رووکەش دەکا.. وهتد. ئامانج لەم تێکەڵکردنە داهێنانی فۆرمێکی نوێ نەبوو بەڵکو زیاتر هەوڵێك بوو بۆ سەلماندنی توانای دانەر لە دەرخستنی مەعریفە و نمایشکردنی "لەو شوێنەوە کە مرۆڤ حسابی بۆ ناکا" وەك بارت دەڵێ (1986، ل 242). بەم

تەکنیکە ڕۆمانی "توتی فلۆبێر"، کە بەڕەسمی نە بیۆگرافیا و نە ڕەخنە بوو، توانی ئەنجامی خۆی بپێکێ و مەعریفەیەکی هەمەڕەنگ پێشکەش بکا، کە لە خوێنەران وەریگرتبوو، بە شێوازێکی ڕۆمانئامێزی خاکی.

بەڵام کتێبی *S/Z*-ی بارت، کە لە بنەڕەتدا لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەییە، ڕەواجێکی گەورەی لەسەر ئاستی ئەکادیمی بەدەستهێناوە، شیکردنەوەیەکی درێژ پێشکەش دەکا دەربارەی کورتە چیرۆکی "ساراسین *Sarrasine*"(7)ی بەلزاک. بەڵام مەبەستی کتێبەکە لە بنەڕەتدا لەو برگە ناونیشاندارانەوە هەڵدەقوڵێ کە چەند برگەیەکی سەیر و خێرا و نەرمن، شیکردنەوەی دەق *Explication de texte* یان تێدا هەڵدەوەشێتەوە لە ڕێگای "چەند توخمێکی گێڕانەوەی خەیاڵییەوە" (بارت، 1986، ل 289)، بەدیاریکراوی لە چەند چیرۆکێکی تردا کە مانای حەرفی وشەی *Sarrasine* ئاماژەیان بۆ دەکا و خەیاڵی خوێنەریان پێ ڕووناکدەکاتەوە تا لە مەبەستەکانی گێڕانەوەی ڕۆمان تێبگا. ساراسین پاڵەوانی کورتە چیرۆکەکەیە، بۆ یەکەمین جار ژوانێکی بۆ ڕێکدەکەوێ لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا، لە دۆخێکی ترسناکدا دەژی، کەسێکی نامۆ لێی نزیکدەبێتەوە تا ئاگاداری بکاتەوە لەو هەڵە زۆرانەی کە ڕەنگە لەو ژوانەدا ڕووبدا. پاڵەوانەکە دوو دڵە، بەڵام بارت لە برگەیەکدا بە ناونیشانی "مەبەستی چیرۆک" باس لەوە دەکا داخۆ ئەگەر پاڵەوانەکە نەچێ بۆ ژوانەکە چی ڕوودەدا (ئەڵبەتە چیرۆکەکە تەواو دەبێ).

برگە شیکاریەکانی کتێبی *S/Z* ڕێ و شوێنێکی ڕەخنەیی پێڕەو دەکەن کە پشتئەستوورن بە سیستمێکی دەگمەنی نیشانەکانی ژمارەدانان بە پێی ئارەزووی نوسەر (بۆ نمونە هەندێ جار ژمارەی عەرەبی و ڕۆمانی، هەندێ جار کورتکردنەوە، هەندێ جاریش ئەو ئەستێرانە دادەنێ کە دەلالەت لە بابەتە لابراوەکان دەکەن، هەروەها پیتی لار و نەخشاندنی وشەکان بە پیتی گەورەی تاجدار). بارت لەو کتێبەدا چەندین میتافۆر و خوازە کۆدەکاتەوە: دەق دەبێتە "پرچ *braid*"، "تۆڕی زانیاریەکان *network*"، "سیستمی تەلەفۆن *telephon system*"، "گرێبەست *contract*" و "نۆتەی مۆزیکی *Musical score*". لە ڕاستیدا *S/Z* بە پێی پۆست مۆدێرنیزم کاردەکا، کارە هونەرییە ڕەسەن و ئامادەکان هەڵدەوەشێتەوە *readymade* و دووبارە بە دیدێکی نوێوە دایاندەڕێژێتەوە کە بە خەیاڵی دانەرە ئەسڵییەکەدا نەهاتووە، بارت ئەم کارەی کرد کاتێ کورتە چیرۆکەکەی بەلزاک-ی لە پێگەی تەقلیدی ڕۆمان لابرد و سەرلەنوێ بۆ پێڕەوەکانی خۆی بەرهەمهێنایەوە لەسەر هەمان شێوازی دەرهێنەری دانمارکی (سیرك).

گەر ڕۆمانی "توتی فلوبێر" چیرۆکێکی تێکەڵ بە شیکردنەوەی ڕەخنەیی بێ/ ئەوا کتێبی *S/Z* بە پێچەوانەوە شیکردنەوەی ڕەخنەیی تێکەڵ بە گێڕانەوەی ڕۆمان کردووە. ئەم پرۆسەیە لە هەردوو کارەکەدا لە کاری تۆمارکردنی نوێی دەنگ دەچێ کە دەنگدانەوە *reveberation* تێکەڵ بە خاوکردنەوە *delay* و چڕکردنەوە *compression* و کۆرسی دەستەجەمعی *chorusing* و ئاماژە موزیکییە جێگیر و دووبارەکان *Straight*.. دەبێ و لە کۆتاییدا هەموویان بەناویەکدا دەچن. ئەوەی بارنز *Barnes* ئەنجامی داوە هیچ نییە جگە لە هەمەڕەنگییەکی چڕ سەبارەت بە ژیاننامەی فلۆبێر کە لە چیرۆکی پاڵەوانی ڕۆمانەکەدا دەنگدانەوەی هەیە، ئەو چیرۆکە وەك دیوارێك وایە کە نزیك دەکەوێتەوە، هەندێ جاریش دوور دەکەوێتەوە تا زەبزەبەی ئەو

دەنگدانەوەیە ڕێکبخا. بە هەمان شێوە بارت کارێکی لەو جۆرەی کرد کاتێ چەند هەمە جۆرییەکی گێرانەوە و چەند بابەتێکی تری سەبارەت بە سەرکێشیەکانی "ساراسین"ی پاڵەوان خستە نێو تەونی کورتە چیرۆکەکەی بەلزاکەوە بە مەبەستی تێگەیشتنی. ئەم دوو کتێبە و هەموو نوسینەکانی پۆست مۆدێرنیزم بە گشتی ئەو حوکمی ئەفلاتۆنیان بەسەردا جێبەجێ دەبێ کە کاتی خۆی دەریکردبوو بەوەی جیاوازی کردبوو لە نێوان دوو جۆر گوتاری ڕۆشنبیریدا: گوتارێکی بەرپرسیار کەمەعریفە ئاشکرا دەکا و دەیگەیەنێ، گوتارێك کە بەرپرسیار نیە و هونەرەکان ئەنجامی دەدەن. یەکەمیان ئاشکرا و یەکانگیر و ئەقلانییە و گوتاری فەیلەسوفەکان و دەستە بژێری کۆمەڵگایە" بەلام دووەمیان گوتارێکی نزمە تایبەتە بە هونەر و سنعەت و ئەدەبی خەیاڵی و وێنەگرتن و نیگارکێشان. پۆست مۆدێرنیزم تێکەڵێکە لەو دوو حاڵەتە: فیکر لە چوارچێوەیەکی ئیستاتیکیدا پێشکەش دەکا و هونەریش لە چوارچێوەیەکی فیکریدا. سەرەنجام دەقی دووڕەگ *hybrid text* خۆی بەرهەم دێنێ و دەلالەتی ڕۆشنبیری نوێ لە ڕێگای کارلێکی ڕەگەزەکان لەگەڵ شیکردنەوەی ئەو ڕەگەزانەدا دێتە بوون، ئەمەش ئەو پرنسیپیە کە پۆست مۆدێرنیزم باوەڕێکی ڕەهای پێهێناوە.

هونەرمەند و ڕەخنەگر هەردووکیان پێکەوە ئارەزوی دەقی دووڕەگ دەکەن و پێویستیان پێیەتی. "من ویستم دیسانەوە نیگارکێشان بخەمەوە خزمەتی فیکر" ئەمە قسەی دووچامپ-ە لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا وەك گوزارشتکردنێ و ئارەزوویەك بۆ گۆڕینی ئەو دیدە باوەی کە بە چاوێکی نزم دەڕوانێتە نیگارکێش (لە زمانی فەرەنسیدا *bete comme un peintre*). هەروەها ڕەخنەگریش ئارەزوی ئەوەی دەکرد شادبێ بەو "لەزەت و خۆشییەی لە دەقدا هەیە" و ئەو شەهیەتەی کە هونەر هەیەتی. دریدا دوای لاپەڕەو نیوێك لە وتارێك کە سەد و هەشت لاپەڕەیە، ئەو سەرنجانە دەخاتە ڕوو کە بەڵگەن بۆ ئەو شتەی ڕەخنەگری پۆست مۆدێرنیست بۆی دەگەڕێ، لەوێدا دەڵێ: "دوای ئەوەی بەلێشاو هەموو شتەکانمان باسکرد، پێویستە خوێنەر سەبرمان لەسەر بگرێ ئەگەر هاتوو درێژەمان دا بە قسەکانمان و غەریزەکانی گەمەکردن جولاندینی و ئەو شتانەمان نوسی کە لە بەردەممانـدا قوت دەبنەوە" (1981، ل 65).

ئەم هاندەرە لە پشتی زۆربەی دەقەکانی پۆست مۆدێرنیزمەوە بوون، کە ژماردن و پۆلێنکردنیان کارێکی زەحمەتە، لەو کارانە بۆ نموونە: وێڵگاکان *Labyrinths*-ی بۆرخیس، گەڕیدەیەك لە شەوێکی زستاندا *If on Winters Night a Trareller* -ی کالڤینۆ، *Glas*-ی دریدا، قسەی عاشق *Discource Lovers*ی ڕۆلان بارت، *Tristes Tropiques*ی لیڤی شتراوس، فیلمەکانی گۆدار *Godard*، کتێبەکانی کێگ *Cage*، هتلەری ئێمە-ی سیبیربێرگ *Our tlitler*، *Syberberg* و لێکچەرەکانی لاکان *Lacan*و ...هتد. ئەم کارانە بە گشتی و بەجۆرێك لە جۆرەکان ئەو بەهایانە بەرز دەنرخێنن کە لەگەڵ بەهاکانی مۆدێرنیزمدا دژن، وەك: ڕۆشنبیریی پێشەنگ و ڕۆشنبیریی جەماوەری، جیهانە تایبەتەکان و جیهانە گشتییەکان، چالاکیە تیوری و پراکتیکیەکان. ژیانی هاوچەرخ لە هەموو دنیا دەرەنجامی ئەو حاڵەتەی بینیوە کە لە بەزاندنی سنوری ناوچە حەرامەکان کەوتۆتەوە، هەروەها تێکەڵبوونی شتە جیاوازەکان بەیەکتر و دەستدرێژی کردنە سەر ژیانی تایبەتی

مرۆڤـەکان لـە ڕێگـای شاشـەی تەلەفزیۆنـەوە، ئـەو شاشەیەی کە چەندین ملیۆن خەڵك لە نیویۆریك بە تامەزرۆوە سەرقاڵی تەماشاکردنی بوون، بەجۆرێك تـەنها لـە کـاتی دەسـت بـە ئاوگەیاندندا، پێکـەوە لـە کـاتی ریکلامـدا بـە جێیـان دەهێشـت، هـەر ئـەو حاڵەتەش بووە هـۆی گێرانی بۆریەکانی ئاوەڕۆ لە نیویـۆرك! واتـە چـۆن گوزارشت لـە حاڵـەتێکی وا لـە پاشاگەردانی دەکـرێ؟ وشـەکانی "هەڵوەشـاندنەوە *deconstruction*"، "تواندنـــــــــەوە *dissolution*" و "کردنەوە *undoing*" ئەو هەڵوێستە و پەرچەکرداری پۆست مۆدێرنیزم دووپاتدەکەنەوە دژی مۆدێرنیزم" هەروەها جۆرێکە لە وەڵام بۆ ئەو داوا کولتورییەی کە بە شوێن ڕێگای نوێدا دەگەڕی بۆ بیرکردنەوە و گوزارشتکردن لە دۆخی هەنوکەیی، ڕێگایەکە نە بە ڕۆمانێکی پەتیدا تێدەپەڕێ و نە بەوتارێکی پەتیدا، بەڵکو هەردوکیان پێکەوە کۆدەکاتەوە.

## کاری نمونەیی The Ideal Work

"دانانی کتێبی قەبارە گەورە کارێکی تاقەت پڕوکێنـە و جۆرێکـە لـە زیـادە مەسـرەفی. کـارێکی بێهودەیە گەر پێنج سەد لاپەڕە ڕەش بکەیتەوە بۆ گەیاندنی بیرۆکەیەك کە گوزارشتکردنی زارەکی لەو بیرۆکەیە تەنها چەند دەقیقەیەك دەخایەنێ!. باشتر وایە وا دەربخەی کە ئەو کتێبانە بوونیان هەیە، پاشان کورتەیەك یان ڕانانێك دەربارەیان پێشکەش بکەی. کارلایل *Carlyle* لە *Sartor Resartus*[8] دا و بەتلەر *Batler*[9] لە بەندەری جواندا *The Fair Haven* کارێکی لەم جۆرەیان کرد. هەرچەندە ئەو دوو کارە گەر وەك دوو کتێب تەماشایان بکەین کامڵ نین، بەلام ناواخنی زیادە و دووبارە بوونەوەیان لە چاو کتێبەکانی تردا زۆر کەمە. (لای خۆمەوە) ئیتر وام پێ باشە سەرنجەکانم دەربارەی کتێبە خەیاڵیەکان ئەقلانی تر و زیاتر تەمەڵی و کالێ-یان پێوە دیار بێ".

(جورج لویس بۆرخیس *Jorge. L. Borges*، 1962، ل 15-16).

باشترین ڕێگا بۆ تێگەیشتن لە پۆست مۆدێرنیزم بریتیە لە وردبوونەوە لە کتێبێك کە والتەر بنیامین پێڕانەگەیشت بینوسی. بەلام دەیویست وەك لێکۆڵینەوەیەك پێشکەشی بکا دەربارەی پاریس لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا "پڕۆژەی قەیسەریەکان *Arcades Project*"، هەر ئەو بیرۆکەیە بووە یەکێك لە بیرۆکە باوو ئاماژە بەخشەکانی فیکری هاوچەرخ. بەو پێیەی بنیامین لە ژێر کاریگەری تەکنیکی مۆنتاجی سینەماییدا بوو (ئەڵبەتە دەلالەتی کاری سینەمایی لە ئەنجامی پەیوەندییەکانی دراوسێتییەوە دروستدەبێ *Juxtaposition* لە نێوان وێنەو دەنگە پەنهانەکاندا)، هەروەها سەرسام بوو بەوەی سوریالیەکان بایەخیان بە پارچە و تەلاشی وێنە دەدا.. بۆیە بڕیاریدا کتێبێك دابنێ کە بریتی بێت لە چەندین دێڕی وەرگیراو لە بۆدلێر، وێنەی جیاواز، زانیاریی بایەتی، قسەی شایەتحاڵەکان، وێنەی کارتۆنی، چیرۆکی ڕۆژنامەوانی، بەڵگەنامەی مێژویی و چەند برگەیەك لە ئەدەبی ڕۆمان. هەروەها بەنیاز بوو کەمترین تەفسیر و ڕوونکردنەوە دەربارەی ئەو شتانە زیادبکا و تەنها چەند وشەیەکی کەم تۆمار بکا دەربارەی هەندێ لەو وێنانە و چەند برگەیەك کە بابەتە وەرگیراوەکان پێکەوە دەبەستێ" یان هەروەکو لە گۆڤارەکەیدا وتوویەتی: "میتۆدی ئەم لێکۆڵینەوەیە مۆنتاجی ئەدەبییە. من پێویستم بە ئاخاوتن نییە بەڵکو تەنها نمایش دەکەم و هیچی تر" (1983، ل 5).

بنیامین پێی وابوو توانای شیکردنەوەی ڕوونی وێنە ڕەمزیەکان *emblematic images* و ئاشکراکردنی دیوە شاراوەکانیانی هەیە (جا ئیتر وێنەی کێشراو بن یان نوسراو)، هەروەها توانای تەقاندنەوەی دەلالەتەکانی ئەو وێنانەی هەیە" هەر بۆیە پشتی بەست بە هەموو ئەو شتانەی کە هەڵیبژاردبوون، سەرلەنوێ لە نیگای خۆیەوە ڕێکی خستنەوەی تا وردەکاریەکانیان بەڕوونی دەرکەون کە "لە ئاست خوێنەردا ئاشکران وەك درەوشانەوەی خەتورەکانی یادەوەری"، پاشان مێژوی ماتریالی پاریس لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا دەردەکەوێ و بەرجەستە دەبێ. بۆ نمونە کاتێ بنیامین ویستی ئەوە بسەلمێنێ کە بزاوتە شۆڕشگێڕەکانی پاریس هەمیشە هەوڵیانداوە نکوڵی لە حەتمیەتی مێژوو بکەن و کۆسپ بخەنە بەردەم کاروانەکەی، ئەم تێبینیەی نوسی: "لە شەوی یەکەمی شەڕدا (لە شۆڕشی یۆلیوی 1830) لە یەك کاتدا تەقە لە سەعاتی بورجەکان کرا، بە جیا لە چەندین ناوچەی شاری پاریس" (بڕوانە: باك مۆرس *Back Morss*، 1981، ل 65).

بنیامین دەڵێ "مێژوو پەرش و بڵاودەبێتەوە بۆ چەند وێنەیەك نەك چەند حیکایەتێك" (1983، ل 25)، ڕێکخستنی ئەو وێنانە لە پێناو تێگەیشتن لە جیهان، لای ئەو وەك شیکردنەوەی وێنەی خەونەکان وا بوو. لە ڕۆژمێرەکەی خۆیدا قسەی نوسەرێکی تری وەرگرتووە کە دەڵێ:

"رابردوو چەند وێنەیەکی کاڵی لە دەقە ئەدەبیەکاندا بەجێهێشتووە، وەك ئەو وێنە فۆتۆگرافیانە واتە کە لە کاتی شتنەوەدا تیشکیان بەرکەوتووە. تەنها ئاینده زەمانەتی ئەوە دەکا کە چەند وێنەکێشێکی لێهاتوو بێن و ڕەونەق بگێڕنەوە بۆ ئەو وێنە کاڵانە". (ل 32).

لێرەدا چوار پێشنیاز پێشکەش دەکەین کە "پرۆژەی قەیسەریەکان" دەخەنە ریزی کارە پۆست مۆدێرنەکان:

1-بنیامین خۆی، بە ئارەزوی خۆی، پاریسی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمی هەڵبژارد، واتە ئەو کات و شوێنەی کە لە دایکبوونی مۆدێرنیزم-ی بەخۆوە بینی. ئەو کاتە لە قەیسەریەکانی پاریسدا (کە یەکەمین بازاڕی بازرگانی بوون) کولتوری بەرخۆری (استهلاك) دەستیپێکرد. لە کاتێکدا ئینگلتەرا سەرقاڵی چاکردنی بەرهەمی پیشەسازی بوو، فەرەنسا کاری بۆ بوژاندنەوەی بازاڕی سەرفکردنی بەرهەمە بازرگانیەکان دەکرد، ئیتر دەستی دایە بزواندنی ئارەزوی کڕیارەکان و چەندین هونەری لەو پێناوەدا داهێنا وەك ناوەندە گەورەکانی سەرفکردن، ڕۆژنامەوانی بازرگانی و ریکلامی وێنەیی. ئەڵبەتە لە کات و شوێنێکی وادا ئاساییە ڕەوتێکی مۆدێرنیستی کۆنەخواز دروست ببێ کە دژی هەر هەوڵێك بێ بۆ نابوتکردنی زەوقی باڵا، هەروەك چۆن ئاساییە ڕەوتێکی پۆست مۆدێرنیست ڕێگە بۆ خۆی بدۆزێتەوە کە بوونی خۆی لە تواناکانی کولتوری جەماوەری و وێنەگرتنەوەی میکانیکییەوە وەرگرێ.

2-میتۆدەکەی بنیامین کە بابەتی خۆی لە هەموو ئاستە کولتوریەکانەوە هەڵدەبژارد شتێك لە یاخیبوون لە خۆدەگرێ دژی باوەڕی ڕەها مۆدێرنیزم بە بەها ڕۆشنبیرییە باڵاکان، بۆیە لە مانیفێستەکەی خۆیدا ڕایگەیاند: "دزی لە هیچ شتێکی بەهادار ناکەم، ناچم بەلای ڕستە

رازاوەکاندا، بەڵکو تەنها گوفەك و شتە بێکەڵکەکان دەپشکنم". کەس بۆی نییە رەخنە لەم کارەی من بگرێ بەو بیانووەی کە بابەتەکانی بە گەندەڵی ئایدیۆلۆجی ئالوودە بوون، بەڵکو بابەتەکان خۆیان بەرگری لە خۆیان دەکەن "چونکە من خۆیان بەکاردێنم و پێویستم بەوە نییە ماناو سوودەکانیان هەڵبسەنگێنم" (بنیامین *Benjamin*، 1983، ل 5). بەمجۆرە بنیامین پێشبینی دیدێکی پۆست مۆدێرن دەکا و ئەدگارەکانی ئەو ڕێگەیەمان بۆ دیاریدەکا بۆ وەرگرتنی هەموو مەعریفە و زانستێك لە کولتور و بەها فیکر و بۆچوون و حەکایەتی خەڵکی سادەدا هەن.

3-بنیامین چوارچێوەی کارەکەی خۆی، وەك جۆرێك لە درزینی شتی کۆن و سەرلەنوێ نیشاندانەوەیان، دیاری کردووە. واتە هەمان شتە ئامادەکانی هێناوەتەوە وەك ئەوەی ویستبێتی پاشماوەکانی ژینگە پاکبکاتەوە. بەلام ئەوەی سەرنج ڕاکێشە ئەم کارەی بنیامین – هەرچەندە لە رووی لۆجیکییەوە دەگونجێ لەگەڵ باوەڕی ئازادانەی ئەو بە مارکسیزم- شتێکیش لە لەزەت و ئارەزووکردنی تێدایە، واتە ئەو بە تەواوی دەسبەرداری هونەر و ئامرازەکانی نەبووە. پاشان سوریالیەکان ڕێزیان لێناوە و ئەراگۆن *Aragon* ی چەپڕەو چەند یادگارییەکی چیرۆکئامێزی دەربارەی بنیامین نوسیوە. گەر ئەو پرۆژەیەی بنیامین لەدایکبوایە و رووناکی ببینایە دەبووە نمونەی دەقی کۆلاجی دوو ڕەگ، یان وەك ئەدۆرنو *Adorno* دەڵێ دەبووە "فەنتازیایەکی راستەقینە" لە چوار چێوە دەترازا و لە خاوەنەکەی هەڵدەگەڕایەوە (باك مۆرس *Buck Morss*، 1977، ل 129).

4-بنیامین بە هیچ جۆرێ ئەو کتێبەی خۆی نەنوسیوە، بۆیە ئازادی رەهامان هەیە کە لە خەیاڵدا وێنای بکەین و دید و بۆچوونی خۆمانی لە بارەوە بڵێین.

## پەراوێزەکان

1-شاعیرێکی ئەمریکییە (1914-1965) لە زانکۆی ناشفیل لەسەر دەستی (روبەرت وارین) و (جون رانسوم) خوێندویەتی، هەردووکیشیان لە پێشەنگەکانی "رەخنەی نوێ"ن، بۆ ماوەی دوو ساڵ لە هێزی ئاسمانی ئەمریکا خزمەتی کردووە. لەو دوو ساڵەدا چەندین پارچە شیعری دەربارەی ژیانی سەربازی و جەنگ نوسیوە. کارەکانی لە دیوانێکی گشتیدا کۆکراوەتەوە (نیویۆرك 1969).

2-شاعیر و شانۆنوسی بەناوبانگی ئەمریکایە (1917-1977)، لە ریزی "رخنەگرە نوێکان"دا بووە، چەند کارێکی شیعریی هەیە کە ڕەنگدانەوەی قۆناغە دەروونیە جیاوازیەکانیەتی.

3-نیگارکێش و پەیکەرتاشێکی ئەمریکایە (1887-1968)، لە فەرەنسا لە دایکبووە، شێوازێکی هونەریی تایبەت بە خۆی هەیە دژ بە دادایزم *Dadaism* کە لەسەر نامەعقولیەت و رەتکردنەوەی بەهاو پێوەرە ئیستاتیکیە تەقلیدیەکان دامەزرابوو.

4-چارلس ئێدوار ئڤز (1874-1954) مۆزیکارێکی ئەمریکی بوو کارەکانی داهێنانی تێدا بوو، ئاواز و ریتمی جیاواز و بگرە دژبەیەکی پێکەوە کۆدەکردەوە، تاوەکو ئاماژە بۆ شتێکی تازە بکا.

5-کۆلاج *Collage* زاراوەیەکی فەرەنسییە لە بنەڕەتدا واتە کۆکردنەوەی پێکهاتەکانی تابلۆ لە شتی جیاواز وەك پارچە رۆژنامە و جلوبەرگ و وێنەی فۆتۆگرافی و شتی تر، هەموو لە پاڵ یەکدا دەلکێندرێن بە تابلۆکەوە. ئەم زاراوەیە لە کاری ئەدەبیشدا بەکاردێت، بە تایبەتی ئەو کارانەی کە کاری جیاواز و زمانی جیاواز پێکەوە

دەسازێنیٚ، وەك لە هەندیٚ کارەکانی جویٚس و پاوەند و ئیلیوت-دا بەدیدەکریٚ.

6-والتەر بنیامین (1892-1940) فەیلەسوف و رەخنەگرێکی ئەڵمانی بەرەچەڵەك جولەکەیە، ئەدەب و فەلسەفەی لە ئەڵمانیا و سویسرا خوێندووە، بڕوانامەی دکتۆرای بە تێزێك دەربارەی رەخنەی هونەریی لە ڕۆمانسیەتی ئەڵمانیدا بەدەستهێناوە، لە ڕۆژنامەگەری و وەرگێڕاندا کاری کردووە. خاوەنی دیدێکی مارکسی بوو کە لە کتێبەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە، لە تیوریزەکانیدا دیدی ماتریالی لەگەڵ دیدی ئاینیدا کۆکردۆتەوە، کە جۆرێکە لە میتۆدی فرەکولتوری. هاوڕێیەتی لەگەڵ برێخت-دا هەبووە، هەر ئەو هاوڕێیەتییە بووە هۆی ئەوەی کتێبێك لە بارەی برێخت-ەوە بنوسیٚ، چەند لێکۆڵینەوەیەکی تری هەیە دەربارەی گۆتەو بۆدلێر. ژیان و شیعری بۆدلێر ئیلهامی ئەوەی پێبەخشی کە پرۆژەی کتێبی *Arcades Project* واتە (پرۆژەی قەیسەریەکان) ئامادە بکا کە لە بەشێکیتری ئەم لێکۆڵینەوەیەدا لە ژێر ناونیشانی (کاری نمونەیی *The Ideol Work*)دا بە وردی باسی دەکەین.

ساڵی 1940 (بنیامین) لە هەوڵی ئەوەدا بوو سنوری فەرەنسای داگیرکراو ببەزێنیٚ تا بگاتە ئیسپانیا و لەوێوەوە دەربچیٚ بۆ ئەمریکا، بەڵام پیاوانی جەستابۆ پێی دەزانن، سەرەنجام خۆی دەکوژیٚ بەر لەوەی دەستگیری بکەن.

7-ساراسین چیرۆکێکی ڕۆماننوسی گەورەی فەرەنسا (ئونۆریٚ بەلزاك 1799-1850)ە کە لە کارە مەزنەکەیدا (کۆمیدیای مرۆیی)دا هاتووە. لەو کارەدا وێنەیەکی پانۆرامایی دەربارەی کۆمەڵگەی فەڕەنسا پێشکەش دەکا لە چەند قۆناغێکی مێژویی یەك لە دوایەکدا. کەسایەتیەکانی ئەو کارە لە دوو هەزار کەس تێدەپەڕن کە دەردەکەون و ون دەبن و سەر لەنویٚ لە قۆناغی جیاوازی ژیانیاندا دەردەکەونەوە. تەوەری هەموو چیرۆکەکان بریتییە لە رۆڵی پارە لە ژیانی کۆمەڵگە و هەڵسوکەوتی تاکەکاندا. کورتە چیرۆکی ساراسین دەربارەی ژنێك دەدویٚ کە بۆمان دەردەکەویٚ پیاوە، یان نێرەموکە، هەمان ئەم کۆدژییە لە گەمەکەی بارت-دا هاتووە سەبارەت بە هەردوو پیتی *S* و *Z*: چونکە *Sarrasine* ناوێکە بۆ نێر، بەڵام *Sarrazine* بۆ میٚ بەکاردیٚ، واتە دوانەیەکی دژن لە ڕووی فۆنەتیك و دەلالەتیشەوە. هەر لێرەوە ناونیشانی کتێبەکەی *S/Z* داناوە.

8-فرێزێکی لاتینییە واتە "بەرگدروی جل دڕاو"، نوسەری ئینگلیزی تۆماس کارلایل (1795-1881) ئەم فرێزەی کردووە بە ناونیشانی نیمچە ژیاننامەیەك کە بە شێوازێکی گاڵتەجاری تەوسئامێز نوسراوە، لە نێوان هەردوو ساڵی 1833-1834 بە زنجیرە لە گۆڤاری *Frazers Magazin* بڵاوبۆتەوە. دواتر لە کتێبێکدا کۆکراوەتەوە و لە بۆستن ساڵی 1836 و لە ئینگلتەرا ساڵی 1838 چاپکراوە. بابەتی سەرەکی باس لە مامۆستایەکی فەیلەسوف دەکا کە تیورێکی هەیە دەربارەی "فەلسەفەی پۆشین و جلوبەرگ"، پێی وایە کۆمەڵگا جلێکی دڕاوی لەبەردایە کە پێویستی بە پینەکردن هەیە لای بەرگدرویەکی زیرەك کە ئەویش خۆی جلێکی دڕاوی لەبەردایە و پێویستی بە پینەکردن هەیە! یان وەکو پەندە میللیەکە دەڵیٚ "ماڵی دارتاش بیٚ دەرگایە".

9- ساموئیل باتلەر (1835-1902) نوسەرێکی ئینگلیزە لە خێزانێك لەدایکبووە کە پۆستی گرنگیان لە کڵێسای ئینگلتەرادا هەبووە، بە مەبەستی کارکردن لە کڵێسادا خوێندویەتی" بەڵام وازی لەو خوێندنە هێناوە و ساڵی 1859 کۆچی کردووە بۆ نیوزلەندا و لەویٚ وەك شوانی مەڕ کاری کردووە. پاشان گەڕاوەتەوە بۆ ئینگلتەراو ساڵی 1864 لەویٚ جێگیر بووە. چەند نوسین و نامەیەکی زانستی و فەلسەفی هەیە کە مۆرکێکی ئەدەبییان هەیە، "بەندەری جوان" یەکێکە لەو نوسینانە کە بەرگیرییەکی تەنزئامێز لە تێز و بەڵگەکانی مەسیحیەت دەکا و ساڵی 1873 دانراوە.

# رەخنەی پۆستمۆدێرن لەئایدیای گەردونگەرایی

## -ریچارد رۆرتی وەكو نمونەیەك-

سائر دیب

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

ئەڵبەت شتێكی ئاساییە كەمیللەتو نەتەوە بێچارەكان دەستبەرداری مەسەلەی تایبەتمەندی نەبنو لەبەرامبەر ئایدیای گەردونگەرایدا بەدگومان بن (بەچاوپۆشی كردنی لەوەی ئەمە كارێكی پەسەند بێت یان نا)، بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە بیری خۆرئاوایی لەڕێی ئاقاری پۆست مۆدێرنەوە، كەتەئكید لەمەسەلەی تایبەتمەندیو لۆكاڵێتی بكاتەوە، ئەویش لەچوارچێوەی رەخنەگرتنی لەگەردوونگەرایی سەردەمی رۆشنگەری.

تێزەی رۆشنگەری تەئكید لەوە دەكاتەوە مرۆڤ شایستەی ئازادیو بەختەوەریو دادپەروەریو شتی ترە، هەموو ئەمانەش لەبەرئەوەی مرۆڤە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كەسروشتێكی ئینسانی هاوبەش لەنێوانماندا هەیەو پێویستە لەبەرامبەر یەكتریدا هەست بە بەرپرسیاریتی ئەخلاقیو سیاسی بكەین، چونكە مەسەلەگەلێكی لەمجۆرە زۆر لەوە گرنگترو ترسناكترە كەجێبهێڵرێت بۆ ترادسیۆنو یاسا لۆكاڵیو ناوچەییەكان. ئەو مافو رێزلێنانەی بەشێوەیەكی هەڕەمەكی دەدرێن، دەشێت بەشێوەیەكی هەرەمەكی هەڵبگیرێت، بۆیە شتێكی لەمجۆرە ئەستەمە هیچ جۆرە ئەخلاقێكی لەسەر دابمەزرێت. لێرەوەو بەبۆچونی رۆشنگەری دەبوو دادپەروەری دووربێت لەهەر لایەنگریو جیاوازی كردنێك.

راستە ئاقاری رۆشنگەری لەپێگەیەكی تایبەتو دیاریكراوەوە سەرچاوە دەگرێت كەئەویش پێگەی بۆرژوازیەتی خۆرئاوایی سپی پێستی پیاوسالارییە، بەڵام هەموو ئاقارێك لەپێگەیەكی تایبەتو دیاریكراوەوە سەرچاوە دەگرێت، ئیتر گەردونگەرایی بێت یان نا. هەروەها راستە كەچۆن یەكی لە مافدا بەشێوەیەكی عەمەلی لەبەرامبەر هەمواندا نەبوو، بۆ نمونە وەك: (ژنانو كەسانی غەیرە ئەوروپاییو جوتیارە هەژارەكان)،

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئازادیی هەموان بووە شتێکی گرنگ لەو تیورەیەدا.

ئەمــە بەبــەراورد بــەقۆناغی پێشــوو, بــەرەو پێشچون بوو. لانی کەم ئەوانەی کۆمەڵگا سەرکوتی کردبــوون, دەیــانتوانی بەگژیــدا بچــنەوەو پــەردە لــەرووی ئــەو ئیزدیواجیەتــە هــەڵماڵن کــە لــەنێوان قسەو رەفتارەکانیدا هەیە. ئەم شێوازە لەڕخنەگرتن جیاواز بوو لەو فۆرمەی کاری تۆکمەکردنی سستمی کۆمەڵایــەتی بــوو, چــونکە رەخنــەی ئــەو بەهایانــەی دەکرد کە بەڕاستی نازانن و ئیعترافی بەڕەوایەتیان نەدەکرد.

کەواتــە دەتــوانین بڵــێین هەرچــەندە ئاقــاری گەردونگــەرایی لەســەروەختی مومارەســە کردنیــدا لەلایەن هەڵگرانیەوە بەلاڕێدا براو خراپ بەکارهێنرا, بــەڵام هــەر وەکــو چــەکێکی فیکــری دەمێنێتــەوە لەبەرامبــەر هەژمونگــەری ئــەوروپا و ئــەمریکا بەســەر جیهاندا.

لەبەرامبــەر ئایــدیای گەردونگەراییــدا, پۆســت مۆدێرن دژایەتیەکی زۆری هەر پێشێلکاریەك دەکات کــە لــەدژی تایبەتمەنــدی کلتــورە لۆکاڵییــەکان ئەنجامبــدرێت و پێیوایــە چــەمکی گەردونگــەرایی هــەموو تایبەتمەندییــەك ئافــەرۆز دەکــات و زۆر بەتونــدی پێشــێلی دەکــات, بێئاگــا لــەوەی کەئــەم چــەمکە مــەزنترین چــەمکی ئــازادیخوازیی بــووە لەمێــژووی مرۆڤایەتیــدا. ئەگەرچــی گەردونگــەرایی خــــاڵی رەشــــی تێدایــــە, بــــەڵام نابێــــت لــــە دەستنیشانکردنیدا هەر بەتەنها جەخت لەسەر خاڵە سلبیەکانی بکەینەوە..

پۆســت مــۆدێرن لەبەرامبــەر گەردونگەراییــدا جــــەخت لەســــەر تایبەتمەنــــدێتی و لۆکــــاڵێتی دەکاتــــەوەو پێیوایــــە گەردونگــــەرایی دەیــــەوێت هەمەڕەنگی و پلۆرالیزم نەهێڵێت و جیهان یەکبخات, بەمــەش دنیــا دەکاتــە جێگایــەکی پەســت و بێــزراو, لــەبری ئــەوەی کــار بــۆ قوڵکردنــەوەی جیــاوازی و تایبەتمەندییــــــەکان بکــــــات لەچوارچــــــێوەی گەردونگەرایــدا, پۆســت مــۆدێرن لــەدژی گەنــدەڵی گەردونگــــــەرایی و گەنــــــدەڵی بــــــەجیهانیبون, تایبەتمەندی وەکو چەکێك بەکاردێنێت و تەئکیدی لەسەر دەکاتەوە.

ئــەو بەدگومانیــەی پۆســت مــۆدێرن لەبەرامبــەر گەردونگەراییــدا نیشــانی دەدات, بەدگومانییەکــە لەلۆژیکێکی کلتورییەوە پێیوایە بەها ئەخلاقیەکان تــەنها لەترادســیۆنە لۆکاڵییــە ســنوردارەکاندا بەرجەستە دەبێت و هێزی ئەو بەهایانەش لەوێدایە. فەیلەسـوفی ئـەمریکایی "ریچـارد رۆرتـی" یەکێکـە لەوانەی بڕوای بەم تێزە هەیە, کە لـەمڕۆدا بەیـەکێك لـەگرنگترین بیریـارو فەیلەسـوفانی پۆسـت مـۆدێرن ئەژمار دەکرێت.

"ریچارد رۆرتی" ساڵی *1931* لەشاری نیویۆرك هاتۆتە دنیـاوەو لەهـەردوو زانکـۆی شیکاگۆ وییڵدا خوێندویـەتی و پـاش ئـەوە لـەزانکۆی برینسـتۆندا لــەنێوان ســاڵانی *1961*و *1982* دا بۆتــە مامۆســتا. لەســاڵی *1982*دا پۆســتی ســەرۆکی بەشــی زانســتە مرۆڤایەتیــەکانی لــەزانکۆی ڤێرجینیــادا دراوەتــێ, هاوکـات لەچـەندین زانکـۆی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکاو بەریتانیاو ئەڵمانیاو ئیتاڵیا و ئوستراڵیادا وانەبێژە.

سەرەتای "رۆرتی" لەبواری فەلسـەفەی زمانـدا بوو. پێیوابوو شیکاری زمـان بەشـێوەیەکی لـۆژیکی تۆکمــــە, دەتوانێــــت وەڵامــــی زۆر لەپرســــیارە فەلســــەفیەکان بداتــــەوە. ســــاڵی *1967* جــــۆرە ئۆنتۆلۆژیایــــەکی دانــــا کــــەرۆڵێکی ســــەرەکی هــــەبوو لەپێشکەشــــکردنی فەلســــەفەی زمــــان بەنەوەیــــەکی تــــەواو. بــــەڵام موفارەقەکــــە

لەوەدایە "رۆرتی" دوای ئەوەبوو بەیەکێك لەسەرسەختترین رەخنەگرانی فەلسەفەی زمان. لەکتێبی (فەلسەفەو ئاوێنەی سروشت) کە لەساڵی *1979* بڵاویکردەوە, "رۆرتی" رەخنەیەکی توندی ئاراستەی ئەو بۆ چوونە کرد کەپێیوایە ئەقڵ ئاوێنەیەکە بۆ واقعی دەرەوە (سروشت), هەروەها لەوکاتەوە دەستبەرداری گەڕان بوو لەبنەمایەك بۆ تەفسیری جێگیرو یەکجارەکی, ئەمەش خەسڵەتی فەلسەفەی نوێ بوو لەسەر وەختی "دیکارت"ەوە.

"رۆرتی" لەجێی ئەوە چەمکێکی پراگماتی بۆ حەقیقەت هێنایە ئاراو خوێنەر دەتوانێت وردەکاری ئەم مەسەلەیە لەکتێبی (دەرەنجامەکانی پراگماتیزم)دا ببینێتەوە کە لەساڵی *1982* دا نوسیویەتی. پاش ئەوەش "رۆرتی" دەستی کرد بەجۆرێك لەبیرکردنەوەی تازە لەزاراوەگەلێکی وەك: (خودو خودگەرایی و کولتور).

لەهەردوو کتێبەکەیدا: (رێکەوت و موفارەقەی گاڵتە ئامێزو هاوکاری) *1989*و (خود گەرایی و رێزگەرایی و حەقیقەت) *1991*, "رۆرتی" پێیوایە هەست کردنی فەرد بەخۆی بەپلەی یەکەم بەرهەمی پرۆسەی دروستکردنی خودە. هاوکات سەرنجی بۆ بایەخ و گرنگی ئازادی تاکەکەس راکێشاو لەبری ئەوەی ئەرکی ئەخلاقی لەسەر بنەمایەکی ترنسندنتاڵی هەڵبسەنگێنێ, پەنای بۆ ئایدیای (هەستکردن بەهاوکاریکردن) برد کە لەسەر پەرچە کرداری هاوبەش بەرامبەر ئێش و ئازارەکان دامەزراوە.

سەبارەت بە(هاریکاریکردن), "رۆرتی" دەڵێت: (ئەوانەی لەسەر وەختی جەنگی دووەمی جیهانیدا یارمەتی جولەکەیاندا, لەبەرئەوە نەبوو کە هاودینین, بەڵکو ئەوەیان بۆیە کرد کە وەك ئەوان سەر بەهەمان شاربوون یان هاوپیشە بوون یاخود سەر بەیەك گروپی کۆمەڵایەتی بوون). پاش ئەوە "رۆرتی" پرسیار لەوە دەکات کەپێویستە لەمرۆدا لیبرالیزمەکانی ئەمریکا چی بکەن تا یارمەتی ئەمریکاییە رەشپێستە چەوساوەکانی پێ بدەن: (دەبێت بڵێین پێویستە یارمەتی ئەوانە بدەین لەبەرئەوەی ئەوانیش وەکو ئێمە وان؟ رەنگە, بەڵام ئەرکی ئێمە ئەوەیە کە لەڕووی ئەخلاقی و هەروەها سیاسیشەوە وەکو ئەمریکاییەك سەیریان بکەین و جەخت لەسەر ئەوە بکەین کەشورەییە ئەمریکیەك هەبێت و بێ هیوا بژی).

رەنگە "رۆرتی" لێرەدا بیەوێت خۆی لەو چەمکە گەردونگەراییە ئەبستراکتانە قوتار بکات کەهیچی لێ سەوز نابێت, وەکو (مرۆڤگەرایی یۆنیڤێرسالی). بۆ ئەوەی بتوانین لەڕووی ئەخلاقی و سیاسیەوە کاراتر بین.

پێناچێت "رۆرتی" لەبەرئەوە دژایەتی ئەو چەمکە ئەبستراکتانەی کردبێت, چونکە راست نین یاخود ناتوانێت بانگەشەیان بۆ بکات, بەڵکو لەبەرئەوەیە ناهێڵن ئەرکە حەقیقی و بابەتیەکان جێبەجێ بکەین.

لێرەدا دەبێت هەڵوێستی "رۆرتی" لە گەردونگەرایی, جیابکەینەوە لەهەڵوێستی هەندێك لەوانەی دژایەتی گەردونگەرایی دەکەن و پێیان وایە کوشتن و رەشبگیری, رەفتارگەلێکی بەدە هەر کەسێك پێی هەڵبستێت جگە لەدیکتاتۆرەکان نەبێت کە لەسەرو یاساوەن, یاخود ئەو میللەتە دڕندانەی سستمی لەو جۆرە چاکتر شك نابەن, یان ئەوانەی وا رێ دەکەوێت کە داب ونەریتە دێرینەکانیان رێ بەو جۆرە کارانە دەدەن. لەبەرئەوەی "رۆرتی" هیچ یەك لەمانە بەڕاست نازانێت, لەسەر هەڵوێستی خۆی سور دەبێت, بێ

گوێدانــه نیــەتی ئــەم و ئــەو، بــەجۆرێك دەكەوێتــه خزمەتكردنی ئەو شتەی دەیەوێت دژایەتی بكات.

رەنگه سەبارەت بەم مەسەلەیه شتێكی بەكەڵك بێـت كـه ئـەو بۆچـونه تـەنزئامێزەی رەخنـەگری بـەناوبانگی بـەریتانی "تـیری ئیگلتـۆن" لەسـەر "رۆرتـی" باس بكـەین كـه لـه كتێبـی (وەهمـەكانی پۆست مۆدێرنەدا) هاتووه.

"ئیگڵتـۆن" سـەبارەت بەهەڵوێسـتی "ریچارد رۆرتـی" لـەو هاریكردنانـەی لەسـەر هاونیشـتمانی ئـەمریكایی دامـەزراوەو تـەریزكردنی لەئایـدیای گەردونگـەرایی، دەڵێـت: (پێموایـه تائێسـتاش هەڵوێسـتی رۆرتـی تاڕادەیـەكی زۆر هەڵوێسـتێكی گەردونگەراییانەیـــەو دواجـــار بڕێكـــی زۆری ئـەمریكایی هـەن لەهـەموو شـكڵو شـێوەو شـتێكی ئەبستراكتیشـه كـەمرۆڤ هاوسـۆزی خـۆی بـەمجۆره هەڵبسەنگێنێت.

بەهــەر حــاڵ ئەگــەر ئایـدیای گەردونگـەرایی بەشـێك بێـت لـەپرۆژەی بۆرژوازیـەتی ئـەوروپی كـەلافی ئـەوەی لێدەدا گوایـه تێگەیشـتنی تایبـەتی ئەو دەربارەی هیمانیزم، مەرجه بەسـەر هەریەكێكدا پراكتیـزه ببێـت. ئەگـەر ئەمـه یـەكێك بێـت لـەو شـــێوازانەی ئایـــدیای گەردونگـــەرایی تیـــا كورتدەكرێتـەوە، ئـەوا دەتـوانین بڵـێین رەخنـەكانی پۆست مۆدێرن لێـی تـەواو لـەجێی خۆیانـدان، بـەڵام نابێـت پۆسـت مۆدێرنـەكان كەبـەردەوام بانگەشـەی پلـوورالیزم دەكـەن، تـەنها گەردونگـەرایی لـەوەدا كۆبكەنەوەو بزانن هـەر ئەوەیـه. مەسـەلەكەش بون و نەبونی گەردونگەرایی نییه، بەڵكو كێشەو ململانێی نێـوان چـەمكه جیاوازەكـانی نـاو گەردونگـەرایی خۆیـەتی. ئەگـەر جـۆره گەردونگەراییـەكی خـراپ لـــەئارەدا بێـــت، ئـــەوا لەبەرامبـــەردا جۆرێـــك لەتایبەتمەنـدی خـراپ و نالـەباریش هەیـه. ئەگـەر گەردونگـەرایی رۆشـنگەری لەئاسـتی مومارەسـەدا ئافـــەرۆزی جیـــاوازی كردبێـــت، ئـــەوا دەشـــێت تایبەتمەنـدی ئـەتنیكی لەسـەر ئاسـتی تیـۆرەو مومارەسـەش ئـەو كـاره بكـات. كەواتـه لێرەشـدا مەسـەلەكه بـوون و نـەبونی تایبەتمەنـدێتی نییـه، هێنـدەی پەیوەنـدی بـه مەسـەلەی كێشـەو ململانێـی نێـوان چـەمكه جیاجیاكـانی نـاو تایبەتمەنـدی خۆیەوه هەیه.

## سەرچاوە


بیان الثقافة–ژماره *(109)*، بەرواری– *2002/11/10*.

# ئەدەبیاتی چیرۆک بێژی پۆستمۆدێرن

**لەری مك كافێری**

**لە فارسییەوە: عادل محەمەد پوور**

### بەستێنە و سەرهەڵدان

لەوەدا کە پاش مۆدێرنیزم بزاڤێکی یەکپارچە نەبووە، بەو مانایە نییە کە ئوسلوب گەلێکی پێگەدار و باوەڕمەندی بۆ توێژینەوەی رووکردەکان و دوابەستێنە گەل و یان هیچ چەشنە سەرچاوە و پرۆژەیەکی بۆ هێزی بزاوتن و ئەفراندن نییە. پێدەچێ ئەو شتەی کە لە هەمان سەرەتاوە بایەخێکی بناغەیی پەیا ئەکا، دەستهاویشتن بەم دەرکەتە کە جیا لە هێڵکاریە ئیختیاریەکان کە تەنیا بە کەڵکی رەخنەگران دێ، هیچ تخووبێکی دەقێق لە نێوان شمەکی مۆدێرنیزم و پاش مۆدێرنیزم نابینرێ.

بۆ نموونە، لەم باسەدا باشتر ئەوەیە کە 22ی نۆڤمبری 1963 (رۆژی تیاچوونی جون کێنێدی) وەك رۆژێکی مێژوویی لە بەرچاویگرین، کە لانیکەم لە ئامریکا بەشێوەیەکی رەسمی هەواڵ لە سەرهەڵدانی پاش مۆدێرنیزم ئەدا، چوونکای لەم بەروارەدا بوو کە کۆتایی بە چەشنێکی تایبەت لە خۆشبینی و ساویلکەیی لە زانیاریە گشتیەکانی ئێمە بە شێوەیەکی هێماگەرانە، ڕاگەیەنرا، کۆتایی بە دروستی و بڕوای ئەو خاڵانەی کە یارمەتیدەری ئێمە بوون لە بەدیهێنانی بۆچوونەکانی خۆمان لە مەڕ چۆنایەتی ئەدەبیاتی چیرۆکبێژی. ئەڵبەت ئاوا هەڵسوکەوتو بەرخوردێك، چەشنێك ساویلکەیی زێدەڕۆییە، چوونکای هەندێ ئاڵۆزکاری و نەبوونی جیدییەت کە حەساسیەتی جوانی ناسانەی دانەرانی ئەم چاخەی خستە ژێر رکێفی رەنگدانەوەی خۆیەوە، ڕیشەگەلێکی قووڵیان لە فەلسەفەدا (لە شۆڕشی کانتی، لە زانیاریەکانی ویتگنشتاین، گۆدل و ئیگزیستانسیالیستەکان) لە زانستدا (هاوکات لەگەڵ دیاردە پێشکەوتووەکانی فیزیکی کوانتۆمی، تیۆری نسبیەت، رێژەیی و ئەسڵی عەدەمی قەتعیەت) و لە شۆڕشە جوانی ناسیەکاندا هەبووە، کە لەم سەدەدا هاتوونەتە دی، تەنانەت بە شێوەیەکی زانیارانەتر لە زۆربەی زەمینەگەلێکدا ریشەیان بووە کە بە فێربوون لە بارەی نەقشێکدا پێوەندییان هەیە کە "زەینیەت"

(سوبژێکتیویته) له چۆنایەتی ڕێساگەلی فیکری ئێمەدا دەیبینیٚ.

بە فەرزی ئاوا بەستێنەیەك، سەرسوڕهێنەر نییە کە چیرۆکی واقیعگەرایانە - قاوغێك کە سەرچاوەکانی پێوەندیەکی ئەوتۆی لەگەڵ متمانە و خۆشبینی عەمەل باوەڕی و ئاوەزێتی (عەقڵگەرایی) خوراوا بوو - بۆ نووسەران کەمتر سەرنجراکێش بیٚ کە دڵەڕاوکێی (دغدغە) دەربڕینی تێگەیشتنیان لە جیهان هەیە کە پێدەچیٚ، لە چاو تاوتوو لەگەڵ هێڵکاریگەلی (پیرنگ) زۆربەی ئەو ڕۆمانگەلە کە ئێمەیان هەڵنابوو تا بە قەوام و پێشبینێتی ئیمان بێنین، قەوام و جێگری و پێشبینێتی کەمتری هەیە.

لەسەر ئەم بنەما، هێرش بە چەکی "تەقلید" یان (موحاکات کە بەدیهێنەری بناغەی ئەدەبیاتی واقیعگەرانەیە) و یان دووبارە ڕاڤەی (تاویل) ئەو چەمکە (تەقلید)، بە شێوەی یەکێك لەو روکردانە دەردیٚ کە ئەمڕۆژە بەراشکاوی لە چەکی پاش مۆدێرن پشتگری دەکەن و بە شێوەگەلێکی جۆراو جۆر بەرچاو دەکەویٚ. بۆ وێنە، چاوخشاندنێك بەسەر بریٚ لە دەق تەوەریەکانی پاش مۆدێرن - بەرهەمگەلێك وەك: $V$ی توماس پینچون، ئاوری ڕەنگ پەڕیو لە ولادیمیر ناباکۆف، جیلز گوت - بوی لە جان بارت، دەنگ نوسینەکان (واز نوشت ها) لە رابێرت کوور، چەرمووی بەفرین لە دۆناڵد بارتلمی، کۆمیدی گەلی کەیهانی لە ئلتالۆ کالۆنیۆ، سەد ساڵ تەنیایی لە گابریل گارسیا مارکیز، کوشتن خانە ژمارە 5 لە کوت فونە گوت، ژنی ستوانە فەرانسەویەکە لە جان فاولز، و چیرۆکەکانی خورخە لوئیس بۆرخێس - شاهێدی گەشەی گشتی ڕێژەی تەکنیکە ئەدەبیەکانین: چەشنێك مەستانە کایەکردن بە زمان و دانووستاندن لەگەڵ رواڵەتی دیاردەکانی چەمکی چیرۆکبێژی، چێژوەرگرتن لە خەیاڵپەروەری و سوریالیزم و روونان بەرەو نومایشی ئاشکرای کەسایەتیەکانی چیرۆکبێژی کە وان بە دوای دارشتنی گلاڵەی چارەنووسی خۆیان بە تێپەڕوانینی دیمەنە زمانە نابەکان و روئیا و چیرۆکگەلی تر.

ئەڵبەتە بایەخی ئەم جۆرە بزاڤگەرییە لە پانتایی تازەگەرییە ئەدەبیەکان لە کۆتایی دەهەی حەفتای زایینی روو بەکزی چوو، لەم سەردەمەدا، نەوەی دوایی چیرۆکبێژانی تەجروبی سەرگەرمی موتوربەکردنی تازەگەریەکانی نووسەرانی دەهەی شەست بوون بەلاٚم بە دڵەڕاوکیەکی سوننەتی تر و یان بە دەسەوەدانی تاریفیکی دووبارە لە کارایی بنەما واقیعگەرایەکان. بەرهەمێك وەك "نامەکانی جان بارت" یان ڕەنگین کەمانی جازبەی توماس پینچون لە هەڵسەنگاندندا لەگەڵ "تکایە ئەکریٚ بێدەنگ بیٚ؟" لە ریمۆند کاروور کە لە روانگەی جوانی ناسییەوە جیاوازیەکی ئەوتۆی هەیە، ئەم سیٚ بەرهەمە هەر کام لە ئاستی خۆیان بەرهەمی "پاش مۆدێرن" بە ئەژمار دێن.

گێڕانەوە مەزنەکان (روایت های بزرگ) و (دایرە المعارف) "بارت" و "پینچوون" لەگەڵ چڕی رادەبەدەری کاراکتێرە سەرەکیەکانیان، لە کۆمەڵە روانگەگەل و زەمەنگەلی سەرتاسەهێنەردا، تێپەڕیانکردووە و ئاوەژووکردنی کەلانمێژوو، زانست، ئوستوورە و فەرهەنگی گشتی لەلایەن نووسەرانەوە بەراشکاوی لە پێناوی بنەما تازەگەرییە مەزنەکان (ساختارهای ابداعی بزرگ) و چەند تۆییدا قەرار دەگریٚ کە دەتوانن بە تێپەڕبوون لە چڕی رادەبەدەری کێنایە گەل و هێماگەل و دیمەنە زبانیەکان لەگەڵ تەجروبەی زەمەنی ئێستایی چنگاوەش بن. دوای ئەوەیش، "چیرۆکە مانیمالیستەکانی" کارڤەر لە رەهەندێکی جیاوازدا،

دەگەنــە دەركــی چــەمكی ژیــانی ســەردەم: بــە پەخشانێكی پچڕ پچڕ و رووتكراو لە هەموو دیاردە جوانكاریــەكان، باریـك بوونـەوە لـە رەمـزە بچـووكە نادیارەكـانی ژیـانی ئاسـایی، نـەبوونی بـازكردنی گـرێ و یـان دوا بـەدوا هـاتنی (تـوالی سنتی) – ئـەم بابەتگەلـە ئەڵبەتـە تێڕوانینێكـی غـەیر سـوننەتین، روانینێ كە وان لە دووی وەگەڕخستنی ئامێرێك بۆ گەیشــتن بــە نوقمــایی پووچــی، ســەرگەردانی و گـومڕایی كـاراكتێرە ئاسـاییەكان وەك: كـاراكتێری چیرۆكەكانی "كاروور".

## پێشڕەوانی ئەدەبیاتی چیرۆك بێژی پاش مۆدێرن و پاش زەمینەكەی

هــەروەها كــە پێشــتر خرایــە بەرچــاو هــیچ تخووبێكی (سنووورداری) ورد شك نابەین كە بزاڤی مـۆدێرنیزم لـە پـاش مـۆدێرنیزم جیـا بكاتـەوە، وە ئەگەر رەوتـی تەشـەنە و گەشـەی ئـەدەبیاتی چیرۆك بێـژی لـە بەسـتێنەیەكی جیهانیـدا، نـە تـەنیا بـە چـاوكردن لــە ئــەو جمووجووڵــەی لــە ئــەمریكادا روویـدا، بخەینـە بـەر تیشـكی توێژینـەوە، كەشـفی جیاوازی قەراردادی دەقیق نێوان مۆدێرنیزم و پاش مودێرنیزم بە تایبەت دژوار دەبێ (دۆزە نهێنییـەكان لـە دوای تەجروبەگـەرایی باسـكراو لـە ئـەدەبیاتی چیرۆك بێژی بە فەرز ئامریكای لاتین، یان ئورووپای ڕۆژهـەلات، بـە راشـكاوی جیـاوازە لـەو مەبەسـتانەی كـە بوونەتـە هـۆی زەمینەسـازی بـزاڤێتی دانـەرانی ئامریكایی لە دەهـەی شـەتدا). پێدەچێ ئـەو شتەی كە بزاڤگـەرێتی لێشـاوەی پـاش مـۆدێرن لـە دەهـەی شەســتدا لـــە ئامریكــا هاتــە دی، تــا ڕادەیــەك گۆڕانكاریـــەكی زۆر ریشـــەیی و بنـــەڕەتی بـــوو، چـوونكای ئـەدەبیاتی چـیرۆك بێـژی ئـەم وڵاتـە لـە ماوەی سی ساڵی ڕابوردوودا، لە ئاسـتی زاڵبووندا، لـە ڕوانگـەی جـوانی ناسـانەوە، وەك ئـەدەبیاتێكی موحافزەكار خۆی دەنواند. ئەم وتە بە مانای ئەوە نییە كە لەم ماوەدا هـیچ چەشـنە تەجرووبەگەری لـە پانتـایی ئـەدەبیاتی چـیرۆك بێـژی ئامریكـادا خـۆی نەنواندووە – لەم خولەدا هەندێك لە نوێكاری مەزنی نەوەی پێشوو سەرومڕ بەردەوام بوون لـە دۆزینـەوە و كەشـفی قاوغـە نوێكـان (فالكنێر، ئێسـتاین، فیتـز جراڵـد) و ئـەژمارێكیش لـە تازەكـارانیش، رووكـرد گـەلێكی تـەجرووبیان لـە خـۆ پیشـاندا (جونـا بارنز، كێنـت پاچـین، ناتـانی وسـت، جـان هـاوكز، جـەك كرۆئــاك) بــەڵكو مەبەســت ئەمەتــە كــە دانــەرانی ئامریكایی لەم ماوەدا بە گشتی بەشێوەیەكی ساكار و راشـــكاوانە، لەگـــەڵ دیـــاردە ســـەرەكییەكانی ســـەردەمی خۆیــان هەڵســووكەوتیان كــردووە – دڵ مەنـدەیی و ناهومێـدی، شـەڕی دووەمـی جیهـانی، دڵــەڕاوكێی وجــودی – هۆكــاری نادیــاری ئــەم (محافزەكاری، خۆراگرییە) لە فۆڕمە ئەدەبییەكانـدا، پێچراوەیە، بەڵام بەشێك لە دەسەڵاتی ئەم دیاردەیـە دەبێ بە حسابی شێوەی كاردانەوەی دۆخی زەمانـە لەسەر هەندێ لـە نووسـەران بزانین، بـە تایبـەت لـەم روانگەوە كە دانەران رووبەروو بوونەوە، لەگـەڵ ئـەو دیاردە مەزنانە بۆ توێژینەوە، ئیتر لە عودەی (تفنن، گەمـەكاری) لـە ڕێـبردە نوێكاریـەكان دەرنـەهاتن. لـە هـەر حاڵـدا و بەهـەر هۆكاریـەكی بـزانین، لـە مـاوەی ســاڵەكانی 1930 تــا 1960 شــك نابــەین كــە نووسەرێكی نوێكار لە ئامریكـادا سـەری هەڵدابێ – نووســەرێك كــە هاوســەنگ بــێ لەگــەڵ بێكــت یــان بۆرخێس یـان رب گریـە یـان لـویی فردینـان سلین – مەگەر سـەرهەڵدانی یـەكێك لـە گرنگترین جارچیانی پاش مودێرن یانێ "ولادیمیر نابۆكۆف"، كە مـاوەی 20 ساڵ بە نەناسراوی لەم وڵاتەدا كاری كـرد تـا بـە هۆی جەنجاڵی لولیتا (هـەر چەن بە هۆكاریگـەلێكی

یەکسەر نادرووست) کتووپڕ ناوی کەوتە سەر زاری جەماوەرەوە، سەرەنجام ئامریکای کۆتاییەکانی دەهەی پەنجا، زەمینەیەکی ئامادە کراوی بۆ شۆڕشێکی جوانی ناسانەی بۆ رەخسا، هەروەها بۆ شۆڕشێکی فەرهەنگی کە بە پەلە بە دووایدا پەلکێش بوو. ئەم دوو شۆڕشە ئەڵبەتە پێوەندیەکی ئەوتۆیان لەگەڵ ویدا هەیە.

بەشی سەرەکی "زۆرینەی" بەستێنەی عەمەلی بۆ ئەم شۆڕشە جوانی ناسانە (پاش مودێرن)، پێشتر لە پانتایی تیۆری فەلسەفە و زانستدا ئامادە بووبوو، کارە نۆژەنەکانی پێکهاتوو لە شێوەکاری (لادان لە ئەسڵی لاسایی کردنەوە (محاکات) و پێرسپێکتیوی تاك تەوەری، جەخت لەسەر کولاژ، خۆ-دۆزینەوە، ئیکسپرسیۆنیزمی زەینی (انتزاعی)، و..) و لە شانۆدا (لە بەرهەمەکانی پیراندللو، برێشت، بێکت، ژنە و تەنانەت تورنتون وایلدر)، و بایەخ پێدانی هەرە زۆری وێنەگری (عکاسی) سینەما و لە ئەنجامدا تەلەویزیۆن، جێ نشین گەلێکی (بدیل) تایبەتی خستە باوەش نووسەران، لە هەمان کاتدا ناواخن گەلێکی تریان (گرانیگاه) دەخستە بەرچاو. ئەگەر بە تیژبینییەکی تەواوەوە بڕوانینە بابەتەکە، لە واقیع دا زۆربەی ئەم نووسەرە ئەدەبیانە، "مودێرنیست" بوون کە بوونەتە هۆی تێڕوانینی تەمام و کەماڵ لە دونگەی "دووبارەنواندن" لە ئەدەبیاتی چیرۆك بێژیدا. دووپاتکردنەوە، کە لێرەدا پێویستە لە "تریسترام شێندی" یادێك بکەین کە لە هەموو رەهەندەکانەوە، جیا لە رەهەندی کاتی نووین، بەرهەمێکی تەواو "پاش مودێرن"ە، و هەروەها لە نموونە گەلێکی زۆر لە دانەرانی تر، کە دۆزێنەر (کاشف)ی زۆرینەی هەمان رێ و رەوشگەلی تەجرووبی بوون، کە نووسەرانی "پاش مودێرن" ڕێڕەوی بوون:

بۆ وێنە بنەما سورییالیەکانی "ریمۆن روسل" کە بە شێوەیەکی میکانیکی بەدی هاتوون، بەرهەمەکانی "ئالفرێد ژاری" بە دزێوکاری و تەنزە رەشی و تەماوییەکانیان، "سکە سازەکان"ی ئاندرە ژەید لەگەڵ بەخۆ- گەڕانەوەیی (خود - ارجاعیت) و خۆ - راڤەگەرییەکەی، نموودی حەقیقەتی سورییالیستی نەفس و پێوەندییەکەی لەگەڵ کۆمەڵگە لە بەرهەمەکانی "فرانتس کافکا" (ئەڵبەت ئاماژە بەوە بکەین کە کاردانەوەی کافکا لەسەر نووسەرانی ئامریکایی ئەوەندە کاریگەر و ڕێ خۆشکەر نەبووە) گێڕەوەرە فرە چەشنییەکان (راویان چندگانە) و حەقیقەتەکانی نەیار (حقیقت های رقیب) و هاوتراز لە بەرهەمەکانی ویلیام فاکنێر، وە هەروەها بەرهەمەکانی ناودارێك لەسەر لووتکەی ئەدەبیاتدا ئەدرەوشێ، یانێ "جیمز جویس" کە بڕەبڕە پشتی چیرۆکی "پاش مۆدێرن" بە ئەژمار دێ. هێزگەلێکی بەرفراوانتری کۆمەڵایەتی و سیاسی کە بوونە هۆی بزاڤێتی نوسەرانی پاش مودێرن، و چەشنێك جەخت کردن و چەقبەستن (تمرکز) لەسەر رەوتی گەشەکردن و بەرەو پێشچوونی خۆ، لە هەندێ لایەنەوە، وەکو ئەو هێز گەلانە بوون کە لە ماوەی ساڵەکانی دەهەی بیست ئاوەها دۆزگەلێکی مەزنیان بۆ تازەگەریە هونەرییەکان پێك هێنابوو. لە هەردوو خاڵدا، تراژیدییەکی نێو نەتەوەیی - شەڕی هاوەڵی جیهانی بۆ هونەرمەندانی دەهەی بیست، و مەرگەساتی ویەتنام (و کۆمەڵێك ئاڵۆزکاری تر وەك مەترسی تەشەنەی چەکە کۆکوژەکانی هەستەیی و وێرانکاری رادەبەدەری ژینگە) بۆ نووسەرانی پاش مودێرنی ئامریکایی - ئەم هەستییە پێك هێنا کە جگە لە پێداچوونەوەی بنەمایی لە ڕێگەلی حاکم لە ژیانی خۆ، چارەیەك نییە. ئەم سیستمانە هەر ئەو

سیستمە سیاسی و کۆمەلأیەتی و ئیدیۆلۆژییەن کە ئێمەیان خستە ئەم ئێستاییەوەو هەروەها ئەو فۆرمە هونەریانە کە لەو ڕێگەیەوە دەمانتوانی تێگەیشتن لە خۆمان و پێوەندیمان لەگەڵ دونیای دەوروبەردا، بەیان بکەین.

شەڕی جیهانی ئەوەڵ، تراژیدیەکی جیهانگیری پێك هاتوو لە بەڵگەگەلێکی پێش بینی نەکراو و ئەڵبەتە زادەی تایبەتمەندگەلی کۆمەڵگایەك بوو کە ئەیویست بە ئێمە شەرەف ببەخشێ و شارستانی (تمدن)یمان بکات (ئاوەز، تکنۆلۆژی)، ئەم دیاردە بوو بەهۆی ئەوە کە هونەرمەندان هەڵنێ بۆ تێڕامان لەسەر خاڵە بنەماییەکانی ئاوەزگەرێتی و ئۆمانیستی کە بناخەی هونەری ڕۆژئاوای لەسەر دەم ڕێنێسانس بەم لاوە پێکهێنابوو.

هەڵوێستی (واکنش) پێشبینی نەکراو بەم ڕوانگە کە "واقعییەت" بە زەوی هەرزی پارچە پارچەکراو و سەراسەر ئاڵۆز گۆڕاوە"، ڕووکردن لە هونەر لە قاوغی چەشنێ کشانەوە (واپس نشینی)، هونەر وەك سەرچاوەی ئاوەز، خۆڕاگری، و تەبایی بوو (لێرەدا ئەکرێ بە شێوازە تاکیەکانی نووسەرانێك وەك جویس، بیتس، پاوند، پرۆست و هەمینگوی ئاماژە بکرێ کە بە شێوەیەکی ڕووناکمەند سەروسامان دراون). ریکارتێر، گلاڵە و گەشەی هونەری بوو کە لەسەر دڕندەیی (سبعیت) و ئاڵۆزکاری واقعییەت جەخت دەکا و خوازیاری توێژینەوە لە قەڵەمڕەوی ئینتیزاعی تر و پاوەن کراوتر (محدودتر)ی خودی هونەر بوو، قەڵەمڕەوێك کە، شاعیران دەیانتوانی بێ هیچ چەشنە چاوکردنێك بە بەڵگەکان (مصادیق)، زمان بکێشنە ژێر ئەزموونەوە، شوێنێك شێوەکاران دەیان توانی لە (دەلالەتە زمنیە رستەییەکان)، وێنەکان، چنراوەکان، و ڕەنگەکان جیا لە پێوەندییە دەرەکییەکانیان توێژینەوە بکەن. زەمینەی سێهەم، تەشەنەی ڕێبردە هونەرییەکان بوو کە لە جێی نکوڵی کردنی بێ نەزمی و (دژئاوەزی دەوروبەری، عقل ستیزی پیرامونی)، هێزە یەکگرتووەکان داکۆکیان لەسەر مەبەستگەلێکی سەرەتایی، بەدوی و نامەشروع دەکرد کە بە بۆچوونی "فرۆید" لە ناخی هەموو مرۆڤەکاندا هەیە.

ئەمە ڕێبردی دادائیسەکان و سوریالیستەکان و هەروەها ئەژمارێك لە چیرۆك بێژان (ئانائیس نین، رۆبیرتۆ دسنوس، میشل لیری) بوو. جێی سەرسوڕمانە کە ئەم سێ ڕووکردە، پاش چل ساڵ لە ئەدەبیاتی چیرۆك بێژیدا، خۆیان نواند: سەرهەڵدانی بەرهەمگەلێکی ئەستوور کە بنەمایەکی پێچراوەیان هەبوو (بەرهەمەکانی پینچوون، ویلیام گدیس، بارت دان دلیلو، کوور، جوزف مك الروی، ئەلکساندر تروکس)، سەرهەڵدانی بەرهەم گەلێك کە دڵەڕاوکەیەکی تایبەتیان هەبوو، دڵەراوکەی ساز و کار و پێداویستەکانیان، و پێوەندی تەواوی هێما و واژە (وەك: ویلیام ئێچ. گس، ریچارد کوستالانتر، رابرت پینگت، ئیستیوکاتز، دوناڵد بارتلمی)، و سەرهەڵدانی دەقە پچڕ پچڕەکان و و ڕاویەکان کە پێکهاتەکانیان (فرایند) نیشانەی ئاڵۆزی و پچڕ پچڕکاری فەزای دەرەکی بوو (بەرهەمەکانی: ویلیام ئیس، باروز، بارتلمی، ریمۆند فدرمن، کتی ئەکر). جیاوازی نێوان ئەم دوو خولە تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ ڕێژەی پێشڕەوی، پلەیەك کە نووسەرانی سەردەم تا ئەو ڕادەروویان کردۆتە ئەم ڕێبردانە، و ڕێژەی دوورە پارێزیان لە ڕێگە لە واقیعگەرایەکان (تەنانەت لە ئاسەوارێك ڕێك و پێکی لێ هاتووانەیان بە خۆوە گرتووە)، بە تایبەت بارستای نوێکاری، کایە و خۆ-شارەزایی، (ڕەهەندگەلێکی نا ئاسایی لە چیرۆکە نوێکارییەکانی دەهەی بیستدا)، کە

بناغەیان بە قاوغی ئەدەبیاتی چیرۆکبێژی پاش مودێرن دامەزراوە.

رەنگە لە سەرەتادا سەر سووڕهێنەر بێ کە ئەدەبیاتی چیرۆکبێژی پاش مودێرن، نەبێ ڕەنگ، لە ساڵەکانی پاش شەڕی دووهەمی جیهانی، بەڵکوو لە دەهەی شەستدا سەریهەڵداوە. رەنگە ئەم شەڕە لەگەڵ هیتلەرەکان و موسولینییەکانی، لەگەڵ هێرۆشیماکان و درسدنەکان و باقی کارەساتە ترسناکەکان (لە ئۆردووگای مەرگ و فەوتان، خۆکوژییە بە کۆمەڵییەکان و..) زۆر دڵتەزێن و نالەبارتر لەوەی بوو کە بتوانرێ لەگەڵیدا بەرامبەر راستەوخۆ بکرێ. لە هەر حاڵدا، نوێکارە مەزنەکانی دەهەکانی چل و پەنجا لانی کەم لە روانیندا ئەوەدا بوون ئەیانەویست نووسەرانێك، لایەنگری زانیاری تاکی خۆیان بن. بێکت، بورخێس و ناباکۆف سێ دانەر بوون لەم سەردەمەدا کە کاردانەوەی راستەوخۆیان لەسەر نویسارە پاش مۆدێرنەکان هەبوو - کۆیان ئامادە بوون تا لە پشتوانەی دنیای دەرەکی روو هەڵکەن و رووبکەنە بزاڤی دەروونی، رۆیشتن بەرەو دنیای زوبان، رۆیا و بیرەوەری و ئەزموونگەری چۆنایەتی تەجرووبەی زەین، چۆنایەتی شێوەیەك دەستەواژە لەو شێوەدا تێگەیشتنەکانی ئێمە بخەڵەتێنێ، گومرایان بکات و شکڵیان پێبدات، چۆنایەتی شێوەیەك کە خەیاڵ لەو ڕێگەدا قەڵەمڕەوی خۆی جیا لە بەستێنەی هێماکان، بونیات بنێت. جەخت لەسەر "حازربوون" بۆ ئەوەیە کە ئەم سێ دانەرە، لە واقیعدا، بە مانای بنەمایی وشەکە، نووسەرانێکی سیاسی بە ئەژماردرێن. چوونکای هەر کام لە بایەخی کایە زبانییەکان لە شکڵدان بە دنیای دەرەکی، ئاگاداربوون، لە بایەخداری شێوەیەك کە بنەماکانی دەسەڵات لەو رەهەندەدا توانای جیهان ئافەرینی

واژەکان لە خزمەت ئەگرن، لەم رەوتەدا واقعییەت و ئاوەزی ساق جلی ئایدیۆلۆژی دەپۆشێ لە لایەن ئەو نەهادگەلەوە کە لە تەوەهوماتی گشتی جەماوەر کەڵك وەردەگرن و توانیویانە بخزێنە ناو دەروونی تاکەکان. لەم ڕوانگەوە، پاش مودێڕن لەسەر زەینییەت، زبان و چیرۆکبێژی جەخت دەکا زۆریش بۆ ئەو نامەربووتیە و و ئاسایش خوازیە و خود شەیداییە دەگەڕێتەوە لە زۆربەی رەخنەگرانی ناتەبا، بە چاوی گومانەوە دەڕوانن بۆ ئەم بزاڤە. لە واقیعدا زۆربەی بەرهەمە پڕ بایەخەکانی پاش مودێرن، لەگەڵ ئەو هەموو تەجرووبە گەرییەتییەو دۆزە پەڕ چیرۆکبێژییەکان (انگیزەهای فراداستانی) بۆ خۆگەڕانەوە (خود ارجاعیت)، گەمە کارییەکان، کە بە گشتی سەیریان دەکرێ، هەیانە بەڵام لە بارەی بابەتە کۆمەڵایەتییەکان و سیاسەتیشدا ڕۆڵی باشیان هەیە.

جۆرج ئورۆڵ یەکێك لەو نووسەرانەتە، کە لە پانتایەکی بەربلاوتردا، بۆ پێداویستی توێژینەوەی رۆڵی زمان، ئەرکێکی زۆر قایل بوو، لە ساڵی 1984دا ناوی ئەو نووسەرە وەك بەناوبانگترین نووسەر لە بارەی بەرخوردی چیرۆك بێژی لەگەڵ دیاردەی فەریوکاری زبانی سیاسیدا بەجێماوە. ئەم ساڵە (1984) کە نێو جەرگی دابی چیرۆك بێژی زانستی - تەخەیوولیدا سەریهەڵداوە بە تایبەت لە ژێر رەنگدانەوەی رۆمانی بەرجەستە و تەجرووبی (ما، ئێمە) بەرهەمی یۆکنی زامیاتیندا بووە (رۆمانێکی پاش مودێرنی کە لە ساڵە 1920دا بلاوکرایەوە). ئەمە نیشانەی رووکردێکی ترە لە چیرۆکی پاش مودێرن:

روانینی دانەران بۆ فۆرمە پیرا ئەدەبییەکان وەك چیرۆکی زانستی - تەخەیولی و چیرۆکی

کاراگاهی – ئەمانە فورمگەلێك بوون کە رۆحی پاش مودێرنیان بۆ خۆڕاکێشا بوو،چونکای تەقلید (محاکات) دڵەڕاوکەیەکی ڕێنوێنیکەر بە ئەژمار نەدەهات. کەوا بوو ئەو ژانێرە ئەدەبییانە خاوەنی ئاوا سەربەستییەکی عەمەلگەرایانە بوون کە قاوغگەل و قەراردادگەلێك بەدی بێنن کە بە تێکڕا لەگەڵ قاوغ و قەراردادگەلی چیرۆکی سوننەتی جیاواز بوون، بە چەشنێکی سەرسووڕهێنەر زۆر خەست و خۆڵ و بەرچاوگر دەیان نواند، ئەمە خۆی پێداویستییە بوو کە توێژەرەوان، پێشکەوتە دڵخوازەکانی پێکهاتوو لە فورمە پیرا ئەدەبییەکان بەشێوەی کامڵ بخەنە ژێر نیگای لێکۆڵینەوە – بۆ نموونە پانتاییەکانی لێکۆڵینەوەی پڕبار لە کاربردی هەڵسووکەوتی هەرزنگارانە لە لایەن ئەکر، کوور، سامۆئێل دیلنی، کلارنس میجر (جگە لە نابوکۆف) یان خەریك بوونی زۆرینەی نووسەرانی پاش مۆدێرن بە ژانێرە کاراگاهیەکان لە بەرهەمی (ناباکۆف، ئیستانیلاولم، میشل بوتوور، رب گریە، ویلیام یورستبێرگ، مەك ئیلێروی). بەڵام گرنگترین گۆڕانکاری و بەرزبوونەوە، لە فۆرمە پیرا ئەدەبییەکاندا لەگەڵ چیرۆکی زانستی – خەیاڵییەکاندا پێوەندی هەیە. چیرۆکی زانستی – تەخەیوڵی لە مێژە لە ئوروپادا باو بووە و لەگەڵ ئەدەبیاتدا جیاوازی نەبووە (بە تایبەت دەبێ بڕوانین ئەو دابە ئوروپاییەی کە ئیچ. جی. ولز، زامیاتین، کارل چاپك، اولاف ئیستاپلدوون، ئالدۆس هاکلی، ئاتۆرسی، کلارك و جی. بالارد لەو بەستێنەدا بوون)، بەڵام لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا جیاوازییەك نێوان چیرۆکی زانستی (تەخەیوڵی و ئەدەبیات هەبووە، تەنیا لە ماوەی دەهەی شەستدا بوو کە چیرۆکی زانستی – تەخەیوڵی لە شوێنگەی لابراو کە بۆ خۆی داسەپاندبوو دەرباز بوو زەمینەی سەرەکی بۆ ئەفراندن و بزوانتنی پەیا کرد. ئەگەر چی هەندێ لە رەخنەگرانی ئەدەبی بە چاوی گومانەوە لەم ڕەوتە ئەدەبییە، دەڕوانن و یان بە هەڵوێستی بەرز لەگەڵیدا بەرخورد دەکەن، ئاشکرایە کە هەندێ لە ناسراوانی نوێکارە ئەدەبییەکانی پاش مودێرن، لە دەستەی نووسەرانی چیرۆکە زانستی – تەخەیوڵییەکان بوون. ئەم بۆچوونە بێگومان لەمەڕ فیلیپ کی. دیکدا دروست تر، دەچەسپێ کە چ لە ناواخندا و چ لە دەرەوەی بەستێنەی کارەکەی هەڵێنجاندنێکی نادروست لە مەڕ بەرهەمەکانییەوە کراوە. رۆمانەکانی دیك، بە هۆی گوشاری پەخشانکاران بۆ زوو بەدەسەوەدانیان بۆ چاپ، دووچاری ئافەتی بێ نەزمی، نەبوونی زەرافەتی زبانی، و پیاهەڵدانی دەستکرد و ساویلکەیی لە کاراکتێرەکان، بوون. لەگەڵ ئەمانەدا، دیك خەیاڵپەروەرییەکی رووناکمەندی لە زەمینەی چیرۆك بێژیدا هەیە، خەیاڵپەروەرییەك خاوەنی هێڵکارییەکی رووناکمەندی لە زەمینەی چیرۆکبێژیدا هەیە، خەیاڵپەروەرییەك خاوەنی هێڵکارییەکی نوێکاریانە کە بنەمایەکی پێچراوە و دەلالەتمەند و ئیستعارییان هەیە. دیك داهێنەری بنەماگەلی هێڵکاری (پەی رەنگ) تەوەرییە لە باشترین بەرهەمەکانیدا کە زۆر نزیکن بە دیاردەکانی پاش مودێرنیزم: پێچراوەیی لە خوازە (ئیستعارە)دا، ماهییەتی سیستەمە سیاسییەکان، ئاڵۆزکاری و بێ سامانێتی، ماشینی بوونب ژیانی مودێرن.

هەر بەم شێوە باقی نووسەرە مەزنەکان لە چیرۆکی زانستی – تەخەیوڵیدا (وەك: ئورسولا لێگوین، دێلنی، جێنی وڵف، جان دارلی، لم، راجر زلازنی) فۆرم گەلێکی پێچراوە و توکمەیان

خوڵقاندوه کە لە بارەی دنیای خەیاڵی دەوروبەری ئێمەدا و تەگەلی زۆریان نواندووە. بەڵام ئەم کارە بە کەڵك وەرگرتن لە بنەماگەلێك پێکهاتووە کە قەراردادەکان و زبانەکەی لە بناغەدا، لەگەڵ قەراردادگەل و زبانب "چیرۆکی ئەم جیهانە" (بە واتەی دێلنی) جیاوازە. لە واقیعدا، دەتوانین نیشانەیەك لە خەستی و فرە چەشنی ئەم زەمینە لە دانەرانی "جەریانی ئەسڵی"دا ببینین کە بە چیرۆکی زانستی – تەخەیوّلی روویان هێناوە – دۆریس لسینگ، ئانتۆنی بێرجیس، ئیتالۆکالونیۆ، مارج پیرسی، تووماس بێرگێر، نابۆکوف، ریموند فدێرمەن، و چەندەهای تر.

ئەڵبەت تا پێش لە ساڵەکانی 1960 لەم بەستێنەدا گەشەی زۆر کراوە کە راستەوخۆ لەسەر بزاڤی پاش مودێرنیزم کاردانەوەی هەبووە. یەکێك لەو رەهەندگەلە، سەرهەڵدانی بە پڕتاوی سینەما و تەلەویزیۆن وەك فۆرم گەلێکی هونەری سەرەکی بووە. شایەت هەڵکەوت نەبێ کە تەجروبە گەرایانی پاش مودێرن، هەوەڵین نەوەی نووسەرانێك بوون کە لە نوقم بوون لە نێو دنیای تەلەویزیۆن گەشەیان کرد، یان هەندێ لە نووسەران ئەوەندە لەگەڵ سینەمادا مەحشوور بووبوون کە پێشینیانیان لەگەڵ ئەدەبیاتدا، کاردانەوەی تایبەتی تەلەویزیۆن و سینەما لەسەر چیرۆکی پاش مودێرن، کاردانەوەیەکی بڵاوکراوە و هەمە لایەن و تەشەنەکەر بوو، دیاریکردنی دەقیقی ئەم دیاردە کارێکی دژوارە، بەڵام ئاشکرایە، زانیاری لە رەوتی نومایشی فیلمێك – بڕینی بە پرتاو، کەڵك وەرگرتن لە کۆکردنەوە و جەخت لەسەر نەما بەستراوەکان، نماگەلی جووڵەیی و شوێن کەوتی (تعقیی)، و باقی کەرەسە پێویستییە فەنییەکان – پێدەچێ بە دیهێنەری کاردانەوەیەکی قووڵ و ریشەدار بوو لەسەر نووسەرانێ کە کاریان دانیشتن لە پشت مێزی نووسین بوو (ئەم رەوتە، رەوتێکی دوو لایەنەیش هەیە، تیۆری تەدوینی ئایزنشتاین بەرەیك لە نووسەرانی خستووەتە ژێر کاردانەوەی خۆیەوە، بەڵام کەڵك وەرگرتنی "فلوبێر" لە کۆکردن (تدوین) لە دیمەنی (صحنە) نامرادی "بازاری مەکارە" لە "مادام بوواری"دا لەسەر فیلمسازان کاردانەوەی هەبووە). نووسەران نە تەنیا بە زوویی تێگەیشتن کە تەلەویزیۆن و سینەما دەتوانن بە شێوەگەلی گێڕانەوەیی (روایی) تایبەتی خۆیان کە کارسازتر لە چیرۆك بێژییە، سەروکاریان هەبێ (وێنەگریش، هەر بەم شێوە، بە یەکجار شێوەگەلی تایبەتی لە وێنەگری، هەڵوەشاندبوویەوە) بەڵکو حاڵی بوون هەندێ لە سازوکاری سینەمایی دەتوانێ لە ئەدەبیاتی چیرۆکبێژیدا کارایی و سوودبەخشی هەبێ.

خوێنەرانی فێرکراو لەگەڵ قەراردادە چیرۆکیەکانی سەدەی نۆزدە، پێدەچێ پێوەندییەکانی ئاشکراو تێپەڕ بوونە تایبەتییەکانیان (لە گێڕانەوەی چیرۆکبێژیدا) بە پێویست دەزانی، بەڵام دەرهێنەرانی سینەمایی بە زوویی کە کەشفیان کرد کە کاتێك خوێنەر لەگەڵ کۆمەڵێك قەراردادگەلی جیاوازدا ئاشنا بێ دەتوانین هەندێ لە ئاوەها خەڵگەلێك بسڕینەوە. (بۆ وێنە، لکاندنی وێنەی پیاوێك کە لە شەقامێکدا تێدەپەڕێ لەگەڵ نومایەك هەر لە ئەو پیاوە کە لە نێو هۆدەیەکدا دانیشتووە لەبەرچاو بگرن – لێرەدا هیچ پێویست ناکات کە نوماگەلێك (دیمەنگەلێك) لە ماڵەکە، یان لێدان یان کلیل هاوێشتن و چوونە ناو.. پیشانبدەین.) بەم شێوە پێگەی تەلەویزیۆن و راگەیاندنی تەلەویزیۆنی، کە لەم روانگەوە کاردانەوەی بناغەییان هەیە – دەتوانین لە زۆربەی

بەرهەم گەلی پاش مودێرندا (بە فەرز لە "کوشتن خانەی ژمارە 5، رگتایم"، چیرۆکە کورتەکانی "کوور و بارتلمی"دا و بەرهەمی "مانوئێل پووئیگ و جاناتان باومباخ" بیانبینین.

ئەڵبەت کاردانەوەی تەبەتیتری دەرهێنەرانی تاك لەم بوارەدا ئینکار ناکرێ. "ژان لۆك گدار" پێدەچێ وەك هەر ناسراوێکی ئەدەبی تەسەوراتی نووسەرانی دەهەی شەستی خستبێتە ژێر رکێفی خۆیەوە، و فیلم گەلێك وەك: "هەشت و نیم"ی (فیدریکۆفلینی)، "ئاگرانیسمان"ی (میکل ئانجلۆ ئانتۆنیۆنی)، "شاجوانی رۆژ"ی (لوئیس بۆنۆئیلێ)، "انزجار، نەفرەت"ی (رۆمەن پۆلانسکی)، (ئۆدیسەی فەزایی) 2001 و دکتۆر ئیسترنج لاو (ئیستنلی کوبریك)، زۆربەی فیلمە نوێکارەکان، بە شێوەگەلی جۆراوجۆر، ئەدەبی چیرۆکبێژیان خستوەتە ژێر کاردانەوەی خۆیانەوە.

**هەستانەوەی ئەدەبیاتی چیرۆکبێژی پاش مۆدێرن:**
**1960-1975**

لە سەرەتاکانی دەهەی شەستدا ئێمە شاهیدی بڵاوبوونەوەی ژمارەیەك لە بەرهەمی چیرۆکی لە وڵاتی ئامریکاین کە پیشاندەری هێڵکاریەکی زۆر جیاوازن لە چاو بەرهەمگەلی 25 ساڵی رابردوودا. نیشانەی ئەم گۆڕانکارییە لە حەساسییەتی جوانی ناسیدا دەتوانین لەسەرهەڵدانی چەندین بەرهەمی سەرەکی لە ماوەیەکی کۆتای ساڵەکانی 1965–1960 سۆراخ بگرین کە بێ گومان لە دابە واقیعگەرێتییەکانی ئاسایی پچڕاون. ئەم بەرهەمانە بریتین لە: دلال نشئەجات (1960) و جیلز گوت. بوی (1966) لە جان پارت، ماوەی 22 (1922) لە جوزف هلر، ئاوری رەنگ پەڕیو (1962) لە ولادیمیر نابۆکۆف، v (1963) لە تۆماس پینچون، گەڕێرەوە (برگرد)، دکتر کالیگاری (1962) لە دۆناڵد بارتلمی و ئاخێزگەی برونیست (1960) لە رابێرت کوور: بەرهەمگەلێك کە هەموویان لە لایەن نووسەرانێکی لاو و دەماراوییەوە نووسراون (ئەڵبەت لە بواری تەمەندا نابۆکۆف جیاوازە) ئەم بەرهەمە چیرۆکانە، کاردانەوەی نائاساییەکانی خۆیان، دەین لە ملی سەرچاوەگەلێکی جۆراوجۆر دەزانن، وەك: شانۆی پوچگەرا (کە لە نێوان کۆتایی ساڵەکانی دەهەی پەنجا لە کەش و هەوای شانۆدا لە دەرەوەی "برادوی" گەشەی کردبوو)، موسیقای جاز و راك اندرول، پاپ ئارێت و باقی پێشکەوتنەکانی تر لەم کەش و هەوای هونەری (ئاوانێگارد)، و چاوکردن لە "کافکا" و باقی تەجروبە گەرایانی تر (کە بەرهەمەکانیان لەم سەردەمەدا، بە ئینگلیسی وەرگێڕایەوە: سلین، رب. گریە و باقی نووسەرانی رۆمانی نوێی فەرانسە، ژان ژنە، بورخس و گۆنترگراس)، و هەروەها شوور و ڕاوەی دێوانە ئاسای نەوەی (بەیت) کە پێکهاتەکەی تێکەڵێکی بێ وێنە بوو لە رەشبینی، تارۆزی ئەدەبی، سورییالیزم، هێڵکاریە پێچراوەکان و تەژی لە (تەرقان)ی دوور و (عەمەل، کنش) تۆکمەییەکان، ئەمانە هەمووی لە رەنگاڵە سەرسوڕهێنەرەکانی شێوازدا خۆیان دەنواند کە بێ بڕانەوە بۆ خۆیان دەگەڕانەوە، چیرۆکی پاش مۆدێرن سەریهەڵدابوو.

لە رەوتی چیرۆکی پاش مودێرنی ئەم دەهەدا، تایبەتمەندییەکان ئەمانە بوون: رووکرد بەرەو ئەزموونی فورمە بەیانیە نوێکارییەکان، توێژینەوەی قەراردادەکان و رێحەلەکان بە شێوەی رەخنەگرانە و هەوڵ بۆ دەرهێنانی وڵامە نوێباوەکان، و تێفکرین لە رەوشە سروشتییەکان بۆ سامان دانی تێگەیشتن، دەرخستنی ئاخێزگە ئایدۆلۆژییەکان، و سامانبەخشی بە گەلاڵەی

سیستەمە نوێکان – کارێك کە بە دەگمەن لە عودەی برج عاج نیشنی ئاکادیمێك دەرئەهات. ئەدەبیاتی چیرۆکبێژی، ئێستا بوو بوو بە پێگەی نواندنی هەستە هاوبەشەکانی زۆربەی بیرمەندان و بەرجەستەترین شارەوەندان کە هەستیان دەکرد کە گەیشتوونەتە سەردەمی کابووسی ئەتۆم، بۆ ویەتنام، بە ئاخر زەمانی ژینگە (زیست موحیتی)، بە دەست درێژکاری سیاسی، بە ئەرزشە دژ ژاوەزییەکان و غەیرە ئەخلاقی و گومڕا بووین کە بە رێزگرتن لە زەینیات و دیاردە بێ رۆحە ماندووکەرەکان، مرۆڤە کانیان لە ئەرزش و بایەخداری سڕیوەتەوە – ئەڵبەتە ئەمانە هەمووی لە ژێر سەردێڕی تایبەتی و ئایدۆلۆژییە پەنهانەکاندا دەهاتە دی کە بە راستی پێویستیان بە تێڕامانی سەرەکی و بنەڕەتی بوو. بەردەوامی ئەم هەستە، تامەزرۆی هەڵوەشانەوەی ئایدۆلۆژییە دەسەڵاتدارەکان (بریتی لە سیاسی، جنسی، ئەخلاقی، کۆمەڵایەتی و جوانی ناسانە کە هەموویان بە شێوەیەکی بەرچاو هاوبەندی یەکتریان دەنواند) و دەرخستنی بەڵگەی وجودی ئەوانی بوو:

بنەماگەلی خۆسەرانەی داسەپێنراو و پێکهاتوو لە هێزە مێژوویی و ئابوورییە پێچراوە جۆراو جۆرەکان، کە وەك بنەماگەلێکی ئاسایی و ئاوەزمەند لە کۆمەڵگادا جێگیر بوو بوو، هەرکام بە چەشنێك دۆخی هەنووکەیی جیهان بینی سەردەمیان قەڵەو دەکرد. هەر بەم پێیە، بۆتیقای زێدەرۆیی پاش مودێرنیزم کە بە چەشنێکی رادیکاڵ، رەوتی شێوەیەك لە لاوازی و بێ دەسەڵاتی و ناخوشنوودی هەموو لایەنتر بوو. رستەی "بە هیچ کەسێکی باتر لە سی ساڵ، بڕوا مەکە" وتەیەکی ئاسایی بوو کە لە نێو لاوانی دەهەی شەستدا دەبینرا، لاوگەلێك کە لەگەڵ ناوەڕۆك و بنەمای ژیانێکی تایبەتیدا سەریانهەڵدابوو و گەشەیانکردبوو. بەم جۆرە بێ متمانەییەکی هاوچەشن لە ئاست "گەورەکان" لە لایەن چیرۆك نووسانی پاش مودێرندا دەبینرا.

لە کۆتایی دەهەی شەست و سەراتاکانی دەهەی هەفتادا بەرەیەکی نوێ و تازە پێگەیشتوو لە نوسەران، حوزوری خۆیان سەلماندبوو. لەم سەردەمەدا، دانەرانێك کە رەخنەگران ئەوانیان وەك دانەرانی پاش مودێرن بە رەسمی دەناسی، چیرۆکگەلێکی تەجروبیان داهێنا: "لە نێو دڵی دیار"ی ویلیام گس، هەنگاوەکان بەرهەمی یرژی کۆزینسکی، یەکیەتی جیهانی بیس باڵ و دەنگ نووسینەکانی بەرهەمی رابێرت کوور، ژنی ستوانی فەرانسەوی لە جان فاولز، دڵەراوکێی یاریزان لە لێدانی پناڵتی لە پیتر هاند کە، سەد ساڵی تەنیایی بەرهەمی گابریل گارسیا مارکێز، زێدەرۆییەکانی پیتر برێنس لە ئێستیو کاتز، ژیانی شاری، چەرمووی بەفر، رەفتاری ترسێنەر و کرداری نائاسایی لە دۆناڵد بارتلمی، و *HE CRYING OF LOT 49* لە تووماس پینچوون، راوی قزڵئالا لە ئامریکا لە ریچارد براتیگان، جازبەی ئەولای جادەکە بەرهەمی تام رابینز، دوو بەرابەر یان هیچ بەرهەمی ریمۆند فدێرمەن، و کتێبی "موقەدەسی قاچاخچییەك لە جوزف مك ئیلیروی". کێشە ئەمە نییە کە ئەم نووسەرانە لە رەوتی نوێکاری چیرۆك بێژیدا، گەیشتوونەتە ئوسلووبی تاك و داهێنەرانەیەکی هاوبەش، بەڵکوو بە پێچەوانە: ئەوان سەرگەرمی توێژینەوە لە کۆمەڵێك رێبردە تازەگەرییەکان بوون کە زۆربەیان هەم لە فیکر و هەم لە عەمەڵدا جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ یەکتر بوو (بۆ وێنە، بە دژواری دەتوانین تەسەور بکەین کە

دوو بەرهەم وەك: "دوو بەرابەر یان هیچ"ی فدێرمەن و "لە نێو دڵی دیار"ی گس لە روانگەی جوانی ناسییەوە ئاوەها دژ بە یەك بن). بەم حالیشەوە، خاڵی هاوبەشی ئەم هەموو تەجروبە گەرییانە ئەم تێگەیشتنە گشتییە بوو کە ئەدەبیاتی چیرۆکبێژی پێویستی بە ناسینی چۆنایەتی دەستکردی (تصنعی) و پێکهاتەی خۆیەتی تا لەم رێگەوە سەرنجی خوێنەر بۆ چۆنایەتی بەرهەمەکەی رابکێشێ، نەفەقەت بۆ کارەساتەکان، بە بێ بایەخی هەموو ئەو ئیدیعا حەقیقەتمەندیانە و حەساسیەت لەسەر ئەم روانگە کە واقعییەت و عەینییەت نە (پێکهانگەلێکی داسەپاو)، بەڵکو بنەماگەلێکی کۆمەڵایەتی یان زمان ناسانەن، نووسەرانی پاش مودێرن بە نواندنی تەکنیکی بەرهەمەکان، بە راڤەی رەوتی هەست پێکراو لەو بەرهەمەدا، و سەرپێچی لە داهێنانی ئەم تەوەهوومە واقیعگەرایانە، روویان هێنا کە موحاکاتی هەستپێکراو لەو بەرهەمەدا، جیا لە خودی بەرهەمەکە عەمەل دەکا. لە ئایدۆلۆژی واقیعگەرایی یان بازنومایییدا، لەسەر ئەم خاڵە جەخت کرابوو کە وشەکان لەگەڵ بیرگەلێکی راستەوخۆ و داسەپاو و بێ مشت و مڕ پێوەندییان هەیە. لەلایەکی ترەوە، دانەرانی پاش مودێرن – کە لە پانتایی جوانی ناسانەیەکی پەرەگرتوو لەگەڵ زمان ناسی سوسوری، و بۆچوونی ویتگنشتاین لە واتاوە وەك کاربرد، بنیادخوازی، و روانگە بنەماشکێنەکان لە ئاستی زماندا، کاریان دەکرد – حەزیان دەکرد کە وشەکان وەك ئامێرێکی گۆڕانکار و قەوام گرتوو بە کەڵك وەرگرتن لە رێگەلی هەستپێکراو لە نیزام گەلی نیشانەییدا کەڵك وەربگرن.

لەم سەروبەندەدا، باقی قەرارادادە گێرانەوە واقیعگەراییەکانیش کەوتە کێشەمەکێش و دژکارییەوە. ئەو فەرزەی کە زەینی یەکگرتوو لە دنیای جەوهەرە نەگۆڕەکاندا دەژییێ (یەکێك لە بنەماکانی چیرۆکبێژی سوننەتی) فەرزێك بوو کە چەندین کەرەت لەلایەن دانەرانی پاش مودێرنەوە بە سوکایەتی ناوی برا، بەڵکو ئەم کارە بە جەخت کردن لەسەر سروشتی رەوان – پچڕاو زەینی تەجروبی و لاوەنانی جیاوازی نێوان زەینییەت و واقعییەت (لە بەرهەمەکانی فلیپ راس، جاناتان باومباخ، یان فیدێرمەن) دەهاتە دی و بە داهێنانی کاراکتێرگەلێکی قوتار لە هەر چەشنە کەسایەتییەکی جێگرتوو، یان کاراکتێرگەلێك کە دیمەن بە دیمەن سەرومڕ لە حاڵی گۆڕاندندا بوون (وەك: کاراکتێرەکانی رۆناڵد سۆکینك کە "وەك پەڵە هەورێك" لە تێپەڕبوون دانو یان تەجرووبەی پەخشانی ران سیلیمێن کە لەم بەرهەمەدا بگێڕ (راوی) مەوقعییەت لە رەوتی هەڵبژاردنی زمانیدا نوقم دەبن). لە ئاوەها دۆخێکدا، جیاکردنەوەی واقعییەت و چیرۆك، دانەر و دەق، بە چەشنێکی بەرچاو و ئاشکرا دژوار دەبوو. دانەرانی واقیعی بە رێژەیەکی بەرز دەرباز بوونە هەمەلایەنەکانیان خستە نێو دنیای چیرۆکبێژی خۆیانەوە (وەك فونەگوت لە قاوەتوونی چمپیونەکان و فاولز لە "ژنی ستوانی فەرانسەوی" یان سوکینك و فدێرمەن لانیکەم لە سەرکۆی بەرهەمەکانیان)، هەندێ لە کارەساتە واقعییەکان، راپۆرتە واقعییەکان و هەواڵەکان زۆربەی بە ئوسلوبێکی کولاژ شێوە لە بەرهەمەکانی ئەم نووسەرانە تێکەڵ بووە، کەوا بوو جیاکردنەوەی خاڵە دەستکردییەکان لە خاڵە واقعییەکان کە بەراستی روویاندابێ ناموومکین دەبێ (لەم بارەوە دەبێ ئاماژە بکەین بە بەرهەمەکانی بارتلمی، باروز، فونەگوت، هارڵد جاف، کوور، و ویلیام کندی و..). ئەم رووکردە بە کەرت بوونی

پێوەندی نێوان کارگەی واقیعی و داهێنان و یان نەبوونی تەبایی گشتی نێوان دوو رەهەندە، لە نووسینەکانی رۆژنامەوانی نوێکار وەك: تام وڵف، ترومن کاپوت، نورمن میلر و هانترتامسونیش بەرچاو و دیارە.

ئەم دانەرانە، هاوڕێ لەگەڵ باقی نووسەرانی تر کە دوو لایەنی واقعییەت چیرۆك یان تێکدا، نە تەنیا قەرارداد گەلێکی فرە چەشنیان لە چیرۆکنووسیدا، قوستبوویەوە بۆ بەرزکردنەوەی چەمکی پێشبردنی درام و هێڵکاری (بێ درنگ) بەکار گرتوو، بەڵکو دژکارییە زەینییەکانی خۆیان (هەڵوێستە زەینەکان) کەردە سەرلۆحەی بەرهەمەکانیان (رابێرت پیرسیگ لە بەرهەمی "زێن و فەنی پاراستنی مۆتور و..، ماکسین هونگ کینگستۆن لە بەرهەمی "ژنە گەریلاکە و پیاوانی چینی، پتر هاند کە لە "پەژارەیەك ئەو پەڕی رۆیاکانەوە ورای، وی. اس. نایپۆڵ لە بەرهەمی لە "دەوڵەتی ئازاردا و..) نە ئەوەی کە داواکاری ئەوەین کە دەقەکانیان دەقگەلێکی عەینی دەژمێردرێ. جیا لەم باسە، جیاوازی نێوان پەخشان و شیعریش لەبەرچاو نەدەگیرا و ئەم کارە نەتەنیا لەلایەن چیرۆکبێژاتنەوە هاتە دی کە لەسەر چۆنایەتی شاعیرانەی پەخشانەکانیان جەختیان دەکرد. (گش، بری هان، استنلی الکین، نابوکوف، هاوکن)، بەڵکو شاعیرانێکیش کە بە توێژینەوەی پانتایی فورمە فرە چەشنییەکانی پەخشان روویان هێنابوو، هەر لەم رەوتەدا هەنگاوی ئەدەبیان هەڵدەگرت. تەنانەت رواڵەتی ئاشنای کتێبەکان - قەراردادەکان بۆ پیت چنی، سەفحەئارایی، و باقی دیاردە رووکارییەکان کە لە پێناوی سامان بەخشینی خوێندنەوەدا بوون - لەبەرهەم گەلێك وەك: دوو بەرابەر یان هیچ لە فێدێرمەن، زێدە روویییەکانی پیتر پرنس لە کاتز، هاوسەرە غەریبەکەی ویلی مسترز لە گس، دەوری کۆتایی لە کورتازار، ژیانی شاری لە بارتلمی و یان "سیار" لە بۆرتۆر و.. لە بەرچاو نەدەگیرا.

**پوختەی باسەکە:**

لە واقیع داد هەموو ئەو دیاردانەی کە چۆنایەتی تەجرووبەی خوێندنەوەیان (خوانش) شکڵ دەدا لە ماوەی دەهەی شەستدا لە لایەن تەجرووبە گەرایانی پاش مودێرنەوە کەوتە ژێر تێڕامان و لێکدانەوە.

**سەرچاوە**

ادبیات پسامدیرن، پەیام یەزدانجو.

# کلتوری پۆستمۆدێرن

**له عەرەبییەوە: سەردەم**

ئـەم وتـارە خسـتنەڕووی کتێبـی ( *A Critical History of Postmodern Cuture*).

ئـەم کتێبـە "سـتیوارت سـیم" نوسـیویەتیو بەقـەوارەی *304* لاپەڕەیـە، دەزگـای (ئـایکۆن بـۆکس، کامبریدج) ساڵی *2003* بەچاپی گەیاندووە. نوسەری کتێبەکـە مامۆسـتای تیـۆری ڕەخنەییـە لەبەشـی زمانی ئینگلیزی لەزانکۆی ساندەرلاند. لەم کتێبـەدا وێنەیـەکی گشـتیمان دەربـارەی فەلسـەفەی پۆسـت مۆدێرن پێشکەش دەکات.

وەکـو ئاشـکرایە لەچـەند سـاڵی رابـردوودا، پۆسـت مـۆدێرن دنیـای تەنیـەوەو زۆربـەی زۆری رۆشنبیرانیشی بەخۆیەوە خەریکرد. زۆرجار خەڵك ئەم پرسیارە دەکات: (پۆست مۆدێرن مانای چییە؟ ئـەو جیاوازییـە چیە کـە لـەنێوان پۆسـت مـۆدێرنو مۆدێرنـەدا هەیـە؟) تـەواوی کتێبەکـە بریتییـە لـە وەڵامدانـــەوەی ئـــەم پرســـیارانە.. ســـەرەتا بەپێشەکیەکی گشتی دەست پێدەکاتو دوای ئەوە راســتەوخۆ دەچــێتە ســەر نەســکی یەکــەم کەناونیشــانەکەی بەمجۆرەیــە: گــۆرانی پۆســت مـۆدێرن، واتـە کـەیو بـە چ شـێوەیەك بـۆ یەکـەمجار ئەم چەمکە هاتە ئارا؟

ناونیشــانی نەســکی دووەم بریتییــە لــە: فەلســەفەی پۆســت مــۆدێرن. لێـرەدا نوســەر لــە تـاوتوێکردنی چـەمکەکەو چـۆنیەتی سـەرهەڵدانی وازدێنـیو دێتـە سـەر باسـکردنی ئـەو فەلسـەفەیەی تەعبیر لەچەمکی پۆست مۆدێرن دەکات.

هەرچــی نەســکی ســێیەمە، ناونیشــانەکەی بەمجۆرەیــە: سۆســیۆلۆژیای پۆســت مــۆدێرن. لەکاتێکدا ناونیشـانی نەسـکی چوارەم بریتییـە لـە: زانستو تەکنەلۆژیا لەسـەردەمی پۆسـت مۆدێرنـدا. هەرچــی نەســکی پێنجەمیشــە تەرخانــە بــۆ چارەســەرکردنی کێشــەی ســتاتیکای پۆســت مـۆدێرنو لێـرەدا "ستیوات سیم"، بەدورو درێـژی باس لەکلتوری پۆست مۆدێرنو هونەر لەسەردەمی پۆســت مۆدێرنــدا دەکــاتو پاشــان کتێبەکــە بەپاشەکیەك کۆتایی پێدێنێت.

لەپێشـەکی گشـتی کتێبەکـەدا نوسـەر دەڵێـت: (چەمکی پۆست مۆدێرن چەندین ساڵە لەئارەدایـەو

شتێکی زۆر تازەو نامۆ نیە. لەم ساڵانەی دوایدا بەرهەمو نوسینیکی زۆری لەبارەوە نوسراوە. ئەڵبەتە تا ئێستاش مۆدێرنە هەوادارو لایەنگری خۆی هەیە, بەڵام پێدەچێت وەك ئەوەی پۆست مۆدێرن کلتوری سەردەمی داهاتوبێت).

هەندێك پێیان وایە ئێمە ئەو کات لەمانای مۆدێرنە گەیشتین, کەداخڵ بەسەردەمی پۆست مۆدێرن بووین! واتە پۆست مۆدێرن یارمەتیدەرمان بوو بۆ ئەوەی بتوانین چوارچێوەو سنورە گشتیەکانی مۆدێرنە دیاری بکەین. ئەمەش بۆ خۆی شتێکی مەعقولو لۆژیکیە, لەبەرئەوەی ناتوانین بەچاکی لەشتێك تێبگەین گەر لێی دەرنەچینو لەدوورەوە بۆی نەڕوانین.

لەجێگەیەکی تردا "ستیوارت سیم" دەڵێت: (وەکو ئاشکرایە فەیلەسوفی فەرەنسی جان فرانسوا لیوتارد یەکەمین کەسە کە لەزمانی فەرەنسیدا, جەختی لەسەر ئەم زاراوەیە کردبێتو ئەمەش بەر لەچارەکە سەدەیەك بوو, کاتێك کتێبەکەی — دەربارەی هەلومەرجی پۆست مۆدێرن— بلاوکردەوەو تیایدا تیۆرییەکی گشتی بۆ ئەم فەلسەفە نوێیە فۆرمەلە کردبوو).

وەك دەزانرێت فەلسەفەی رۆشنگەری کە لەسەدەی هەژدەهەمدا هاتە ئارا, بەڵێنی ئەوەی داینێ کەمرۆڤ لەڕووی فیکریو مادییەوە رزگار بکاتو بەختەوەری هەمیشەیشی لەسەر ئەم زەمینە بۆ دەستەبەر بکات, بەڵام ئێستاو پاش تێپەڕبونی دووسەد ساڵ بەسەر ئەو بەڵێنانەدا, بەنائومێدیەکی قووڵ گەیشتوین, چونکە مۆدێرنە بەڵێنەکانی خۆی نەبردەسەر. لەبەرئەوە ئێمە ناچارین لەشتێکی تر بگەڕێین کە تێپەڕێنێت, ئەوشتەش پۆست مۆدێرنەیە.. ئێمە دەمانەوێت لەزیندانی مۆدێرنە بێینەدەرێ, ئەو زیندانەی چیتر ناتوانین لەناویدا هەناسە هەڵمژین!

هەر لەدرێژەی قسەکانیدا پرۆفیسۆر "ستیوارت سیم" دەڵێت: (جان فرانسوا لیوتارد پێی وایە مۆدێرنە لەسەرەتادا ئامرازی ئازاد کردن بوو, بەڵام دواتر وەرگوڕاو بووبە شتێکی نەگۆڕو سەرکوتکەر.. باشترین بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کەمرۆڤ لەکۆمەڵگا مۆدێرنە پێشکەوتوەکاندا, لەلایەن دامودەزگا نهێنیو نەبینراوەکانەوە چاودێری تەواوی جوڵەو رەفتارەکانی دەکرێت. کەواتە لەکۆمەڵگا سەرمایەدارییە مۆدێرنەکاندا مرۆڤ هەر بەڕواڵەت ئازادە, بەڵام لەواقیعدا کۆتو بەندکراوە بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت. ئەمە ئەوەبوو کە میشیل فۆکۆ لەکتێبە بەناوبانگەکەیدا — کۆنترۆڵو سزا— باسی لێکرد. فۆکۆ لەوێدا کەوتە تاوتوێکردنی میکانیزمی کارکردنی دەسەڵات لەکۆمەڵگا ئەوروپییەکانداو ئاشکرای کرد کەمرۆڤ لەسەردەمانی پێشودا زۆر ئازادتر بووە, لەبەرئەوەی دەیتوانی لەدەسەڵات هەڵبێت, بەڵام ئەمێستا میکانیزمی دەستەمۆکردنو کۆنترۆڵی دەسەڵات بەهەموو شوێنێکدا بلاوبۆتەوەو کەس ناتوانێت لەدەستی قوتاری بێت. لەبەرئەوە فۆکۆ رستە بەناوبانگەکەی خۆی وت: رۆشنگەری ئازادییەکانی دەستەبەرکردو هەر خۆشی کۆتو پێوەندیشی دروستکرد..).

دوای ئەمە نوسەر ئەم پرسیارە دەکات: (کەی بۆ یەکەمین جار بوینە پۆست مۆدێرن؟) وەکو ئاشکرایە چەمکی پۆست مۆدێرن بۆ یەکەمجار لەزمانی ئینگلیزیدا لەساڵی *1870* بەدەرکەوتو لەو کاتەدا ئەوناوەیان لەوێنەی پۆست مۆدێرن نا. پاشان ساڵی *1917* لەزمانی ئەڵەمانیدا هاتە ئاراو ئەمەش لەسەر دەستی تیۆلۆژیست "ئیدڤنز بێڵ"

بـوو کـه دوو کتێبـی بـەم ناوانـەوە بڵاوکربـووەوە: (پۆســت مــۆدێرن‌و چــەند وتــارێکی دی) لەگــەڵ (ئاینێـك لـەپێناو ژیانـدا.. کتێبێـك لـەپێناو پۆسـت مۆدێرنـدا). ئـەم بیریـارە پێیوایـە پۆسـت مـۆدێرن تــەواوی ئــەو سیســتمە سیاســیانە ڕەتدەکاتــەوە کەمۆدێرنــە دروســتی کــردوون, وەك: لیبرالیــزم‌و کۆمـۆنیزم‌و فاشـیزم‌و هـەموو ئەمانـەش دەگۆڕێـت بـەئایین. هەرکەسـێك بـڕوای وابێـت بـەفیعلی سـەر بەپۆسـت مۆدێرنـەو ئـەو کەسـە لـەڕووی فیکرییـەوە خاکییەو لەڕووی ڕۆحیشەوە تینووە. واتـە تینـووی شتە ڕۆحییەکانـە, بەپێچـەوانەی مرۆڤـی مۆدێرنـەوە کە لەشتە مادییەکان تێرنابێت.

بـەڵام ئـەم تەفسـیرکردنە بـۆ پۆسـت مـۆدێرن ســەرکەوتوو نــەبوو هــەروەها نــەیتوانی ببێتــە تەفسـیری باڵادەسـت, بـەڵکو ئـەوەی بەرقـەرار بـوو تەفسـیری فەلسـەفی بـوو نـەك ئاینی. لێرەوە چـەمی پۆسـت مـۆدێرن تـەعبیر بـوو لەمتمانـەکردن بـەپرۆژە رزگــاریخوازە مەزنــەکانی ســەدەی بیســتەم, وەك: لیبرالیزم‌و مارکسیزم.

"فرانسـوا لیوتـارد" ئـەم پرۆژانـە بەحیکایەتـە گــەورەکان یــاخود بەئەفســانە مەزنــەکان نــاوزەد دەکــات‌و لــەم بارەیــەوە دەڵێــت" (دوای ئــەوەی لەهێرۆشیما‌و ناکازاکیدا روویداو پاش ئەو هـەموو تاوانانەی لە قۆناغی کۆلۆنیالیزم لەلایەن خۆرئاواوە رویانــدا, نــاتوانین بــاوەڕ بەوەعــدو بەڵێنــەکانی مۆدێرنـــــە بکـــــەین دەرهـــــەق بـــــەئازادکردن‌و سەرفرازکردنی مرۆڤایەتی).

## سەرچاوە

بیان الکتب, *2004/6/19*.

# ئەفلاتون

# لەناو پۆستمۆدێرنەکاندایەو.. دژیشیانە

**جۆزیف سپینسەر**

**لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد**

"رۆژێکیان گویم لە یەکێك بوو، بە قسەی خۆی کتێبێکی ئاناکساگۆراسی دەخوێندەوە، کە دەڵێت هزر ئاڕاستەکەرو هۆی هەموو شتەکانە[1]. سۆکراتی ئەفلاتونیش چەند ساتێکی کەم بەرلەوەی ئەسینا لە سێدارەی بدات، سەرقاڵی نمایشکردنی چەند دێڕێکی فەیلەسوفێکی تر بوو. ئەفلاتون وای لە سۆکرات کردووە هەتا دواهەمین ساتی ژیانی دراماتییکییانەی خۆی رەخنەی گرنگ و بە بایەخ لە تێکستە ئەدەبییە دەرکەوتووەکان بگرێت. رەخنە گرتن لە تێکستەکان لە سەراپای کارەکانی ئەفلاتوندا دەبینرێتەوە، ئەم کارەی کردووە بە میتۆلۆجیای فەلسەفییانەی سەرەکیی خۆی. ئەم دەستێوەردانە ئەدەبییە ئەو وێنەیە تێکدەشکێنێت کە ئەفلاتون وەك پیاوێکی لۆجیکی بە شێوەیەکی سیستماتیکی کاردەکات بۆ سەلماندنی چەند دراوێك یان چەند پێناسەیەك بەرەو دەرەنجامێك. لە راستیدا ئەفلاتون هەرگیز هەوڵی نەداوە تاقە یەك مەسەلەی فەلسەفییانە بە شێوەیەکی سیستماتیکی بخاتە روو، هەروەها لە مەسەلەیەکی سەرەکی یان تێزێکەوە دەست پێناکات بۆ ئەوەی بگاتە هەندێك وردەکاریی، وەك ئەوەی دواتر ئەرەستۆ دەیکات. ئەفلاتون کەسێکە بە وردیی و خۆبەخۆ بژار دەکات، ئەم هەوڵە ناسیستماتیکییانەی ئەو، گرێی دەداتەوە بە نەریتێکی یەکجار درەنگی دوای خۆیەوە: پۆستمۆدێرنیزم. ئەم کارە دوو مەبەستی هەیە: سەلماندنی ئەوەی کە میتۆدۆلۆجیا پڕ بەرهەمەکەی ئەفلاتون رەخنەیەکی ئەدەبییانە بووە، هەروەها پیشاندانی ئەوەی پیادەکارییەکانی پۆستمۆدێرنیزمیش نوێکردنەوەی هەوڵەکانی ئەفلاتونن.

## دەربارەی مشتومڕ
## سروشتە نێگەتیڤەکەی

گریگۆری ڤلاستۆس لە کارە بنەڕەتییەکەیدا لەمەڕ ئەوەی سۆکرات و ئەفلاتون چۆن بیریان کردۆتەوە، کرۆنۆلۆجیایەکی تایبەتی بۆ نوسینی دایالۆگەکانی ئەفلاتون ڕێکدەخات[2]. بە بۆچوونی ئەو تیووریی فۆرمەکان، دڵنی ئایدیا میتافیزیاییەکانی ئەفلاتونەو حەڤدە دانە لە دیالۆگەکان باسی لێوە دەکەن. بەڵام دیالەکتیك کە زەمینەی لۆجیکییانەی خۆی لەناو تیووریی فۆرمەکاندا دەدۆزێتەوە[3]، تەنها لە دایالۆگەکانی سەرەتای ئەفلاتوندا دەردەکەوێت. لەبەر ئەوەی دایالۆگەکانی سەرەتا، فەلسەفەی سۆکرات دەخەنە ڕوو، بۆیە بێشك بەکارهێنانی مشتومڕ لە ناویاندا میتۆدی سۆکراتە. بۆیە ئەوە مشتومڕە کە ئەفلاتون دەگەیەنێتە تیووریی فۆرمەکان، نەك تیووریی فۆرمەکان ئەفلاتون بباتە سەر مشتومڕ. ڕێکخستنی دایالۆگەکان لە لایەنی ڤلاستۆسەوە، ئەم خاڵە ڕوون دەکاتەوە، مێژوویەك بۆ پرسیارەکانی سەرەتا دادەمەزرێنێت و ڕوونی دەکاتەوە کە سەرەنجام دەبێت بە فەلسەفاندنی تیووریی. زۆر بە توندی ئارگیومێنت لەسەر ئەوە کراوە کە دایالۆگەکانی سەرەتا لە هزری ئەفلاتونەوە نەهاتوون، بەڵکو زیاتر فەلسەفەکەی سۆکرات دەخەنە ڕوو. ڤلاستۆس ئەوە لێکدەداتەوە کە لە نێوانی جیاوازییەکانی تریشدا، سۆکراتی دایالۆگەکانی ناوەڕاست تیوورییەکی بەرزی میتافیزیکییانەی هەبووە لەمەڕ فۆرمەکان کە "بەجیا بوونیان هەیە"، لە کاتێکدا کە سۆکراتی دایالۆگەکانی سەرەتا بە شێوەیەکی بنەڕەتی هیچ تیوورییەکی لەو بابەتی نیە[4]، بەشێوەیەکی بنەڕەتی دایالۆگەکانی سەرەتا چەند پرسیارێك بەرهەم دەهێنن دەربارەی پێڕەوە ئاکارییە یان ئێتیکییە دیاریکراوەکان. کرۆکی یوتیفرۆن، بۆ نمونە، بریتیە لە پرسیارەکەی سۆکرات: "کەواتە پێم بڵێ، تۆ دەڵێیت بەدینی چیە، هەروەها بێدینی چیە؟"[5]. لە لاخیسدا سۆکرات دەپرسێت: "لاخیس، کەواتە با بایەخبدەین بە یەکەمیان، با بڵێین ئازایەتی چیە"[6]. لە خارمیدسدا، سۆکرات بە کوڕە لاوەکە دەڵێت "باشە، یارمەتیمان بدە بڕیار بدەین ئایا ئەوە لە تۆدا هەیە یان نا، پێمان بڵێ، بە بۆچوونی تۆ، میانڕەویی چیە؟"[7]. دایالۆگەکانی سەرەتا شتێکی ناوازەن لە مێژووی فەلسەفەدا، گەرچی هەرگیز وەڵامەکان نایەنە ڕوو. بۆیەشە سۆکرات بەردەوام پرسیار دەکات، ئەو هەرگیز ناگاتە هیچ شتێك جگە لە تەژمی و ئاڵۆزی. کاتێك سۆکرات لە داکۆکیدا پڕ بە دەمی دەڵێت کە ئەو "دەزانێت کە بە کردەوە هیچ نازانێت"[8]، بەمەش دەڵێت لە مەسەلەی ڕەفتاردا هیچ کاریگەرییەکی نیە، ئیتر ئەو هەموو پرسیارکردنە بێکۆتایە دەبێتە مایەی بێزاریی.

ئەم نەزانییە قووڵە پارادۆکسێکی نێودار دەخوڵقێنێت، چونکە سۆکرات بەشی خۆی هەست بە دڵنیایی دەکات کە زانیاریی دڵنیا دەربارەی "یەزدانەکە" بدرکێنێت[9]. ئەم پارادۆکسە، کە بەرپرسیاردان زانین پێشکەش دەکات و پێشکەشیشی ناکات، ئەمەیە کە وادیارە بەشێوەیەکی ئایرۆنییانە ئەفلاتونی پڕ کردبێت لە تاسەی گەڕان بەدوای ڕاستیدا، وەك لەسەرەوە ئاماژەی بۆ کرا. ئەفلاتون بە خۆی دەهاوێتە ژێر سایەی سۆکراتەوە! ئایۆریاکەی سۆکرات پاڵ بە ئەفلاتونەوە نانێت دوور لە سۆکرات و بەرەو فۆرمەکان و ئەو تیوورییانەی کە دواتر بینای کردوون.

لێرەوە میتۆدۆلۆجیای سۆکراتی لای ئەفلاتون بەرەو زانین نەڕۆیشت، جگە لەوەی لێوان لێوی کرد لە ئارەزوویەکی ناسەقامگیرانە بەرەو راستی. بەڵگەیەك هەیە کە دەری دەخات ئەفلاتون هێواش هێواش بۆی دەرکەوتووە کە سەرچاوەیەك هەیە بۆ زانینێکی بالاتر.. ئەم بەڵگەیە لە دابەشکردنەکەی ڤلاستۆسدا دەردەکەوێت لەمەڕ دابەشکردنی دایالۆگەکانی سەرەتا بۆ "دایالۆگە مشتومڕاوییەکان" و "دایالۆگەکانی ناوەڕاست"[10]. دایالۆگەکانی ناوەڕاست پێڕەوی سۆکراتییانە دەخەنە بەر پرسیار، وەك لە پرۆتاگۆراسدا، کە تێیدا شەرمکردنی سۆکرات خۆی لە خۆیدا شەرمکردنی پیاوێکی سۆفیستە[11]. لە دایالۆگەکانی ناوەڕاستدا کە سەر بە ماوەی نێوەندی ئەفلاتونن، کاریگەریی سۆکرات کاڵ دەبێتەوە و میتۆدۆلۆجیاکانی ئەفلاتون خۆیان چەقی کاریگەریی وەردەگرن. لە توێی بەرپرسیاردانی ناو هەریەکە لە مینۆن و کۆماردا، ئەفلاتون ئەوە بە روونی بەکاردەهێنێت، مشتومڕەکە بەجۆرێك رادەکێشێت کە لە دیدێکی فەلسەفییانەی تۆکمەترەوە بچێتە ناو دیمەنەکەوە[12]. ئەفلاتون لەو کارانەدا چەند سەرچاوەیەکی دیکەی زانینمان پێدەناسێنێت، چونکە بگرەوبەردەکەر ناتوانێت لە کاراکتەرەکانیدا هیچ زانینێکی بالاتر بەرهەم بهێنێت. ئەفلاتون، بەجێهێشتنی سۆکرات لە دواوە، بە گەڕان بەدوای ئەو وەڵامانەدا کە هەرگیز سۆکرات نەیدۆزیونەتەوە، هەروەها لە پەرەپێدانی فەلسەفەیەکدا لەسەروو و لە ودیوی ئایدیاکانی سۆکراتەوە، میتۆدۆلۆجیایەك دەخاتە گەڕ کە ئاشنا نیە بە دایالۆگە سۆکراتییەکان. لێرەدا، تیوریی نێوداری فۆرمەکان لە مشتومڕەوە نەهێنراوە، بەڵکو لەو میتۆدۆلۆجییەوە هاتووە کە ئەفلاتون جێگەی مشتومڕی پێدەگرێتەوە. ناکۆکی رەسەن لە میتۆدۆلۆجیای سۆکراتیدا، بووەتە هۆی ئەوەی ئەفلاتون ئارەزوو بکات فۆرمەکان بدۆزێتەوە، بەڵام میتۆدۆلۆجیا پۆزەتیڤەکەی ئەفلاتون لە بنەڕەتدا جیاوازە لە میتۆدۆلۆجیا نێگەتیڤەکەی مامۆستاکەی.

بە دڵنیایی جیاوازی سەرەکی لە نێوانی هەردوو میتۆدۆلۆجیاکەدا، کافییە: سۆکرات هەرگیز ناگاتە زانین، بەڵام ئەفلاتون راستی دەهێنێت بۆ ئەو کەسانەی کە بە تۆوەکەی ئاوسن[13]. لە مشتومڕدا پێشنیاری نێگەتیڤانە دەکرێت و بەس. لە گۆرگیاسدا سۆکرات ئەمە بەتەواویی روون دەکاتەوە، لەوێدا بەردەوام بیری هاوەڵەکانی دەخاتەوە کە یان دەبێت بۆچوونی تایبەتی خۆیان بخەنە روو یاخود واز لە دەمەتەقێکە بهێنن. لە راستیدا ئەمە سیمایەکی سۆکراتییانەیە. مشتومڕ تاقیکردنەوەی سیستمی بۆچوونەکانی تاکەکەسێکە، چەشنە دروستی پێوەرێکە، ئەفلاتونیش هەرگیز هەوڵ نادات بەو شێوازە راستی گەردونی بدۆزێتەوە. هەر هیچ نەبێت، هەرگیز لەوەدا سەرکەوتوو نەبووە. بەمجۆرە دیالەکتیك ئامرازێك بووە بۆ تاقیکردنەوەی بۆچوونە جیاجیاکانی ئەوانیتر، بەڵام خۆی نەیتوانیوە هیچ زانینێك بهێنێتە بەرهەم. بۆیە مشتومڕ بەشێوەیەکی بنەڕەتی نێگەتیڤە، تەنها هەر ئەوەندەی لەدەست دێت کە زریزەی ئەو کەسەی ناو ئەشکەوتەکە بپسێنێت کە دەبێت بە فەیلەسوف.

## میتۆدۆلۆجیا بەرهەمدارەکەی ئەفلاتون

### رەخنەی ئەدەبی

ئەو میتۆدۆلۆجیایەی کە ئەفلاتون بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە پیادەی دەکات، ئەوەی کە

دەیگەیەنێتە زانینێك لەمەڕ راستییە ئەبەدییەکان، رێنمایی دەکات بەرەو جیهانی پڕ پرسیارە سەرسامیی پۆستمۆدێرنیستەکان. ئەفلاتون کاتێکی زۆر سەرف دەکات لە رەخنەکاری لە تێکستەکان و لێکدانەوەی فەلسەفییانەدا، ئەوانەش دەبن بەو میتۆدۆلۆجیایەی کە زانینی پوخت دەداتە دەستی، رزگاری دەکات لە تاریکی ئەشکەوتەکەو مشتومڕەکەشی. چەند نمونەیەك ئەم خاڵە روون دەکەنەوە. یەکەمین نمونەی باش بۆ رەخنە ئەدەبییەکەی ئەفلاتون لە پرۆتاگۆراسدا دەردەکەوێت، چونکە ئەو زانینەی پێشکەشی دەکات، زۆر لە هی ئارگیومێنتەکانی سۆکرات ناچێت. پرۆتاگۆراسی سۆفیستی مەزن بە شیعر دەستپێدەکات[14]. مانای چەند دێڕێکی سایمۆنیدێس دەخاتە روو، دوای ئەو سۆکرات لێکدانەوەیەك پێشکەش دەکات کە باڵاترە: ئینجا هیپیاس وتی "سۆکرات من زۆر بە شیکردنەوەکەی تۆ بۆ ئەم دێڕە کارم تێکرا"[15]. رەنگە بەشێوەیەکی بنەڕەتیتر هەر کتێبێکی ئیلیادەکەی هۆمیر خواستراون یان ئاماژەیان پێدراوە لە کارەکانی ئەفلاتوندا، جگە لە کتێبی هەشتەم[16]. هیسیۆدیش سەرچاوەیەکی ئاشنای تری ناو دەمەتەقێکردنەکانە. ئاماژەی تریش هەیە بۆ ئەو شتانەی دەربارەی ئەپۆڵۆ وتراون یان لە دیلفی دەربارەی وتراون[18]، میتۆلۆجیا، سۆفیستەکان[19]، هەروەها پێش – سۆکراتییەکانیش[20]. ئەفلاتون لەبەر کەم و کورت و بێسەرەوبەرەیی سەرچاوەکان، هەرگیز دایالۆگێکی نەنوسیوە دەربارەی لێکدانەوە یان رەخنە، با بڵێین وەك ئەوەی دواتر فیلۆی ئەسکەندەرییە دەیکات. لەگەڵ ئەوەشدا ئەفلاتون بەردەوام رەخنە دەگرێت و لێکدەداتەوە، میتۆدۆلۆجیا پۆزەتیڤەکەی خۆی بەکاردەهێنێت بۆ وەقسەهێنانی ئەو تێکستانەی کە هی بابەتی دیکەن. بۆیە رەنگە بوترێت کە بە سادەیی ئەفلاتون "شێوازی یۆنانی" بەکاردێنێت و دەگاتە پشتەوەی دەمەتەقێکەی ناو سیمپۆزیەم دەربارەی خۆشەویستی. ئەفلاتون دەست دەبات بۆ لێکدانەوەی وشەش، وەك لە کراتیلۆسدا وەك ئەوە وایە خوێندنەوە لە فەرهەنگێکدا بکات. لە یوتیفرۆندا، ئەفلاتون مانای زاراوەی "بەدینی" شی دەکاتەوە، کە مانا یۆنانییەکەی بریتییە لە وابەستەبوونی کەلتور، بەڵام دەمەتەقێکەی ئەو بە سادەیی زۆر لەوە زیاتر دەڕوات[21]. لەوەش زیاتر، سروت و مۆرکە ئاینییەکانی ناو کۆمار دەری دەخەن کە مەتەڵی ئەشکەوتەکەی ئەفلاتون بریتییە لە کۆمێنتدان دەربارەی سروتە ئەسینایی و فیساگۆرییەکان[22]. رەونی سیمپۆزیەم و فایدرۆسیش پیشانی دەدەن کە ئەفلاتون بایەخی داوە بە فێستیڤاڵە ئاینییەکان[23]. لەکاتێکدا کە یاسا درەنگوەختەکان دەیسەلمێنن کە ئەو دەیەوێت هەتا کۆتایی ژیانیشی هەر خەریکی لێکدانەوەی ئاینی یۆنان بێت[24]. راستەوخۆتر، داکۆکی بریتییە لە لێکدانەوەیەکی درێژی وەڵامە پیسییانەکەیە بۆ چیرۆفۆن، هەروەها، وەك پێشتریش ئاماژەی بۆ کرا، هۆمیر و هیسیۆد بەردەوام لە لاپەڕەکانی ئەفلاتوندا دەردەکەون وەکو سەرچاوەی لێکدانەوەو رەخنەکردن. لێرەوە رەخنەی ئەدەبیی ئەفلاتون و میتۆدۆلۆجیای پۆستمۆدێرنیزم بە باشی بەرەو پشتەوەی پانتاییە ئارامەکەی یۆنان دەیبەن.

بێشومار سەرچاوە هەن کە پێشنیاری سەرلەنوێ هەڵسەنگاندنەوەی میتۆدۆلۆجیای ئەفلاتون دەکەن. ئەفلاتون لە تویێی رەخنەی ئەدەبیی و لێکدانەوەی شارەزایانەوە، نەك لە تویێی مشتومڕو بگرەو بەردەوە، دەگاتە پێشنیارە

فەلسەفییەکان. بەشێوەیەکی بەرچاو لە ئەفلاتونیزمی ناوەڕاستدا شێوازەکەی ئەفلاتون دەرنەکەوتۆتەوە, لێکدانەوە پرشنگدارەکانی ئۆگەستینیش کەمێك لەوە زیاترن کە سۆفیستییەکی بەتین بن. تەنانەت لە سێکیولاریزم و ئەپستمۆلۆجیاشدا, میتۆدۆلۆجیاکەی ئەفلاتون بزرە. هەتا هێگڵ ئەم گەڕانەوەیە بەرەو ئەم گۆشەنیگا سروشبەخشە بۆ مێژوو رووی نەدا, لەودا دیسان رەخنەی ئەدەبی لە فەلسەفەدا دەردەکەوێتەوە.

## لێکچوون و جیاوازی ئەفلاتون لە پاڵ پۆستمۆدێرنەکان و دژیشیانە.

نزیکبوونەوە ئەدەبییەکەی ئەفلاتون دەیگەیەنێتە لای میتۆدۆلۆجیای ئێستای پۆستمۆدێرنیزم. لە سەرەتای زووی لەدایکبوونی سەردەمی پۆستمۆدێرنیزمدا, لێکدانەوەی تێکستەکان لە فینۆمیتۆلۆجیای رۆحی هێگڵدا پایەیەکی نێوەندیی هەیە. مێژووە هاوشێوەکەی ئەو سەرەنجام پەرە دەسێنێت بۆ لێکدانەوەیەکی درێژی ئەنتیگۆنای ئۆفۆکلێس. نیچەش لە لەدایکبوونی تراجیدیادا شوێنپێی ئەو هەڵدەگرێت و مشتومڕ لەسەر سەرلەنوێ لەدایکبوونەوەی رۆحی جەرمانی دەکات بەوەی رەخنە لە شاعیرە مەزنەکانی یۆنان بگرێت. لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا, هایدیگەریش دەربارەی شیعری رۆمانسی جەرمانی دەینوسی, لەکاتێکدا سەرەتای بوون و کاتی بە کوتەیتێك لە سۆفیستەکەی ئەفلاتونەوە دەستپێدەکات. لە هەمان کاتیشدا ڤێتگەنشتاین لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکانی خۆی بە رەخنەیەکی ئەدەبیی درێژ لە پەرەگرافێکی دانپیانانەکانی ئۆگەستین دەستپێدەکات. بۆیەشە دێریدا زیاتر بە رەخنەگرێکی ئەدەبی بانگ کراوە نەك وەك فەیلەسوف. لە راستیدا هیچ ناڕەزاییەك نییە لەوەی رەخنەی ئەدەبی میتۆدۆلۆجیای پۆستمۆدێرنیزم بێت. ئەم بەسەرداگەڕانە کورتە بە روونی ئەفلاتون دەخاتە شوێنی خۆیەوە لەناو نەریتی پۆستمۆدێرنیزمدا.

بوونی ئەو هەموو هاوشێوەییە لە میتۆدۆلۆجیادا, پێشنیاری هاوشێوەیی لە پێڕەوی میتافیزیکیدا ناکات. پۆستمۆدێرنەکان خۆیان پێدادەگرن لەسەر جیاوازیی گرنگ لە نێوانی میتافیزیای ئەفلاتونی و میتافیزیای مۆدێرندا. بۆ نمونە فەلسەفەی نیچە, ئارگیومێنتێکی بەردەوام بووە دژی ئەفلاتون, هەر لە لەدایکبوونی تراجیدیاوە تا دەگاتە ئاوابوونی بتەکان. هایدیگەر لەسەر پێش –سۆکراتییەکان چەق دەگرێت, بە تایبەتی لە پارمندیسەکەیدا, راستییەکی زۆر لە بیریارانی پێش ئەفلاتوندا دەدۆزێتەوە. لە نەریتی شیکاریدا, چیتر بیرۆکەیەکی باو لەگۆڕێ نیە جگە لە جەنگی دژ بە ئایدیالیزمی ئەفلاتونی. پۆستمۆدێرنیزم نمونەی راستەوخۆترین و قووڵترین رەتکردنەوەی فەلسەفەی ئەفلاتونییە لە مێژوودا. ئەم دابەشبوونە میتافیزیکییە دژی ئەو یەکێتییە دەوەستێتەوە کە لەسەرەوە پێناسە کرا, بۆیەشە گفتوگۆکردن و شیکردنەوەی زۆر ناڕەحەتە.

## ئاوێتە هێگڵییەکە ژیانی ناو ئەشکەوتەکە

ستیوارت بارێنت لە کتێبی هێگڵ دوای دێریدادا, تێبینی دەکات کە کاری هێگڵ پایەیەکی ناوازەو تۆکمەی حاشاهەڵنەگری هەیە لە مێژووی فەلسەفەی خۆراواییدا. لە یەك کاتدا ترۆپکی نەریتی فەلسەفی خۆراوایییەو سەرەتای

پووکانەوەشیەتی[25]. بێشك فەلسەفەی هیگڵ وەك خاڵێکی وەرچەرخان وایە لە مێژووی هزردا. کتێبی فینۆمینۆلۆجیای رۆح, لەوکاتەدا پێناسەی فەلسەفەی مێژوو دەکات کە خۆی رادەگەیەنێت مێژوو گەیشتۆتە کۆتایی. هەوڵەکەی ئەو ڕێساکانی نەریتێکی بۆ دوای خۆی جێهێشت لە سەرانسەری کیشوەرەکەدا, نەریتی شیکردنەوە لە کاریگەریی ئەوەوە لەسەر بەریتانا سەری هەڵدا, سەرەنجامیش, هیچ فەلسەفەیەکی پۆستمۆدێرن بە تەواویی هەستی فەلسەفەی پاش هێگڵ دەرنابڕێت. لە ساڵی 1807 دا, مێژوو گەیشتە بەردەمی دیوارێك کە تەنها یەك دەرگای هەبوو: رۆمانسیزمی هێگڵ. ئەگەر بارێنت راست بێت, ئەوا ئەوەی لە دەرگاکەوە چۆتە ژوورەوە بەشێوەیەکی بنەڕەتی جیاوازە لەوەی هاتۆتە دەرەوە: نەریتی فەلسەفی خۆراوا دەسبەرداری تارماییەکە بوو.

ئەو گۆڕانکارییەی لەگەڵ هێگڵدا هات تا رادەیەك سادە بوو. هێگڵ خۆی لە فینۆمینۆلۆجیای رۆحدا کورتی دەکاتەوە. لەوێدا روونی دەکاتەوە کە دەیەوێت راستەوخۆ هێرش بکاتە سەر جیاکردنەوەی نێوانی نۆمینال و فینۆمینال, بە دەسپێك لە دیکارتەوە, کانتیش دەیگەیەنێتە لوتکە[26]. هێگڵ دەڵێت هیچ جیاکارییەك نیە لە نێوانی جیهانی ئەزموون و جیهانی واقیعدا[27]. بە تەنها ئەم راگەیاندنە کۆتایی هێنا بە فەلسەفەی خۆراوایی: لە ئەفلاتونەوە, فەلسەفە بریتی بووە گریمانەی جیهانێکی تر, جیهانێکی راستەقینە, چ ئەگەر لە تیۆلۆجیادا بووبێت یان لە ماتریالیزمدا. بارێنت روونی دەکاتەوە کە هێگڵ بەشێوەیەکی مێژوویی کۆتایی هێنا بەوەی لە لۆگۆسەوە دەستی پێکردبوو, لەو کاتەشەوە, فەیلەسوفان خۆیان بینیوە بوون بە مێژوونوسی داتایەکی ئەزمونی[28].

هێگڵ لە هەنگاوەکانی کۆتایی لێکدانەوەی مێژووییدا رادەگەیەنێت کە فەلسەفەکەی بۆی دەرکەوتووە کە مرۆڤ خۆی خودایە:" مێژوو... بریتیە لە هۆش, پرۆسێسی خودنێوەندی"[29]. هیچ شتێك لەدەرەوەی بوون قابیلی پیادەکردنە. بەو هەنگاوە, مێژووی فەلسەفەی پێش ئەو بە زەروورەت دەبێت بە مێژوو, بەلام بەتەواویی ناردوست و بێسوود. بە سادەیی بڵێین, هێگڵ سەرلەنوێ خودای ناو فەلسەفەو مرۆڤ پێکەوە دەناسێنێتەوە.

ئەم یەکێتییە دۆزراوەیەی زەمین و ئاسمان ناکۆکییەکی روونە لەگەڵ فەلسەفەی ئەفلاتوندا. مەتەڵی ئەشکەوتەکە ناوجەرگەی میتافیزیاکەی ئەفلاتونە. لەوێ فەیلەسوف (لەگەڵ هەموو ئاشقێکی راستیدا) دەیەوێت ئەشکەوتەکە جێبهێڵێت تا بەرەو رۆشنایی فۆرمەکان هەڵبێت, بەلام لای هیگڵ ئەشکەوتەکە چوونە دەرەوەی بۆ نیە, ئەوانەش کە لەناویدان پێیان وتراوە کە لێرە بەدواوە فەیلەسوفان سەرقاڵی کەشفکردنی ئەشکەوتەکە دەبن و هیچی تر لەدەرەوە نیە.. هەموو پۆستمۆدێرنەکان دوای پێشەکییە میتافیزیاییەکانی هێگڵ دەکەون, لە ساڵی 1807 بەدواوە میتافیزیاکەی ئەفلاتون وەلانراوەو جێگای نەماوە، فۆرمەکان لەناو ئەشکەوتەکەدا دۆزرانەوە. هێگڵ بەشی سەرەوەی هێڵی دابەشکردنەکە پووچەڵ دەکاتەوەو لەوێوە سەربانی ئەشکەوتەکە دەگرێت و خودی هەتاویش دەکوژێنێتەوە[30].

لەوکاتەوە زانست بووە بە لێکۆڵینەوەی رەوشی مرۆڤ, وەك ئەوەی بەژێر دۆزەخەکەی ئەفلاتوندا بکشێت و درزە بکات. ئەوە تەنها بە کاریگەریی هێگڵ بوو کە دیسپلینەکانی وەك سایکۆلۆجیا, سۆسیۆلۆجیا, هەروەها مێژووش زەمینەیەکی تۆکمەو شەرعییان بەدەستهێنا.

لەوکاتەوە مرۆڤ سەرقاڵی دۆزینەوەی ئەوەیە کە بە راستی لەناو ئەشکەوتەکەدا روودەدات: مرۆڤ بوو بەو نهێنییەی جێگەی خودای گرتەوە. سەرنجێکی کورت لە پێشەکییەك بۆ سۆسیۆلۆجیای پیتەر بێرگەر، ئەوە روون دەکاتەوە. دوای برشگەیەکی بێخودایانە دەربارەی چێژی سۆسیۆلۆجیا، بێرگەر دیسپلینەکە دەخاتە گەڕ وەك "فۆرمێکی هۆشیاری"[31]. پێشنیار دەکات کە تاکێك لە رووی سۆسیۆلۆجیاوە ئاگادا خەبەری بۆتەوە، کە بەشێوەیەکی سەیر وێنەی ئەشکەوتەکەی ئەفلاتونمان دێنێتەوە بیر. بێرگەر لەسەری دەڕوات و دێتە سەر سۆسیۆلۆجیای ئێستاو بە درامایەك دایدەنێت کە کە لەنێوانی کۆمەڵگای سنورکراو بە مرۆڤ و مرۆڤی سنورکراو بە کۆمەڵگادا دێت و دەچێت، بۆیە جەخت دەکات کە ئاشقانی حەقیقەت (هۆشی سۆسیۆلۆجییانەی خۆی) بە تاریکسانی ئەشکەوتە بێ دەربازەکەی هێگڵ سنور کراوە. لە کۆتاییدا ئێتیك کورت دەکاتەوە بۆ: "چۆن راست و هەڵە بناسین و بەردەوامیش ببین لەسەر فریودان"[32]. پۆستمۆدێرنیزم بەشێوەیەکی بنەڕەتی سیستمێکی داخراوان دەخاتە بەردەست، پێویستە مرۆڤ بڕیار بدات کە پێویستە چی لێ بکرێت. یۆتۆپیاش جێماوە بۆ ئیشتێداکردنی گشتی، جیهانە یەزدانییەکەی ئەفلاتون رەوییەوە.

سۆسۆلۆجیا بەشێوەیەکی بێسەرەو بەرە هەڵبژێردراوە. دەشێت هەمان شت لەگەڵ هەر بوارێکی ئێستای لێکۆڵینەوەدا بکرێت، بەڵام مەسەلەکە روونە. پێویستە ئێستا پرسیارەکە ئاوا بکرێت: بۆچی لە پۆستمۆدێرنیزمدا میتۆدۆلۆجیاکەی ئەفلاتون نوشوستی دەهێنێت؟ دواجار راستی دەربارەی خودا لەناو تێکستدایە. ئەو تێکستانەی ئەفلاتون لێکی دانەوەو شی کردنەوە دڵگیر و سروشتی بوون، لە سەرچاوەیەکی ئاسمانییەوە هێنرابوون. هۆمیر و هیسیۆد و شاعیرەکانی تر و فەیلەسوفە پێش سۆکراتییەکانی دیکە[33]، کارەکانی خۆیان وەکو سروشێك لە خوداکانەوە وەرگرتووە. کتێبخانە دڵگیرەکەی ئەفلاتون بێشومار بیرۆکەیان پێبەخشیوە دەربارەی جیهانی دەرەوەی ئەشکەوتەکە، چونکە نوسەرەکان، مرۆڤ، بەناوی خوداوە قسەیان کردووە. لە دەستوری سۆفیستانەدا، تێکستەکان خرابوونە لاوە، بە سادەیی چونکە بەدوای هیچ خودایەکدا نەگەڕاون. کاتێك هێگڵ فینۆمینال و نۆمینالی ئاوەلاکرد، دیسانەوە تێکستەکان بوونەوە بە باشترین سەرچاوە بۆ زانینی خودا، بەڵام ئەو دیسان پێناسەی خودای کردەوە، تێکستەکانی مێژوو تا رادەیەك بوونەوە بەوەی کە بۆ ئەفلاتون هەبوون، پۆستمۆدێرنەکان ئەو خودا رووت و قووتەیان هەڵگرتەوە کە هێگڵ بۆی پێناسە کردبوونەوە. مرۆڤ بە لێکۆڵینەوەی تێکستەکان باشتر دەتوانێت لە مرۆڤ بکۆڵێتەوە. مێژوونوسان و رەخنەگرتن لە تێکستەکان تاجیان لەسەر نرا. هێگڵ کە سەرلەنوێ پێناسەی ئایدیۆلۆجیایەکی کردەوە، دەسپێکێکی تری دامەزراند، ژیانێکی میتۆدۆلۆجی لە مەرگێکی میتافیزیاییانەوە هێنایە دەرەوە.

## بەرەنجام

هێگڵ بە گەمەکردن لە مەسەلەی مەرگ و ژیانەوەی مەسیحدا، دواهەمین هێڵی گەڕانە زەمینییەکەی کێشا: "تەنها لە مەدالیای ئەم جیهانەی رۆحەوە، ناکۆتابوونی خۆی کەفی بۆ دەکات"[34]. پۆستمۆدێرنیزم بریتییە لە ژیانێك لەمەرگەوە هاتۆتە دەرەوە: هێگڵ تەرمی ئەفلاتونی خستە ناو ئەشکەوتێکی تاریکی وەکو گلکۆوە،

بەڵام لە میتۆدۆلۆجیادا دیسان بینای کردەوە، بەوەی بەناوێکی دێرینەوە بەدوای خودایەکی نوێدا گەڕا. مرۆڤ هەست بکات لەم جیهانە نوێیەدا لە ماڵی خۆیدایە، یاخود شیوە بۆ رابردووی قەشەنگ بکات، ئەوە بۆ خوێنەر جێهێڵدراوە. چ ئەگەر وەڵامێک بدۆزێتەوە، یاخود وەڵامەکە دۆزرابێتەوە، هێشتا هەر پێویستە خوێندکاران خۆیان رووبکەنە تێکستەکان و لێیان بکۆڵنەوە.

## پەراوێزەکان

*[1] Phaedo 97c. All works by Plato are cited in Stephanus notation, and all direct quotes are taken from Cooper's collection.*

*[2] Vlastos, Gregory, Socrates, Ironist and Moral Philosopher (New York: Cambridge University Press, 1991) 46-47.*

*[3] Plato implicitly promotes something called the dialectic in the Republic 509d-511e, just after describing the famous Divided Line. For this reason some believe that the Theory of Forms is the foundational justification for the dialectic or elenchus.*

*[4] Socrates, Ironist and Moral Philosopher 48.*

*[5] Euthyphro 5d.*

*[6] Laches 190d-e.*

*[7] Charmides 159a.*

*[8] Apology 22d.*

*[9] Crito 54d-e. Apparently, the elenchus does lead to answers—providing particular solutions for real situations—for Socrates and Crito come to know that one should not break free from jail, and Socrates remains to suffer his sentence on that account.*

*[10] Socrates, Ironist and Moral Philosopher 46-47.*

*[11] Interestingly, the Protagoras is one of the earliest dialogues with extensive literary criticism. This will be discussed below.*

*[12] These are the first half of the Meno and the entirety of Book I of the Republic. In both of these works, Plato compares the elenchus to Greek initiation ritual, likely suggesting a much more complicated understanding of its role, and likely a more positive understanding. To discuss the full implications of this is beyond the scope of the present work.*

*[13] Theaetetus 148e-151e.*

*[14] Protagoras 339a. The section of literary criticism extends from this point to 347b, including a rebuttal from Socrates.*

*[15] Protagoras 347b.*

*[16] Cooper 1773.*

*[17] Cooper 1772.*

*[18] Protagoras 343b.*

*[19] Theaetetus 152a.*

*[20] Timaeus 49b-c and Graham, Daniel W., The Texts of Early Greek Philosophy (Unpublished Manuscript, 2003) Testimony 3.6. This allusion to Anaximenes was pointed out to me by Dr. Graham.*

*[21] It is my opinion that the heavy subject of this dialogue actually, and especially Plato's focus on ritual, places it later in Plato's career. Arguments for this must be presented elsewhere.*

*discussed below, is as old as Plato's Allegory of the Cave.*

[27] *Consciousness is immediately acquainted with all of what is in-itself, according to Hegel, and the trail to absolute knowing is nothing more than the discovery and reconciliation of contradiction within consciousness. See Hegel 52-53.*

[28] *Hegel After Derrida 9.*

[29] *Hegel 492. Emphases are the translator's.*

[30] *It is interesting that in the penultimate sentence of Hegel's lengthy work, he calls the last steps of history's process an "inwardizing." See Hegel 493.*

[31] *Berger, Peter L., Invitation to Sociology (New York: Anchor Books, 1963) 25.*

[32] *Berger 151.*

[33] *Vlastos, Gregory, "Theology and Philosophy in Early Greek Thought," in Daniel W. Graham, ed. Studies in Greek Philosophy: The Presocratics. (New Jersey: Princeton University Press, 1995) 3.*

[34] *Hegel 493.*

## سەرچاوە

*Joseph Spencer*

*Plato Among and Against the Post-Modernists*

[22] *Michael Morgan in Platonic Piety: Philosophy and Ritual in Fourth-Century Athens (New Haven: Yale Univesity Press, 1990) 100-157, interprets the Republic as a lengthy commentary on Greek education ritual, such as the Eleusinian mysteries. Further, Walter Burkert in Greek Religion (Massachusetts: Harvard University Press, 1985) 280, mentions that Pythagoras was said to have descended into a cave to be initiated into the higher mysteries. Plato is likely making reference to these rituals in his allegory.*

[23] *Morgan, Michael, "Plato and Greek Religion," in Richard Kraut, ed. The Cambridge Companion to Plato. (New York: Cambridge University Press, 1992). 232.*

[24] *Burkert 332-337.*

[25] *Barnett, Stuart, ed. Hegel After Derrida (New York: Routledge, 1998), 26; see also Robert Solomon, In the Spirit of Hegel. (New York: Oxford University Press, 1983) 205.*

[26] *Hegel, G.W.F., Phenomenology of Spirit, trans. A. V. Miller (New York: Oxford University Press, 1977) 47. Hegel suggests that this is the Cartesian project, but otherworldliness, as will be*

# "مارتن هایدگەر" لە فەرەنسا

هاشم سالّح
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد



*Heidegger in France*
*Dominique Janicaud*
*Albin Michel- Paris*

لــەژێر ناونیشــانی (مــارتن هایدگەر لـە فەرەنسا)، توێـژەری فەرەنسایی "دۆمینیک جانیکۆ" کتێبێکــی قــەوارە گــەورەی بەدووبەش سەبارەت بە چۆنیەتی گواســـتنەوەی فەلســـەفەی "هایدگــەر" لەئــەڵمانیاوە بــۆ فەرەنســا بەچــاپ گەیانــد. "جانیکۆ" مامۆستای فەلسەفەیە لــەزانکۆی (نــیس)و پرۆژەکــەی پرۆژەیــەکی گــەورەو ســەرنج راکێشە. ئەمە بۆ یەکەمین جارە، بیریارێـــك هەڵدەســـتێت بـــەتاوتوێکردنی کاریگـــەری "مارتن هایدگـەر" لەسـەر کایـەی رۆشنبیری فەرەنسی.

لەبەشـــی دووەمـــی ئـــەم کتێبەدا، نوسـەر لانیکـەم تـەواوی هایدگەرییەکانی فەرەنسا دێنێتە قســـە، هـــەر لـــە "کۆســـتاس ئەکســـلیۆس"ەوە تــا "مێشــل دیگی و ژاك دێریداو ژان بێرڤای و ...هتــد". هــەر یــەکێك لەوانــە بەدوورو درێژی باسی پەیوەندی خـــۆی لەگـــەڵ "هایدگـــەر"دا دەکات.. چۆن چۆنی ناسیویانە یــاخود کــەی بــۆ یەکــەم جــار تێکســـتەکانیان خوێندۆتـــەوە. ئـــەم گفتوگۆیانـــە خۆشـــن و مـــرۆڤ لەخوێندنـــەوەیان بێـــزار نابێت.

لە ڕاستیدا ئەو ئیشکالیەتەی ئـــەم کتێبـــە باســـی لێـــدەکات، گشـتیەو"هایدگەر" سـەرەڕای گرنگیشـــی تێدەپـــەڕێنێ. ئـــەو پرسـیارەی دەکرێت بەمجۆرەیـە: چـۆن کـارلێکی کلتـوری لـەنێوان دوو ژینگـــەی جیـــاواز یـــان دووزمـــانی دوور لەیـــەکی، وەك زمـــانی ئەڵـــەمانی و زمـــانی فەرەنســـــــــیدا ڕوودەدات؟ لەپرۆســـەی گواســـتنەوە لـــە زمانێکـــەوە بـــۆ زمـــانێکی دی یاخود لە کلتورێکەوە بۆ یەکێکی تـــر، چـــی ڕوودەدات؟ ئایـــا "هایدگـەر"ی فەرەنسـی هـەمان "هایدگەر"ی ئەڵمانییە یاخود لـە ئەنجامی پرۆسـەی گواسـتنەوەو وەرگێڕاندا، هەندێك گۆڕان بەسەر کارەکتەری خۆی و بیروبۆچونیدا دێـت؟ دەکرێـت هـەمان پرسـیار ئاراســـتەی کایـــەی رۆشـــنبیری عـــــەرەبیش بکـــــەین.. ئایـــا "ســـارتەر"ی عـــەرەبی هـــەمان "سارتەر"ی فەرەنسییە، یاخود "مـــارکس"ی عـــەرەبی خـــودی "مارکس"ی ئەڵمانییە؟

خوێنـەری ئاسایی پێی وایـە یەك شتن، بەڵام ئەوانەی پسپۆری بواری مێژووی فیکرن، دەزانن کە واقیـع وا ناڵێـت. بێگومـان ئـەم بەراوردکردنـە زوڵـم لەکایـەی رۆشـنبیری فەرەنسـی دەکـات، لەبەرئەوەی لە بواری وەرگێڕان و گواســـتنەوەی دەقەکانـــدا زۆر جـــدیترە، هـــەروەها لەبـــەر ئـەوەی لەپرۆسـەی هەماهـەنگی کلتـــوری لەگـــەڵ سەرچـــاوە بیانییەکانـــدا، توانایـــەکی زۆر زیاتری هەیە.

ڕۆشـــنبیری فەرەنســـی دەتوانێت بـۆ یـەك دەق، زیـاد لـە وەرگێڕانێـك بەردەسـت بخـات و تێکستەکانی "هایدگەر"یش زیاد لـە جارێك وەرگێڕدراونەتـە سـەر زمانی فەرەنسی. ئەمەش شتێکە

تائێستا کایەی رۆشنبیری عەرەبی دەستی بەسەریدا ناشکێت.

سەرەڕای ئەوە، پرۆفیسۆر "جانیکۆ" دان بە زیان و خراپی هەندێك لەو وەرگێڕانانەدا دەنێت کە کراون. لەو پێشەکیە گشتیەدا کە بۆ بەشی یەکەمی کتێبەکەی نوسیوە، دەڵێت: (وەرگێڕانی هایدگەر لەلایەن ئێمەوە، ئیتر بەشێوەیەکی باش بێت یان خراپ، مەسەلەیەکی لاوەکی نییە. هەندێك جار وەرگێڕانەکان باش و سەرکەوتووبوون و هەندێك جاریش خراپ و بێکەڵك بوون! لەڕاستیدا وەرگێڕان هەمیشە رەنگدانەوەی باکگراوەن و نیەتی ئەو کەسانەیە کەپێی هەڵدەستن. وەرگێڕکاران بەباڵیۆزی سەردەمانی کۆن دەچن کەدەیانتوانی شەڕ لەنێوان دوو وڵاتدا دروست بکەن، یاخود بەپێچەوانەوە لێکیان نزیك بخەنەوە و پەیوەندیان بەهێزتر بکەن).

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە وەرگێڕانی بابەتی بەشێوەیەکی رەها بوونی نییە، بەڵام مەحاڵی ئەم شتە ئەوە ناگەیەنێت کە هەموو وەرگێڕانەکان وەکو یەکن. ئاشکرایە وەرگێڕانی چاك وەکو وەرگێڕانی خراپ نییە. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە هەتا ئیستاش خەڵکی بەچاکی باسی یەکەمین وەرگێڕانی "هایدگەر" بۆ سەر زمانی فەرەنسی دەکەن، کەخۆرهەڵاتناسی ناسراو "هنری کۆربان"، خاوەنی کتێبی (مێژووی فەلسەفەی ئیسلامی) ئەنجامیدا. "کۆربان" ساڵی ***1938*** واتە بەر لەجەنگی دووەمی جیهانی، دەقە بەناوبانگەکەی "مارتن هایدگەر" (میتافیزیکا چییە)ی وەرگێڕایە سەر زمانی فەرەنسی. هەرچی کتێبە مەزنەکەشیەتی (بوون و کات)، بەم دوایانە نەبێت بەتەواوەتی وەرنەگێڕدرایە سەر زمانی فەرەنسی.

(بوون و کات) لەلایەن دوو پسپۆڕ لە فەلسەفەی "هایدگەر"دا، دوو تەرجەمە کرا، یەکێکیان لەساڵی ***1985*** بڵاوکرایەوە دووەمیشیان ساڵی ***1986***! لەنێوان ئەو دوو وەرگێڕەدا ململانێیەکی توندوتیژ روویدا، ئەمەش وایکرد ئەو مەسەلە ئەبەدییە بێتە ئارا کەپەیوەندی بەهەموو وەرگێڕانێکەوە هەیە، مەسەلەکەش ئەوەیە: ئایا دەبێت دەقاو دەق تێکستێك وەرگێڕین، یاخود ئەوەی پێویستە گواستنەوەی ناوەڕۆك و رۆحی بابەتەکەیە؟ من لەلای خۆمەوە لایەنگری دووەمیانم و ئەوەیانم پێ باشە، بەتایبەت کە بە درێژایی چارەکە سەدەیەك و تا ئێستاش خەریکی پرۆسەی وەرگێڕانم.

هەر چۆنێك بێت، "هایدگەر" یەکێکە لەوانەی کێشەو ململانێی فیکری لەکایەی رۆشنبیری فەرەنسیدا لەسەر دروست بووە. ئەڵبەتە خۆی دەستی لەو مەسەلەیەدا نەبووە، بەڵکو رۆشنبیرانی فەرەنسا لە ناوخۆیاندا بەشەڕهاتن لەسەری، ئەویش بۆ یەکلایکردنەوەی کێشەکانی نێوانیان. یەکێك لەو شەڕانە لەسەر وەرگێڕانی کتێبی (بوون و کات) بەرپا بوو، بەڵام شەڕی گەورەی ئایدۆلۆژی لەسەر کتێبەکەی "ڤیکتۆر ڤاریس" (هایدگەر و نازیزم) روویدا، کە لە ساڵی ***1987*** چاپکرا. لەگەڵ دەرچونی رۆژنامەکانی فەرەنسا شاڵاوێکی بێ ئامانیان دەست پێکرد، بۆ لێدانی "هایدگەر"و کورتکردنەوەی تەواوی فیکرو فەلسەفەکەی بۆ تەنها فەلسەفەی نازیزم!

ئەم هەڵمەتی پروپاگەندە کردن و ناوبانگ زڕاندنە، شتێکی ترسناکەو بەپرۆسەی کوشتن و پاکتاوکردن دەچێت، بەڵام

لەبەرامبەر ئەو شاڵاوە ناڕەوایەدا فیکری "هایدگەر" بەسەرکەوتویی هاتە دەرێ. تا ئێستاش بەردەوام خەڵك بەرهەمەکانی دەخوێننەوە, لەسەری دەنوسن و دکتۆرا لەسەر فەلسەفەو مەزنی ئەو وەردەگرن. ئەمە مانای ئەوەش ناگەیەنێت "هایدگەر" هیچ هەڵەیەکی نەبووەو بێ گوناهە, بەڵام کەس ناتوانێت لەڕێی پڕوپاگەندەو درۆی هەڵبەستراوەوە فیکرو حەقیقەت زیندە بەچاڵ بکات.

ئاشکرایە وێنەی "هایدگەر" لەئەڵمانیا, زۆر جیاوازە لەو وێنەیەی لەفەرەنسادا هەیەتی. لەئەڵمانیادا پاش جەنگی دووەمی جیهانی, فیکری ئەو لەگەڵ فیکری "نیچە"دا سانسۆریان لەسەر دانراو بەگومان دەوروەدران. کەس نەیدەتوانی بەشێوەیەکی بابەتی باسیان بکات, لەبەرئەوەی گرێی دەرونی ئەڵمانی –واتە گرێی هەستکردن بە گوناه وتاوان–, بواری ئەوەی نەئەدا تا بەهێمنی و سەنگینی تاوتوێی فیکری ئەوان بکرێت.

بەڵام پێدەچێت مەسەلەکان بەرەو ئەوە بڕۆن گۆڕانیان بەسەردا بێت, بەتایبەت پاش ئەوەی "گێرهارد شرۆیدەر"ی راوێژکاری ئەڵمانیای گەنج و بەهێز, بەتوندی دژی ئەوە وەستایەوە کەنابێت تاقیامەت ئەڵمانەکان بەتاوانی نازیزم سەرکۆنە بکرێن!

بەڵام لەفەرەنسا رۆشنبیران بەدەست ئەو گرفتەوە ناناڵێنن و ئەو گرێیەیان نییە, لەبەرئەوە پێشوازیەکی بەشکۆیان لە "هایدگەر" کرد. بەمەش ئەڵمانەکانیان توشی شۆك کرد. کاتێك "هایدگەر" دوای جەنگی دووەمی جیهانییان لەساڵانی پەنجاو شەستەکاندا سەردانی فەرەنسای دەکرد, وەك سەرۆك دەوڵەتێك پێشوازی لێدەکرا. وەها ستایشیان دەکرد, وەك ئەوەی "ئەفلاتون" یان "ئەرستۆ" بێت.

ئەگەرچی فەیلەسوفێکی وەك "یورگن هاپرماس" دان بەوەدا دەنێت کەکتێبی (بوون و کات, *1927*)ی "مارتن هایدگەر" گرنگترین کتێبی فەلسەفیە کە لەدوای کتێبی (فینۆمینۆلۆژیای رۆح, *1807*)ی "هیگڵ"ەوە دەرچوویێت, بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا "هاپرماس" ناتوانێت بەشێوەیەکی بابەتی قسە لەفیکری "هایدگەر" یان "نیچە" بکات, لەبەرئەوەی وەکو ئەوان ئەڵمانییەو گرفتاری گرێی نازیزمەو ناتوانێت یەك وشە بڵێت. لەبەشێکی تری ئەم کتێبەدا "دۆمێنیك جانیکۆ" دەڵێت: (بەدرێژای حەفتا ساڵ هایدگەر لە ناوەندی ژیانی رۆشنبیری فەرەنسیدا بووە, واتە لەساڵی *1930* تا ساڵی *2000*, بەڵام ئامادەبوونی بەشێوەیەکی بەردەوام و وەك یەك نەبووە. چەند قۆناغێك هەیە لەپێشوازیکردن و مامەڵەکردن لەگەڵ فیکری ئەودا, بەڵام دەتوانیت بڵێین دوو قۆناغی سەرەکی هەن: قۆناغی بەر لە تیرۆرکردنی لەلایەن ڤیکتۆر ڤاریاسەوە, ئەویش بەتاوانبارکردنی بەنازیزم و قۆناغی پاش ئەوە).

لەدرێژەی قسەکانیدا "جانیکۆ" دەڵێت: (سەرەڕای جیاوازی زۆری نێوان هایدگەر و نیچە, بەڵام ئەوەی کۆیان دەکاتەوەو خاڵی هاوبەشی نێوانیانە ئەوەیە کە هەردووکیان لە فەرەنسادا پێشوازیەکی گەرم و تایبەتیان لێکرا. ئەوان بەجۆرێك ناوەندە رۆشنبیریەکانی فەرەنسا پێشوازی لێکردن تا گەشتنە ئاستی ئەوەی ببنە دوو فەیلەسوفی فەرەنسی تەواو.. هایدگەر و نیچە بە جۆرێك

لەگەڵمان تێکەڵ بوون، وەك دوو فەیلەسوفی بیانی نەمانەوەو بوون بەیەکێك لە ئێمە. ئەمەش بەفیعلی دیاردەیەکی سەرنج راکێشە، بەتایبەت هایدگەر کەسێك بووە ستایشێکی زۆری رۆحی جێرمانی کردووەو فەیلەسوفێکی لوت بەرزبووە. بەلاّم نیچە رەخنەی زۆری لە ئەڵمانەکان دەگرت و تەنانەت جنێویشی پێ دەدان، کۆی لەوەش نەدەکردەوە کەفەرەنسیەکانی لەوان پێ باشتربێت. زۆرجار سەرسامی خۆی بەرۆحی فەرەنسی دەربڕیووەو بەرۆح قورسی ئەڵمانەکانی بەراورد کردووە. ئەمەو سەرەڕای بلیمەتی فەلسەفی و شیعری، وا دەکات رۆشنبیرانی فەرەنسی خۆشیان بوێت و سەرسام بن پێی. بەلاّم شتێکی لەمجۆرە لای "هایدگەر" نییە و زۆر جاران لەسەرەوە لەفەرەنسیەکانی روانیوەو تەنانەت لەرووی فەلسەفیەوە بەساکارو سوکەڵەی لە قەڵەم داون!).

ئەو پێی وابوو لەدنیادا دوو زمان هەن بۆ فەلسەفاندن، ئەوانیش زمانی یۆنانی و زمانی ئەڵمانین. فەرەنسیەکان ئەوەیان بەسەو شانازییە بۆیان کە فەیلەسوفانی ئەڵمانیا وەردەگێڕن، ئەم هەڵوێستەی بەسوك سەیرکردنێکی گەورەی فەرەنسیەکانە، بەلاّم سەرەڕای ئەوەش ئەوان "هایدگەر" دەپەرستن. ئەڵبەتە دواتر فەرەنسیەکان وەلاّمیان دایەوەو بەبیریان هێنایەوە کەئەوانیش، خاوەنی فەیلەسوفانی گەورەی وەك: "دیکارت و پاسکاڵ و ژان ژاك رۆسۆ"ن، بەلاّم "هایدگەر" لەم رووەوە نەتەوە پەرستێکی توندڕەو بوو.

دەبێت بڵێین کەم تا کورتێك ئەو لەم رووەوە لەسەر هەق بوو، چونکە کەس ناتوانێت نکوڵی لە هەژمونی فەلسەفەی ئەڵەمانی بکات بەسەر جیهانی نوێدا، وەك چۆن فەلسەفەی یۆنانی هەژمونی بەسەر جیهانی کۆندا هەبوو. ئەگەر بێتو ناوی "کانت و هیگڵ و نیچەو مارکس و فرۆید" لابەرین، چی لەفەلسەفەی نوێ دەمێنێتەوە؟

خاڵێك هەیە کە نەیهێشتووە "هایدگەر" لەناو جوغزی دەمارگیری جێرمانیدا بمێنێتەوە، ئەویش شیعرە. وەکو دەزانرێت "هایدگەر" لە دووەم قۆناغی ژیانی فیکری خۆیدا، گرنگیەکی زۆری بە گوتەی شیعری دەدا، نەك تەنها بە گوتەی فەلسەفی لۆژیکی یان ئەقلاّنی. شاعیر هاوتای فەیلەسوفە لە گەڕان بە دوای پاکی و بێگەردی و پاشان دۆزینەوەی و گوزارشتکردن لێی بەوشە. کەواتە شاعیرو فەیلەسوف بەدوای هەمان شتدا دەگەڕێن، بەلاّم بەدوو ستایلی جیاواز. هەردووکیان رۆدەچن لەپێناو سۆراخکردنی جەوهەری بوندا، بەلاّم ئەڵبەتە هەموو شاعیرێك ئەوە ناکات و توانای ئەو کارەی نییە. ژمارەیەکی کەمی شاعیرە مەزنەکان توانیان ئەوە بکەن. ئەوانەش بەبۆچونی "هایدگەر" بریتین لە: "هۆڵدەرلین، جۆرج تراکل، رینیە ماریا رێلکە، رامبۆ، رینیە شار". دوان لەمانە فەرەنسین. بەمجۆرە هایدگەر" دانی بە بلیمەتی فەرەنسیەکاندا نا، لانیکەم لەبواری شیعردا. سەرەڕای ئەوەش لەکتێبخانەکەیدا، دیوانە شیعری شاعیرانی وەك: "جێرار دی نێرڤاڵ و بۆدلێرو مالارمێ و پۆل ڤالێری.." تێدابووە.

"فلیپ سۆلێرز" یەکێکە لەو بیرمەندە فەرەنسیانەی تەنها بەناوی هایدگەر" سوێند دەخوات، دوای ئەوەی زۆربەی

رۆشنبیرانی فەرەنسا لەسەروبەندی ئەو شالاوە تیرۆرستیە ناڕەوایەی سالی 1987 لە دژی دەستی پێکرد، دەست بەرداری بوونو وازیان لێهێنا.

"سۆلێرز" دەلێت: (هایدگەر تاکە بیریارێکی هاوچەرخە کە دەتوانێت گفتوگۆ لەگەل گەورە شاعیرانی وەك هۆلدەرلینو رامبۆدا بکات. ئەو لەسەردەمێکدا دەیانهێنێتە قسەو دیالۆگیان لەگەلدا ساز دەکات، کە زەوی لەلایەن عەدەمیەتی تەکنەلۆژیەوە پایەمال کراوە. ئاقاری هیومانیزم مردو لەسەردەمی تەکنەلۆژیاو سەرمایەداری پراگماتیدا بەشت بوو. هیچ نەماوە جگە لە دەنگی شیعری مەزن، دەنگی رامبۆو هۆلدەرلین، بۆ ئەوەی بەبیرمان بێننەوە کەپاكو بێگەردی سەرەتا بەتەواوەتی نەمردووەو رۆحیش بەیەکجاری خۆرئاوای جێنەهێشتووە).

**سەرچاوە**

الشرق الاوسط, 2002/12/15.

## لوران گۆدی و خەلاتی ئەدەبی گونکۆری 2004

**عەبدە وازن**

**لە عەرەبییەوە: سەردەم**



خەلاتی ئەدەبیی گونکۆری فەرەنسی سالی 2004 درا بە رۆماننووس- لوران گۆدی-ی تەمەن 32 سال. خەلاتەکە لەسەر رۆمانی "خۆری خێزانی سکورتا"یە کە لە بنکەی بلاوکردنەوەی "ئێکت سود" بلاوبۆتەوە. ئەو لیژنەیەی دەستنیشانی ئەم رۆمانەی بۆ خەلاتەکە کرد، دوو ناوی تری لە بەردەست بوو کە لە کێبڕکێی بردنەوەی خەلاتەکەدا بوون، ئەوانیش ئالان جوبیر سێ دەنگی هێناو مارك لامبرون دوو دەنگی هێنا. هەر چەندە ئەم خەلاتە گەورەیە شانازی و رێزە بۆ گودیە لە هەمان کاتدا رێزلێنانیشە بۆ ئەو بنکەیەی سالی 1978 دامەزراوە و ئەمە یەکەمجاریەتی خەلاتی وا بکرێت.

لوران گودی سالی 2002 خەلاتی گۆنکوری قوتابیانی لەسەر رۆمانی "مەرگی شاتسونگو" وەرگرت.

ئەو کەسەی رۆمانی "خۆری خێزانی سکورتا" بخوێنێتەوە هەست بەوە دەکات فیلمێکی دیوە تا دەقێکی خوێندبێتەوە. لوران پێش ئەوەی رۆماننووس بێت لە شانۆوە هاتۆتە ناو ئەم جۆرە ئەدەبیەوە، ئەمە سێیەم رۆمانیەتی دوای هەشت شانۆگەری و ئەم رۆمانەیش و تاڕادەیەك مەنەلۆژەکانی مۆرکی درامایان تیایە. پوختەی رۆمانەکە لەوەوە دەست پێدەکات کە پالەوانی رۆمانەکە "لوسیانو" بە سواری گوێ درێژێکەوە بە رێگایەکی چۆلی لادێدا تێدەپەڕێت، کات قرچەی نیوەرۆیەکی هاوینەو ئارەق دەڕێژێت. لوسیانو دوای پانزە سال تازە لە زیندان هاتۆتە دەرێ چونکە رێگری کردووە و لەسەر ئەوە گیراوە.

ئێستا بەرەو گوندەکەی مونتیبوشیوی بە هاوینی گەرمی

هەژار و دوور دەچێت لە باشوری ئیتالیا. لوسیانو دەیەوێت تۆڵە لە خەڵکی گوندەکە بکاتەوە، بەڵام نەك وەك جاران بە ڕێگری و دزی و کوشتن، بەڵکو تۆڵەکەی ئەمجارەی بە خۆشەویستیە، ئەو خۆشەویستیەی هەمیشە لە ناو زیندانــدا خەونی پێوە دیـوە. لوسیانو لەسەرخۆ دەڕواتە ماڵی خێزانی بیسکوتی، کە فیلومینا بە تەنیا دەبینێت لە ئامێزی دەگرێت، رووتی دەکاتەوە و لەگەڵیدا جووت دەبێت، فیلومینا قەیرەکچە و شووی نەکردووە. وەك دەمێك بێت ئەویش وەك لوسیا بە تەمای ڕووداوێکی وا بێت نە قسە دەکات و نە بەرگری، بەڵام سەیر لەوەدایە کە سیانو لەگەڵ "ئیماکولاتا"دا جووت بووە کە خوشکی فیلومینایە و تەواو لەو دەچێت، فیلومینا لە کاتێکدا مردووە کە سیانو لە زینداندا بووەو، ئەمیش لە خۆشیاندا دەمرێت لەبەرئەوەی بە ئاواتی چەند ساڵەی گەیشتووە.

کە لوسیانو لە ماڵی بیسکوتی دەردەچێت کۆمەڵێك ژنی ڕەشپۆش دەبینێت، کەسیش لە خەڵکی گوندەکە لێی ناپرسێت بێجگە لە جیورجیوی قەشە. بەڵام دەنگێك لە دوورەوە دێت کە دەڵێت: "لوسیانو، ئەمڕۆ ڕۆژی مەرگتە" ئەوەندەی پێناچێت کە دەوری بە کۆمەڵێك پیاو دەگیرێت کە بەدار و خاکەناز تێیبەردەبن تا دەکەوێت و خوێنی لەبەر دەڕوات. لوسیانو وەك جاران بەرگری لە خۆی ناکات، بەڵکو وەك بیر لە رابوردوی خۆی بکاتەوە کە جەردە و پیاوکوژ و دزبووەو ئێستا لە باتی بکوژ ببێتە قوربانی هیچ دەستیان لێ ناکاتەوە و وازیان لێدێنێت تا بە تەواوی دەیکوژن. لوسیانو لە ڕۆمانەکەدا دەبێتە نەوەی یەکەمی بنەماڵەی ماسکالزونی کە پاشان دەبێتە خێزانی سکورتا. ئەم نەوەیە لە ساڵی 1875 وە واتا تا لە لوسیانووە دەست پێدەکات تا ساڵی 1980 کە بە "ئانا"ی دوانەوە کۆتایی دێت و بە هەموو پێنج نەوە بە خۆوە دەبینێت. سەیری دووەم لە ڕۆمانەکەدا ئەوەیە کە (ئیماکولاتا)ی قەیرە کچ کە بۆ یەکەمجار و دواجار لەگەڵ پیاوێکدا نوستوە لە لوسیانو سکی پڕ دەبێت، کوڕێکی زۆڵی لێ دەبێت و بەسەریەوە ئەویش دەمرێت. خەڵکی گوندەکە کە دەیانەوێت ئەم منداڵە زۆڵە لەناو بەرن. بەڵام جیورجیوی قەشە فریای منداڵەکە دەکەوێت و لای خێزانێك لە گوندێکی تر دەیشارێتەوە، کوڕەکە ناوی رۆکۆیە، لە خێزانەکەوە فێری ڕاوەماسی دەبێت و وەك باوکیشی دەبێتە دز و پیاوکوژ و ڕێگر، ژن دێنێت و دوو کوڕ و کچێکی دەبێت، کچەکە ناوی کارمیلایە وە پاشان دەبێتە نەنە گەورە و نەوەی تر دەخاتەوە. ڕۆکۆ نوێنەری نەوەی دووەمی خێزانەکەیە، کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی باوکی کە بە هەموو نهێنی خێزانەکەیان دەزانێ و ڕووداوەکانی باوك و دایکی و زۆڵیەتی خۆی بۆ ئاشکرا دەبێت. بۆیە لە تۆڵەی ئەوانەدا پەلاماری جوتیار دەدات و دەوڵەمەندەکان تاڵان دەکات و بازرگانەکان دەکوژێت. کە بەو دەسەڵاتەوە لە گوندەکە دەمێنێتەوە ژنێکی لاڵیش بۆ خۆی دەهێنێت کە نە ناوی هەیە و نە جوانی، هەر چەندە نابێت قەشە ئەو ژنەی لێ مارە بکات چونکە بێ ناونیشانە بەڵام ئەو ناچاری دەکات و ژنەکەیش ناو دەنێت لاڵ.

روکۆ لە تۆڵەی خۆیدا کە گوندیەکان ویستوویانە بە منداڵی بیکوژن زوڵم و ستەمی زۆریان بەسەردا دەسەپێنێت و چاکەی قەشەکەیشی لەبیر

ناچێتەوە. لەو ژنە لاڵە دوو کوڕ و کچێکی دەبێت. ئەوەی سەرنج ڕاکێشێت ئەوەیە کە "رافائیل"ی هاوڕێی منداڵیان لە گەورەییدا دەبێتە چوارەم برایان و واز لە ناوی خێزانەکەی خۆی دێنێت و خێزانی سکورتا بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت. ئەم چیرۆکەیش لە بەشە هەرە ناوازەکانی ناو ڕۆمانەکەیە.

ڕوکو کە تەمەنی دەگاتە پەنجا ساڵ و هەستی بە نزیکبوونەوەی مردن دەکات دەیەوێت وەك هەر ئیماندارێك لای قەشە جورجیو دان بە هەڵە و تاوانە زۆرەکانی خۆیدا بنێت، بەڵام قەشە خۆی لەوە بەکەمتر دەزانێت لێخۆشبوونەکەی قبووڵ بکات و راست ڕووبەڕووی خوای دەکاتەوە. کە ڕوکو ئەمە دەبیستێت بڕیار دەدات هەموو ئەو سامانەی بەناڕەوا دەستی خستوە بیدات بە کڵێسە بەو مەرجەی قەشە ئیمزای ئەوەی بۆ بکات کە بنەماڵەی سکورتا هەر کەسێکیان لێ مرد بەڕێوڕەسمی پاشایانە بە خاك بسپێرێن. بەلای ڕوکۆوە گرنگ ئەوەیە تەرمی مرۆڤ وەك خانەدانی بنێژرێت ئیتر گوێی لەوە نەبوو منداڵەکانی هەژار بن. لەسەرەمەرگیشدا داوای لێخۆشبوونی لە خواکرد و بە دەنگێکی پچڕپچڕیش وتی: "خۆشی لە خۆتان. من دەمرم" تەرمەکەیشی وەك خۆی ویستی بە ئاهەنگ و مۆسیقاوە بەڕێکرا. بەڵام منداڵەکانی بە مردنەکەی نیگەران بوون، چونکە بە هەژاری بە جێیهێشتن تا خێزانی سکورتا لەوەودوا بە ئارەقەی ناوچاوانیان ژیان بەڕێ بکەن.

ئەم سێ منداڵە و (رافاییل) کە پەیوەندی پێوەکردن نوێنەری نەوەی سێیەمی بنەماڵەکەن کە بە تەواوی بەرەو ڕووی ناخۆشی و نەفرەت و دڵڕەقی دەبنەوە چ لە نێو گوند و چ لە دەرەوەیدا، قەشە هاوکاریان دەکات بۆ ئەوەی بەڕێگای "ناپولی"دا بچن بۆ ئەمریکا. بەڵام لەوەیشدا بەخت یاریان نابێت و بەهۆی نەخۆشکەوتنی کارمیلای خوشکیانەوە پۆلیس ڕێگایان لێ دەگرێت. بۆیە دەگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان. دایکە لاڵەکەیان مردوەو خۆیشیان ژیانیان لەوپەڕی ناخۆشیدایە.

کە لە گۆڕی دایکیان دەپرسن دەزانن لە بەرهەژاری و بێکەسی لە دەرەوەی گۆڕستانی گوند نێژراوە، ئەمە تووڕەیان دەکات و شێلگیرانە لە گۆڕەکەی دەردێننەوە لە گۆڕستانی گوندا دەینێژنەوە. بەڵام قەشە تازەکە کە لە دوای جورجیو هاتوە و بە فەرمانی ئەو لە دەرەوەی گۆڕستانەکە نێژراوە، خاچەکە لەسەر گۆڕەکە لا دەبات. بەڵام هەر خەڵکی گوندەکە خاچەکە دەگێڕنەوە سەر گۆڕەکە، ئیتر چەندە قەشەکە خاچەکە لادەبات خاچێکی تری لەسەر دادەنرێتەوە. پاشان قەشەکە لەبەرخۆر دەکوژرێت و کەس نازانێت کێ کوشتوویەتی. بێجگە لە کوڕ و کچەکانی ژنەکە کە دەزانن کێ کوشتوویەتی و تەنانەت کەس نەبوە نە نوێژ لەسەر قەشە بکات و نە بینێژێت.

ئەم ڕۆمانە جوانە بە هەمان هەناسەی مەلحەمیەوە، پێ بە پێی هەمان نەوە دەڕوات، شێوازی گێڕانەوەکەی تێکەڵە لە کۆمەڵێك تەکنیکی وەك لەقتەی سینەمایی، هەڵوێستی درامی، وێنەی دیمەنەکان. بێجگە لە ڕەهەندی ناوەوەی کاراکتەرەکان (کە هەندێك جار گەلێك سەیر و نایابن) و ئەو پەیوەندییەی لە نێوان کەسەکاندایە نووسەر سەرکەوتوانە بەرجەستەی بارودۆخی باشووری ئیتالیای کردووە. لوران گودی فەرەنسی وەك نووسەرێکی ئیتالی و گەلێك وردەکار ریتمی گێڕانەوەو توانی تێکەڵکردنی واقیعی نوێ بە

حیكایەتی میللی و قوڵبوونەوە لەشیكردنەوە و فانتازیادا دەست بە كار و داهێنەر بووە. گودی نووسەرێكی فەرەنسییە بە میزاجی ئیتالی.

هەروەك نەوەی سێیەمی بنەماڵەكە لە نەهامەتی و ناخۆشییدا ژیا. نەوەی چوارەمیش كە دوو كوڕی كارمیلایە، ئەوانیش هەر لە ناخۆشی و ئازاردا دەژین. یەكەمیان (دونی تو) لە نێو دەریادا دەمرێت و ئەو تر (ئیلیا) شوێنی جگەرە فرۆشتنەكەی دەسوتێنێت دوای ئەوەی رقی لە ماریا هەڵدەستێت كە لە سەرەتادا نایەوێت شووی پێبكات و پاش ئەوەی ئیلیا تەواو هەژار دەكەوێت ئەوسا شووی پێ دەكات.

لوران گودی لەم رۆمانەدا چیرۆك و حیكایەت و دیمەنی وا دەخاتە ڕوو كە هەرگیز لە بیر ناكرێن، ئەمەیش بە زمانێكی هەرە ناوازە و وەسف و خەیاڵێكی دەگمەن. بۆ نموونە دیمەنی خێزانی سكورتا لە خوانێكی نیو دەریادا. مەرگی كارمیلا لە گۆڕستان، دیمەنی سوتانی جگەرەخانەكە. كاركردن لەسەر پاپۆڕ، دیمەنی كوشتنی لوسیانی باپیر بۆ خێزانەكە. دزیی ناو كڵێسە، دیمەنی زیارەتكردن لە جەژنی ئەلیاسی پێغەمبەردا، ئەم دیمەنانە و هەندێكی تر بە درێژایی دەركەوتنی نەوەكان كە لە 1875 وە دەست پێدەكات تا 1980 بەردەوامە، دوای ئەوەی گوندی مونتیبوشیو گۆڕانێكی زۆری كۆمەڵایەتی و ئاوەدانی تیا دروست دەبێت پێبەپێی نەوەی خێزانەكەو نەوەی قەشە یەك بەدوا یەكەكانی كڵێسەكە. ئەو فەسڵانەیش كە تایبەتن بە كارمیلای پیرێژنەوەو دابەشن بەسەر فەسڵە سەرەكیەكاندا، زیاتر لە مەنەلۆژی درێژ و پچڕ پچڕ دەچن، لەوانەدا كارمیلا پێش ئەوەی بمرێت باسی ژیان و ناخۆشیەكانی خۆی بۆ قەشە دەكات. لە دوا فەسڵیشدا (یان مەنەلۆژی كۆتایی) كارمیلا لە حاڵەتێكی وڕێنە كردندا روو لە ئانای نەوەی دەكات و قسەی بۆ دەكات. لەو رستانەی بۆ قەشەی دەكات و زۆر سەرنج راكێشن: "من بووم بە گورگ" یان "من وشكیی خۆر و ئارەزووی دەریام"

**سەرچاوە**

الحیاة 13/11/2004.

## دیكارت

هاری براكین

**لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا**



دانەری ئەم كتێبە پرۆفیسۆر "هاری براكین"ە كە پسپۆڕە لە مێژووی فەلسەفەی فەرەنسی. لێرەدا بۆ ناساندنی یەكێك لە بەناوبانگترین فەیلەسوفانی جیهان "ڕێنییە دیكارت" كتێبێكی تازە دەخاتە بەردەست خوێنەری ئینگلیزی ئاشكرایە فەلسەفەی دیكارت هەموو سەدەی حەڤدەی بە خۆیەوە سەر قاڵ كردبوو، هەروەها كاریگەریشی لەسەر زۆربەی فەیلەسوفە گەورەكان هەبوو، لە پێش هەموویانەوە مالبرانش، سپینۆزا، لایبنتز.

دانەر لە سەرەتادا كورتەیەكی كەم لە ژیانی ئەم فەیلەسوفە پێشكەش دەكات كە

دنیای پڕکردبوو، خەڵکیشی سەرقاڵ کردبوو. دیکارت ساڵی 1596 لە ناوچەی "براتییەی باکوری فەرەنسا لە باوەشی خێزانێکی خۆشگوزەرانی سەر بە چینی خانەدانە بچوکەکان لە دایك بووە.

ساڵی 1604 دیکارتی منداڵ چووەتە قوتابخانەی یەسوعەکانەوە، ئەو گەرچی سەرسام بووە بە مامۆستاکانی، بەڵام دواتر کاتێ کتێبە بەناوبانگەکەی "وتارێك لە پرۆگرامدا"ی نوسی، ڕەخنەی لە بەرنامەی خوێندنی باو گرت و وتی" خوێندنی فەلسەفە و مەنتیق خوێندنێکی وشك، دووبارە کراو، پڕوپوچ و نەزۆکە.

مەبەستی لەوەش ئەو خوێندنە بووە کە سەدەکانی ناوەڕاستدا بڵاوبووەکە هەندێ ڕەگەزی لە فەلسەفەکەی ئەرستۆتالیسی تێکەڵ بە هەندێ ڕەگەزی لە بیروباوەڕی مەسیحی کردووە، تەنها سەرسام بووە بە ماتماتیك، چونکە خوێندنی ماتماتیك پشتی نەبەستووە بە پێدراوە لاهوتییە مەسیحییەکان.

بەڵام دیکارت فەیلەسوفێك نەبووە لە قوللەی عاجدا دانیشێ و لە جیهان دابڕێ و تاکو لاف و گەزافی فەیلەسوفی لێبدات. بەڵکو ئەو مرۆڤێك بوو خەمی سەردەم و ململانێکانی هەڵگرتبوو چووە ڕیزی یەکێك لە سوپاکان و فێری وشاندنی شمشێر بوو ئیدی تێکەڵ بە گێژاوەکانی ژیان بوو، کاتێ تەمەنی گەشتە 22 ساڵ بووە سوپای شازادە (موریس دوناسو) لە هۆڵەندە و لە ساڵی دواتردا چووە ڕیزی سوپای شازادەی هەرێمی باخیرا لە ئەڵمانیا.

لە هەمان ساڵدا و لە بەرواری 10ی نۆڤەمبەری ساڵی 1619 ئیلهامی بۆ هاتە خوارەوە ئەو دەم تووشی قەیرانێکی دەروونی یاخود سۆفی بەهێز هات کە بە دۆزینەوەی هەقیقەتی جوان کۆتایی هات. هەر ئەو دەم هەستی کرد کە پێویستی بە تەنهایی و دوورە پەرێزییە تاکو ئیشە گەورەکانی دانێ، وەك سکپڕێ کاتێ لە هەناویدا هەست بە ژان دەکات، ئیدی ڕوودەکاتە شوێنێکی هێمن تاکو منداڵەکەی دانێ.

بەری ئەو تێڕامانەشی کتێبە مەزنەکەی بوو، تێیدا پرۆگرامێکی عەقڵانی بەخشییە ڕۆژئاوا، کە بەرەو کەناری ئارام و بردنەوە گەورەکەی بردو پێشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆژیای بە دەست هێنا.

مەبەستمان لەو کتێبە "وتارێ لە پرۆگرامدا"یە. کە بە زمانێکی فەرەنسی پەتی نوسیبووی، واتە زمانێکی سادەی کرچ و کاڵ، لەو زەمانەدا وا باو بووە لە سەرتاپای ئەوروپا و زانکۆکاندا فەیلەسوفەکان کتێبەکانیان بە لاتینی - زمانی زانست و فیکر - بنوسن. بەڵام دیکارت کەسێکی دیموکرات خوازی ڕاستەقینە بوو، حەزی کردووە کتێبەکانی بگاتە دەست هەموو ئەو خەڵکانەی خودا عەقڵی پێداون، لەوانەش ئافرەتان گەر بە لاتینی بینوسیایە، ئەوا گەورە بیرمەند و ڕۆشنبیران نەیاندەخوێندەوە: واتە دەستەبژێرە کەمینەکەی فەرەنسا و ئەوروپا. ساڵی 1641 دیکارت کتێبێکی گرنگی تر دەربکات: تێڕامانە میتافیزیقییەکان. ساڵی 1644 کتێبی سێیەم بە ناونیشانی "پرنسیپەکانی فەلسەفە" بڵاودەکاتەوە کە پێشکەشی شازادەی بوەیهیمیا "ئەلیزابیس"ی دەکات.

دوای ئەوە لەگەڵ (کریستین) شاژنی سوید دەست دەکات بە نامە گۆڕینەوە، شاژن زۆری لێدەکات بۆ ئەوەی سەردانی بکات، ئەویش دواجار ڕازی دەبێت و سەردانی دەکات، بەڵام

دیکارت نازانیّ کە ئەو لەو سەفەرەیدا چیتر ناگەڕێتەوە. لە ڕاستیدا بە هۆی ئەو سەرما و سۆڵە زۆرەی سوید دیکارت نەخۆش دەکەویّ و ساڵی 1650 لە تەمەنی 54 ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات.

دیکارت لە دەستپێکی کتێبەکەی "وتارێك لە پرۆگرامدا" دەڵێ: "ئێمە هەموومان عەقڵمان هەیە، بەڵام بەشێوەیەکی ڕاست و دروست بەکاری ناهێنین" لەبەرئەوەیە دیکارت گەلاّلەی "مەنهەجییەتەکەی" کرد، تاکو خەڵك بخاتە سەر ڕێگایەکی نمونەیی بۆ بەکارهێنانی عەقڵ، و فەلسەفەی دیکارت بەهۆی ئەم مەنهەجییەتەوە شۆڕشێکە، کە لە توند و تۆڵی و ووردبینی زانستی ماتماتیکەوە وەریگرتبوو.

پێش دیکارت بڕوای ئەرستۆ کە تێکەڵ بوو لە فەلسەفەی دووبارە کردنەوە یاخود قوتابخانەی سەدەکانی ناوەڕاست. ئەو دەم کەلەپور و شان و شکۆی باو باپیران (پێشینان) دەستی بەسەر فیکردا گرتبوو، بەڵام دیکارت دەرگای ئازادی و تێگەیشتنی عەقڵانی تاکەکەسی خستە سەر پشت بۆ تێگەیشتن لە دیاردەکان، ئەو لەبەر ئەوەی شەیدای سەلماندنە درەوشاوە و ڕون و ئاشکراکانی ماتماتیك بوو، بۆیە خەونی بەوەوە دەبینی کە مەنهەجێکی گەردون دروستکات کە لەسەر سەلماندنی عەقڵانیەت و مەنتیق ڕاوەستابێت.

دیکارت مەنهەجەکەی لەسەر چوار کۆڵەکە ڕاوەستا بوو: ڕوون و ئاشکرایی، ڕاڤەکردن، پێکهاتە، ئامار، یاخود ژمارە ئەم کۆڵەکانە ئێستا بەلای ئێمە ئاسانە بگرە ساویلکانەیە، بەڵام نابیّ ئەوەمان لە بیر بچیّ لە نێوان ئێمە و ئەو سەردەمەدا نزیکەی چوار سەد ساڵ هەیە و ئەو مەنهەجییەتەی لە سەردەمی دیکارتدا باو بووە مەنهەجییەتێکی کەلەپوری و زۆر تەقلیدی بووە.

هەر لەبەر ئەو هۆیەشە وتمان مەنهەجەکەی دیکارت بۆ ئەو کات شۆڕشگێڕانە بووە. چونکە پشت بە بەهاکەلەپورییە باڵا دەستەکان نابەستیّ کە بە زۆر لە سەرەوە دەسەپێنران. بەڵکو تەنها پشتی بە عەقڵی مرۆڤ و هەستێکی ڕاستگۆیانە دەبەست.

مرۆڤ، هەر مرۆڤیّ بیّ توانای بیرکردنەوە و تێگەیشتنی هەیە، نەك تەنها باو باپیران و کاهین و پاتپان تەنانەت ئەرستۆش.

بەم شێوەیە دیکارت مرۆڤایەتی ئەوروپی لە ئەحکامە پێشینەییەکان و لە مەعریفەیی غەیبانی ڕزگار کرد کە پشتیان بە سەلماندنی مەنتقی نەدەبەست.

**سەرچاوە**

بیان الكتب 2004/5/17.

## کەمێك بەختەوەری

**مودی بیتار**
**لە عەرەبییەوە: سەردەم**

1-بورخیس

تەنیا لە کۆتایی ژیانیدا تامی خۆشەویستی چێشت



لــــە کتــــێبی ژیاننامــــەی بۆرخیسدا کە لە بنکەی فایکینگ چاپکراوە، ئـەدوین ولفینسـون دەڵێــت: دایکــی نەیدەهێشــت بـۆرخیس پەیوەنـدی جەسـتەیی لەگــەڵ ژنانــدا ببەســتێت و بــە تەواوی لێی قەدەغە کردبوو.

خۆرخــە لــویس بــورخیس نووســەرێکی نــاودار بــوو، لــە تەمەنی پەنجا ساڵیدا کە لەگەڵ رەخنەگرێکی ئەدەبی و دایکیدا "ئیل نینوتومافینو" نیوەرۆژەیان دەکـرد دایکـی وتـی: بـورخیس بـادەی نـەخواردەوە، بـەڵام ئـەو منداڵــە نــەبوو کــە لەبەرچــاوی منـدا گـەورە نـەبووبێت. دایکێـك تــا تەمــەنی نــەوەد و نــۆ ساڵی خۆی بە دەست مەرگەوە نەدا.

بــۆرخیس لــە کۆتــای بیستەکانی تەمەنیدا وەك شاعیر و رابــەری لاوانــی ئەرجــەنتینی درەوشـایەوە. بـەڵام ئـەوەی لێـی چـاوەڕێ دەکـرا زوو کوژایــەوە، خێزانــە خانەدانــە بەرەســەن ئیسـپانیەکەی تێـك شـکا، بۆیـە دەبــوو لــە دەرەوەی پایتــەخت ببێتــە کارمەنــدێکی ئاســایی کتێبخانـە. دەسـتی کـردە کورتـە چیرۆکنووسـین کـە پاشـان هـەر کورتــە چــیرۆك کــردی بــە نووسـەرێکی گـەورە، لـە کاتێکدا کە ئەو نا ئومێدانە وای هەست دەکـرد لــە هــەموو بوارەکــانی ژیانیدا شکستی هێناوە. چاوی تــا دەهــات بــەرەو کوژانــەوە دەچـوو، ئـەو تاقـە ژنـەیش کـە خۆشیویست بۆ پیاوێکی پیاوانە تر وازی لەم هێنا.

لــە تەمــەنی شەســت و دوو ساڵیدا کە هەموو دنیا ناسی ئەو کـوێر ببـوو، لەگـەڵ سـەموییل بیکیتــا "خــەڵاتی بنکــەی بڵاوکردنـەوەی دەوڵـەتی"یان بـە هاوبـەش وەرگـرت، ئـەوروپا و ئــەمریکای بــاکوور گــەرا. رۆماننووسە تازەکانی فەرەنسا و هاوپەیڤینــە ئینگلیزەکانیــان سەرسـام بـوون بـە نووسـینە ئەزموونیـەکانی کـە لـە نـاو لاوە رووناکبیرە ئەنتیەکانیشدا برەوی هـەبوو. ئـەو لایەنگریـەی لـەناو گەنجە یاخیەکاندا هـەیبوو دنەی ژنــە سەرنووســەری گۆڤــاری "سور" ڤیگتوریا ئوکامبوی دا کە بـورخیس تیایـدا دەینووسـی. داوای لــە بــورخیس کــرد وێنەیــەکی بــە بارۆکــەی "بیتلز"ەوە بگرێت و ئەویش کە ئەوســا تەمــەنی لــە حــەفتا ســاڵیدا بــوو بــێ ســێ و دوو قبووڵی کرد.

هەر چەندە خەڵاتی نۆبڵ زۆر لـە بـورخیس نزیـك بـوو، بـەڵام کـورت هێنـانی دیـدی سیاسـی دووری خســتەوە. هێنــد دیکتاتۆریەتی خوان بایرۆنی ڕق لێبوو کە کەوتە تای ئەو ڕژێمە ســەربازیەی شۆڕشــی بەســەرخواندا کــرد. سەرســامیەکەی بەســەربازیی وایلێکرد خەڵاتی جەنراڵ بینوشە قبووڵ بکات و دیموکراتیەت رەت بکاتــەوە، چــونکە ئــەو دیموکراتیەتـە بـەوە دادەنـێ کـە "بڕوابوونـە بـە غـەیب" هـەروەها سەرسـامیش بـوو بـە جـەنڕاڵ فرانکۆ وە ئەو کاتە ڕای بەرانبەر ڕژێمـی سـەربازی گـۆڕا کـە لـە وڵاتەکەیـدا تـا دەهـات ژمـارەی ئۆپۆزسیۆن لەناو دەچوون، بەڵام لیژنەی ئەدەبیی نۆبڵ رای خۆی بەرانبەری نەگۆڕی.

بۆرخیس لە تەمەنی هەشتاو حـەوت سـاڵیدا مـرد، بێجگـە لـە نۆبڵ گـەلێك خـەڵاتی تـری پێبڕا. نووسەری ئەمریکی جون ئیبدایك دەڵێـت بـورخیس چـیرۆکی لـە رووکـارە زەمینەیـە دەرکـرد کـە زوربەی رۆمان و چیرۆکی ئێمەی لــە خۆگرتبــوو، ئــەو ریــالیزمی جــادویی ئــەمریکای لاتــینی داهێناو لەگەڵ شێوازەکانی تر و یاریــە فیکــری و رامانــە میتافیزیکیەکانــدا لێکــی دان، رامانـە فیکرییـەکانی لـە شـێوەی

خورافات و فێڵی شۆخانە و فانتازیادا خستە ڕوو کە تای بەسەر واقیعە تارو ناخۆشەکەدا قورستر بوو. وێنای دنیای بە کتێبخانەیەك کردبوو، دەوڵەتیش شانس حوکمی دەکات. هەموو دنیای لە چینێکی خوارەوەی ساختمانێکی بوینس ئایرسدا کۆکردەوە. لە چیرۆکێکی بەناوبانگیدا کۆمەڵەیەکی نهێنی دروست دەکات، دنیایەکی فانتازی کە زۆر نابات دنیا راستەقینەکە دەگۆڕێت. لە ئەدەبی بورخیسدا توناو توون و ئاوێنە و ئەلتەرناتیڤە مرۆییەکان و پڵنگەکان دووبارە دەبنەوە.

لە کاتێکدا کە نووسەری ژیان نامەکەی هەموو ئەوشتانە بۆ زەوقی ئەدەبی و فەلسەفی بورخیس دەگێڕێتەوە، هەروەهایش بۆ ئەو پەرۆشیە سەلەفی و کابووسە بەردەوامانەیش کە نووسەر بۆ ئەو جۆرە ژیانەی هەبووە.

بورخیس تاڕادەیەك لە قوتابخانە و خۆشەویستیدا داماوو دواکەوتوو بوو، بۆ خوێندن لەگەڵ خێزانەکەیدا هەندێك لە وڵاتانی ئەوروپا گەڕا، کتێبخانەی باوکە سەربەگۆبەنەکەی سەرەتایەك بوو بۆ خوێندنەوەیەکی زۆر و بە تاسەی بورخیس. لە سویسرا دیدەنی سۆزانیەکی کرد کە لە باتی راهاتن و رزگار بوون تووشی شەرمنیەکی سێکسی وایکرد کە بە درێژایی ژیانی لێی نەبووەوە. خۆشویستن و خۆشویستن و خۆشویستن هەر دادی نەدا.

دایکی، کە شانازیی بە شکۆمەندی خێزانەکەیان و رابووردویی سەربازیانەوە دەکرد، هۆیەك بوو بۆ دوورکەوتنەوەی زۆربەی کچە هاوڕێکانی. ئەگەر چی دوای هێنان و بردنێکی زۆر کچێکی بۆ خواست بەلام ژن هێنانەکەی سەرنەکەوت و لە قورتوبەوە تەلاقنامەکەی ئەلیسائیستیتی بە پارێزەرێکدا بۆ نارد.

تا دایکی مرد لەگەڵیا ژیا. لە دوا دوای ژیانیدا کچە قوتابیەکی خواست کە چەند دە ساڵێك لە خۆی بچووکتر بوو، هەر لەو دواییەدا کەمە خۆشبەختیەکی پێبڕا.

### 2-کارلوس فوینتس
### منداڵەکانتان هی ئێوە نین



ڕەنگە ئەو بەشەی کتێبی کارلوس فوینتس "من ئەمە باوەڕمە: لە ئەلفەوە تا یای ژیانی نووسەرێك" کە باس لە منداڵان دەکات جوانترین بەشی کتێبەکە بێت. کتێبەکە بە وەرگێڕانی ئینگلیزی بلومربری چاپ بووە.

کارلوسی مەکسیکی باسی لە ئەزموونی تەمەنی خۆی لە بواری کلتور و فەلسەفە و سیاسەت و ئابووری و پەروەردە دەکات کە خاڵی نییە لە تەڵەی داڕشتن و گوتار بێژیی. لای نووسەری تەمەن حەفتا و هەشت ساڵە زۆر جار دیمەنی مەرگ و سێکس دووبارە دەبنەوە. فوینتس خۆی دیبلوماسی و کوڕی دیبلوماسی بووە "قەرەجێك لە توکسیدو" لە بارەی منداڵی خۆی و گەڕانی بە جیهاندا دەڵێت: بێدەنگی لە هاوڕێیەتیدا لە فیلمساز بونیلەوە فێر بووە. ژنی دوەمیشی سیلفیا

زیاتر وای لێکرد کە لە ژیاندا بایەخ بە دەوروبەری لە بارەی سێکس و سیاسەت و ئەدەب بدات. کە باوکی لە واشنتۆن کاری دەکرد لە یەکێك لە دەفتەرەکانی قوتابخانەیدا ئەمە نووسراوە: "دواکەوتوویی مەکسیکۆ دەگەڕێتەوە بۆ تەمەڵیەك کە گەلێکی دواکەوتوو ناتوانێت بیبەزێنێت"

فوینتس لە لێکدانەوەیەکی سیاسیدا ئەمە دەڵێت کە بێجگە لە خورخە لویس بورخیس نووسەرەکانی ئەمریکای لاتین زۆریان لا خۆشە. کتێبەکە پێشکەش دەکات بە کوڕەکەی کە ئەویش هەر ناوی کارلوسە، لە پاریس لە دایك بووە کاتێك کە نووسەر لەوێ سەفیر بووە. خێزانەکەیان لە کێڵگەی ڤرجینیا بووە لە ئەمریکا کاتێك کە خەم و ناخۆشی رووی تێکردووە. منداڵەکە هەر لەوێ پێی گرت و لە پرێکدا دەرد و نەخۆشی سەریان تێکرد. بە تایبەتی نەخۆشی خوێن نەگیرسانەوە (هیموفیلیا) کە هەڕەشەی تەمەن کورتی لێدەکرد. کارلۆس وێنەی کێشا و شیعری نووسی و چەند خەڵاتێکی وەرگرت، کە تووشی نەخۆشی پەردەسۆی مێشك (ذات السحایا) هات بیستن و بینینی لە دەستدا و پاشان چاك بووەوە. بەڵام بەهۆی هەڵەی نەشتەرگەریەکەوە هەندێك لە کارەکانی تری لەشی لەکیسدا. لە شیعرێکیدا دەپرسێت: "ئایا تا بەیانی دەژیم؟ نازانم، بەڵام دەبێت شەڕ بکەم (...) چاوم دەنووقێنم گوێ لە ترسە شاراوەکەی ناو بێدەنگیەکەم دەگرم، ئەو ترسەی کە دەشکێت دەبێتە شەڕێکی نادیار"

شەوێك پێش مردنی، کارلۆس پەیوەندی بە هاوڕێکانیەوە لە زۆر وڵاتی جیاوازەوە کرد، تا پرۆژەکانی خۆیان پێ بڵێت. ئەو فیلمەی لە تەواوبووندا بوو، دیوانێك شیعری ئامادە بۆ چاپ و تابلۆ ئامادەکانی بۆ پێشانگا بەڵام بۆ بەیانی لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

کارلۆسی باوك خۆی لەو دارەتەنەدا کە نووسینێکی زۆری سۆزدارانە بۆ کوڕەکەی بنووسێت. بەڵکو لەگەڵ دڵشکاویەکەیشیدا بە ئاوەزێکی بێگەردەوە نووسی. دەڵێت: سەردەمێك دێتە پێشێ مرۆڤ هەست بەوە دەکات کە منداڵەکانی، لە ژیاندا بن یان مردبن، بەختەوەربن یان داماو و چاوڕەش، کاریگەربن یان نا، ئەو شتەیان تیایە کە ئەم تیایدا نیە. ئەوان لە کەس و کار و خۆیان "زیاترن".

دوای مەرگی کارلۆس، سیسیلیای کچی نووسەر لە ژنی یەکەمی ئەو وێنە تۆمارکراوانەی کە کارلۆسیان تیا دەرکەوتبوو لە فیلمێکدا کۆکردەوە کە فوینتس فیلمەکەی بینی هەستی کرد کوڕەکەی ئەگەر چی تەنیا ڕۆژێك لەسەر زەوی ژیا بەڵام جێی شانازی باوکیەتی.

### 3-خوسیه ساراماگۆ شناسێك، دووشناس...



خوسیە ساراماگۆ لە دوا ڕۆمانیدا کە بەزمانی ئینگلیزی لە بنکەی بڵاوکردنەوەی هارفیل دەرچووە ترسی دوناو دوون (تناسخ) و لە دەستدانی شوناسمان دەخاتەبەر، ڕۆمانەکە کە ناوی "بەدیل"ە بە مامۆستایەکی کەمێك خەمۆك

دەست پێدەکات، مامۆستا تەماشای فیلمێك دەکات کە پاڵەوانەکەی بێجگە لە سمێڵی تەواو لەم دەچێت. فیلمەکەیش پێنج ساڵ لەوەوبەر بەرهەم هاتووە کە مامۆستاکەیش دوو سمێڵی لەو جۆرەی هەبووە. زۆر نابات کە پاڵەوانەکە دەبێتە چاولێکەری مامۆستا، واتا کۆپییەکی ئەو، پاشان هەردووکیان توانای ئەوەیان نابێت خۆ لەیەکدی جیا بکەنەوە و ژیانیان سەربەخۆبێت. هەردووکیان لە نێو خرۆشاندنی پەیوەندی ئەکتەرەکە بە ژنەکەیەوە و سەرکۆنەی مامۆستا و شاردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ کچە هاوڕێکەیدا کە زۆر لەسەر ئەم دەکەوێت.

ساراماگۆ لەو ڕۆمانەدا فەلسەفە و وروژاندن تێکەڵ بەیەکتر دەکات و چیرۆکێکی دیستۆفیسکیمان بە هەمان ناونیشان وە بیر دێنێتەوە، هەرچەندە نووسەری پورتوگالی کە خەڵاتی نۆبڵی پێ بەخشراوە لە دیستۆفسکی کەمتر ڕەش بینە و سۆزی زۆرتری تیایە. دەشێت زانست کۆپیەك یان زیاتر لە هەر یەکێك لە ئێمە دروست بکات و تایبەتمەندی و شوناسمان نەهێڵێت. وەلێ پووکانەوەی مرۆڤ و ناسینی لە کۆتایی تونێلەکەدا ڕووناکیان دەکەوێتە سەر. خۆشەویستی نەك تەنیا بەرگەی ژیانمان پێدەگرێت، بەڵکو شوناسمان دەپارێزێت و دروستی دەکات. بۆیە کە خۆشەویستی نەما هەست بە بێهوودەیی دەکەین و خۆمان ناناسین.

ئەدەبی ساراماگۆ پڕە لە کەسایەتی و ڕووداوی تەماوی، ئەمە لە سەرەتای ساڵی هەشتاکانەوە کە "بالتسار و بلیموندا"ی بلاوکردەوە و، توانایەکی وای دایە ژنە پاڵەوانەکە کە تەنیا بەڕوانین ڕۆ بچێتە ناو پێستی مرۆڤەوە. لە کارە هەرە جوانەکەیدا "ساڵی مەرگی ڕێگار دوریس" ژیاننامەی کەسێك دەگێڕێتەوە کە لە بووندا نییە، چونکە پاڵەوانێکە شاعیری پورتوگالی " فرناندو بسوا" دروستی کردووە. لە "خشتی بەردیندا" نیو دوورگەیەك ئاو لای دەدات و لە ئەوروپا جیا دەبێتەوە. لە "ئەشکەوت"دا ئەشکەوتی ئەفلاتون دەکەوێتە بن مەڵبەندێکی بازرگانی هاوچەرخەوە. سوریالیەتێکی تاریك تێکەڵ بە پرسیارەکانی بوون و گەڕان بە دوای مانادا لە ژیانی هەموو ڕۆژێکی ساراماگۆدا دەردەکەوێت.

ئەو بابەتانەی ساراماگۆ هەڵیان دەبژێرێت کافکا و گۆگۆل و فرناندو بسوای هاووڵاتی خۆیمان دێنێتەوە بیر کە زۆرناوی بۆ خۆی هەڵبژاردوە و ئەم ناوەیان یەکێکە لەوانە.

### سەرچاوە

الحیاة، لمحات ثقافیة

2004/10/15

## شارستانیەت و دوژمنانی

**لە عەرەبییەوە: سەردەم**



CIVILIZATION AND ITS ENEMIES
THE NEXT STAGE OF HISTORY
LEE HARRIS

*Civilization and its enemies*

*the next stage of history*

*lee harris*

*Free press –new york, 2004*

*P. 232*

نوسەری ئەم کتێبە بیریاری ئەمریکی "لی هاریس"ە، کە خاوەنی وتارە فەلسەفییە بەناوبانگەکانە. لەم کتێبەدا باس لە شارستانیەتی هاوچەرخ و دوژمنانی ئەو شارستانیەتە دەکات کە دەیانەوێت وێرانی بکەن.. "هاریس" بەگرنگترین بیریاری ئەمریکی لەقەڵەم دەدرێت کە توانیویەتی پەندو ئاکام لە پەلامارەکانی یانزەی سێپتەمبەر بەدەست بێنێت.

وەک چۆن "فرانسیس فۆکۆ یاما" بەهێزترین تیۆریای دەربارەی کۆتایی جەنگی سارد گەڵاڵە کرد، ئاوەهاش "لی هاریس" باشترین تیۆریای خۆی سەبارەت بەجەنگی داهاتووی نێوان شارستانیەت و بەربەریەت خستەڕوو. مەبەستی ئەو لەبەربەریەت، ئەو بزاوتە توندڕەوو تیرۆرستانەیە کە لە بەهای مۆدێرنەو ئازادیەکانی داخ لە دڵن.

"هاریس" پێی وایە ئێمە لەبەردەم قۆناغێکی مێژوویی تازەداین، قۆناغێک کە بەشێکی زۆری سەدەی بیست و یەک بۆ خۆی دەبات. ئەو جەنگە بێوادەیەی هەنوکە لە نێوان خۆرئاواو بزوتنەوە پەڕگیرەکاندا هەیە وا بەزوویی کۆتایی نایەت، بەڵام زۆربەی زۆری هاوڵاتیانی خۆرئاوا تا ئێستاش لە هەڕەشەو مەترسییەکانی ئەم شەڕە بێئاگان، لەبەرئەوەی خۆرئاواییەکان دووچاری پەتای غەفڵەت و لەبیرچونەوە هاتون، تا پەلامارەکانی یانزەی سێپتەمبەر رویانداو لەحەقیقەتی ئەوەی لەچواردەوریان روودەدات بەئاگای هێنانەوە.

نوسەر لەبەشێکی ئەم کتێبەیدا دەڵێت: (خەڵک لە ئەمریکاو خۆرئاوا بەگشتی، لەجۆرە دڵنیایەکدا دەژیان و بێخەبەربوون لەوەی چی لەدەوروبەریاندا رووەدات. نەیاندەزانی دوژمنانیان چ پلانێکیان بۆ دەچنن و لە چ بۆسەیەکدان بۆیان، تا پەلامارەکانی یانزەی سێپتەمبەر روویداو لەخەونی غەفڵەت زەدەیی راپەرین. ئەو کات حاڵیبوون لەوەی دوژمنێکیان هەیەو ئەو دوژمنەش دەیەوێت بیانکوژێت و شارستانیەتەکەیان وێران بکات).

لەڕاستیدا ئەو نەوەیەی ئەمڕۆ لەخۆرئاوادا دەژی، نەوەیەکە خۆشگوزەرانەو زەحمەت ناکێشێ و لەنیعمەتدا دەژی و بێئاگایە لەمانای ئازار چەشتن و تراژیدیاو دوژمنایەتی، لەبەرئەوەی نەوەکانی پێشوتر نەک ئەم نەوەیە، ئەو شارستانیەتەیان دروستکردووە کە ئەوان ئێستا بەهرەمەندن لێی و لەبەری دەخۆن.

نەوەکانی پێشوو ماندوو بوون و قوربانیاندا، بۆ ئەوەی هەمووشتێک لەسەرەتاوە بونیادبنێن و لەسەر ئەم بنەمایەش کۆشکێکی بەرزو شارستانی دروست بکەن، هەر ئەو نەوەیەش بوو بەرەنگاری دوژمنان بووەوەو شەڕەکانی کردو لەو پێناوەشدا رەنجی زۆری داو ماندو بوو، لەبەرئەوە نەوەیەکی وا لەمانای رووبەڕووبونەوەو دوژمنایەتی و بەدگومانی نەیاران تێدەگات.. دوژمنیش ئەو کەسەیە کەئامادەیە بمرێت لەپێناو ئەوەی بتکوژێت، ئەوە ئەو شتەبوو کە ئەزمونی یانزەی سێپتەمبەر فێری کردین. لێرەوە ئەوپەڕی کاڵفامیە پرسیاری ئەوە بکەین: بۆچی ڕقیان لێمانە؟ ئەوان بۆیە ڕقیان لێمانە، لەبەرئەوەی ئێمە دوژمنیانین یان ئەوان ئێمە بەدوژمنی خۆیان دەزانن. بزاوتە رادیکالیە توندڕەوەکان هاوڵاتیانی ئەمریکاو خۆرئاوا بەگشتی بەکافر دەزانن، لەبەرئەوە خوێن ڕشتنی حەڵاڵ دەکەن. ئێمە زۆر

دەمێکە ئەم ڕاستیەمان بیرچۆتەوە, لەو کاتەوەی لە تاریکستانی سەدەکانی ناوەڕاست هاتوینەتە دەرێو پێمان ناوەتەوە قۆناغی مۆدێرنەوە, ئەو حەقیقەتەمان لەیادکردووە.

لەجێگایەکی تری ئەم کتێبەدا (شارستانیەتو دوژمنانی), "لی هاریس" دەنوسێت: (ئێمە بەوپێیە سەرکۆنەی کەسانی دی ناکەین, لەبەرئەوەی لەڕووی ئایینو مەزهەبەوە جیاوازن لە ئێمە, چونکە ئێمە پێمان وایە ئایین شتێکی تایبەتیەو پەیوەندی بەمرۆڤو خوای خۆیەوە هەیەو بۆ کەس نییە خۆی لەو مەسەلەیە هەڵقورتێنێ, بۆیە ئێمە لەسەر بنەمای ئاینی دژایەتی کەسانیتر ناکەین.. لەسەدەکانی ناوەراستدا ئێمە لەسەر ئەو بنەمایە دژایەتی ئەوانی دیکەمان دەکردو جەنگی خاچ پەرستیمان ئەنجام دەدا, بەڵام پاش ئەوەی لای ئێمە مۆدێرنەو ئەقڵانیەت سەرکەوتنو رۆشنگەری فیکری خوێندنگەو زانکۆکانی گرتینەوە, ئیتر ئێمە لەسەر بنەمای ئاینی دژایەتی ئەوانی دیکەمان نەدەکرد, بەڵام ئەمە بۆ خۆی هەڵە گەورەکەی ئێمە بوو کە کردمان, لەبەرئەوەی پێمان وابوو ئەوانی دیش وەك ئێمەیان لێهاتووەو لەو حەقیقەتە بێئاگابوین کە: ڕێبەرانی بزاوتە توندڕەوەکان بەر لە هەرشتێك, لەسەر ئایینو بیروباوەڕ لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکەن. ئەوانە لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکەن, تەنانەت ئەگەر ئیماندار نەبیتو هەرگیز ئامشۆی کڵێساش نەکەیت! ئەم دەمارگیریە کوێرو نابینایەشە بۆتەمایەی ئەوەی ڕقیان لە ئێمەی خۆرئاوایی بێت, ئیتر ئەمریکی بین یان ئەوروپی).

کەواتە پێویستە خەسڵەتی دەمارگیری ئاینی تاوتوێ بکەین, تا تێبگەین چی لە چواردەورماندا روودەداتو بزانین بۆچی پەلامارەکانی یانزەی سێپتەمبەر رویانداو لەماوەی دە خولەکدا, گیانی زیاتر لە سێ هەزار کەسی دروێنەکرد.

هاوکات نوسەر ئایدیۆلۆژیای توندڕەوەکان بە ئایدۆلۆژیایەکی فۆبیا ئامێز یاخود یۆتۆپی وەسف دەکات. ئەو پێیوانییە هۆکارەکانی تیرۆر لەهەژاریو نەبونی رۆشنبیری یان نەبونی دیموکراسیدا بێت, چونکە ئەم شتە زۆر نێگەتیڤانە تەنها بۆ خۆیان هیچ رۆڵێکیان لەدروستکردنی ئەو ئایدۆلۆژیا توندڕەوەدا نییە. ئەم ئایدۆلۆژیایە بەرهەمی توێژی ئەنتلجنسیا یاخود چینی ناوەڕاستە. پاشان نوسەر بەراوردێك دەکات لەنێوان ئەو ئایدۆلۆژیا پەڕگیرەی هەنوکە لە ئارەدایەو لەگەڵ فاشیزمو نازیزم لە ئەوروپا, چونکە ئەم دوو ئایدۆلۆژیایەش سەرەتا لەناو ڕۆشنبیرانو خوێنەوارانی چینی ناوەندا سەریهەڵداو دواتر بەتەواوی میللەت گەیشت. "لی هاریس" لەم کتێبەیدا سەرنجمان بۆ ئەوەش ڕادەکێشێت کە: (توێژی ڕۆشنبیران لەجیهانی ئیسلامیدا, دەستێکی باڵایان لە ناشرینکردنو چاندنی ڕق لە دژی خۆرئاوا هەیە, هەرلە پرۆگرامەکانی خوێندنو دەزگاکانی راگەیاندن تاکەناڵە ئاسمانیەکان, مزگەوتەکانو شەقامی عەرەبیش دوو جێگەن لێوان لێون لە دیماگۆگیەت).

سەبارەت بەهۆکارە ناوخۆییەکانو کاریگەریان لەسەر تەشەنەسەندنی توندڕەوی, "هاریس" دەڵێت: (بێگومان هۆکار گەلێکی ناوخۆیی دەستیان لە برەوسەندنی توندڕەویدا هەیە,

وەك: چەق بەستنی فیکریو داخستنی دەرگای ئیجتهادکردنو ستەمکاری سیاسیو گەندەڵی ئابوریو ئیداریو.. هتد, بەڵام پێویستە هۆکارە دەرەکیەکانیشی سەربار بخەین کە بارودۆخی وڵاتانی ئیسلامیان ناهەموارتر کردووە.

بۆ نمونە, گەشەی ئابوری شکستی هێناو هەموو دەرگاکانیش لەبەردەم ئەو لەشکرە گەنجەدا داخراوە, کە هەموو ساڵێك دەڕژێنە بازاڕەکانی کارەوەو هیچ کارو پۆستێکی وەزیفیان دەسگیر نابێت. دواجار هەموو ئەمانە هانی تەشەنەسەندنی توندڕەوی دەدەن, لەناو گەنجانی وڵاتانی ئیسلامیدا).

## سەرچاوە

بیان الکتب, بەرواری 2004/8/2.

36/ Dec. 20044 VOL.6

# Sardam/

Foreign Culture Magazine/

Concessionaire
**SHERKO BEKAS**

Editor- In- Chief
**RAOOF BEGARD**

Editing Director
**Halkaut Abdullah**

Editorial Staff
**REBEEN HARDI**
**SHWAN AHMED**
**SHAHO SA'EED**

Art Production Work
**KADIR MEERKHAN**

Computer Lay out
**TAVGA FAEQ**



Sardam Printing & Publishing House/